# کوردستان

## لەنێوان [illegible]لانێی نێو دەوڵەتیی وناوچەییدا

## 1932-1890

کامەران ئەحمەد محەمەد ئەمین

(کامەران مەنتک)

\ ١٥٠٠

# كوردستان

## لەنێوان ململانێی نێو دەوڵەتیی و ناوچەییدا 1932-1890

## توێژینەوەیەك لە مێژووی سیاسی و ئابووری

کامەران ئەحمەد محەمەد ئەمین

------------------ سلێمانی 2000 ------------------

❖ ناوی کتێب: کوردستان لەنێوان ململانێی نێو دەوڵەتیی وناوچەییدا
1932-1890

❖ بابەت: توێژینەوە

❖ نووسینی: کامەران ئەحمەد محەمەد ئەمین

❖ مۆنتاژی کۆمپیوتەر: ئاسۆ سەعید

❖ چاپی یەکەم: 2000

❖ تیراژ: 1100 دانە

❖ ژمارەی سپاردن : ( 236 )ی 2000

❖ چاپ و ئۆفسێتی دەزگای سەردەم

زنجیرە کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ( 75 )

# ناواخن

# پێشەکی

توێژینەوە لە بابەتی ململانێی نێو دەوڵەتی ناوچەیی لەسەر کوردستان، ئەگەر خۆی لەخۆیدا کارێکی گرنگ و پێویست بێت، ئەوا ئەرکێکی ئێجگار سەخت و دژواریشە. بەتایبەتی لە ماوەیەکی مێژوویی تژی ئەژواری و گۆڕانکاریدا ١٨٩٠-١٩٣٢. کە زۆر گۆڕانی گەورەی ئابووری وسیاسی لەسەر ئاستی جیهانی و ناوچەیی روویاندا، بووە هۆی ئەوەی سیاسەتی زلهێزەکان بەردەوام لە گۆڕانێکی بەلەز دابێت، ئەمە وایکرد ململانێیەکە بەشێوەیەکی گشتی لە رۆژهەلاتی ناڤین و بەتایبەتی لەسەر کوردستان چڕتربێتەوە. بۆیە توێژەر ئەگەر بەووردی و ئاگاداریەوە مامەڵەیان لەگەڵ نەکات، رەنگە دوچاری زۆر هەڵە بێت.

دەشێ لەیەکەم چاوپیاخشاندا پرسیارێك لای خوێنەر سەرهەڵبدا. کە بۆچی ساڵی ١٨٩٠ کراوە بەسەرەتایەك بۆ توێژینەوە؟ لەراستیدا ئێمە خۆشمان لەو بڕوایە داین دیاریکردنی ساڵێك بەووردی بۆ رووداوی مێژوویی شتێکی لەبار نیە! وەلێ ئەم ساڵە تایبەتمەندیەکی تارادەیەك تایبەتی هەیە. تەنانەت هەندێك بەسەرەتای سەدەی بیستەمی دەژمێرن [١٨٢]. وەك لەدوو توێی ئەم توێژینەوەیەش دەردەکەوێ، ئەو گۆڕانە ئابووری سیاسیانەی لەم پێواژۆکەدا روویاندا، کاریگەریەکی گەورەیان لەسەر چارەنووسی کوردستان هەبوو. بابەتەکەش زێتر تایبەتە بە ململانێی نێو دەوڵەتی و ناوچەیی لەسەر کوردستان، نەك مێژووی کورد، لە مێژووی پەرەسەندنی ئابووری و سیاسی نێو دەوڵەتیش ئەم ساڵەیان بە دەستپێکی پێواژۆکی ئیمپریالیزم داناوە، کە هاوکات بە پێواژۆکێکی نوێش دەژمێردرێ لە ململانێی نێو دەوڵەتی لەسەر کوردستان. بۆیە بە پێداویستیەکمان زانی ئەم ساڵە بکەین بەسەرەتایەك بۆ

دەستپێکی توێژینەوەکە. هەرچی دەربارەی ساڵی دیماهی توێژینەوەکەیە، هەر لەو ساڵەدا دوا ڕاپەڕینەکانی کورد لەو ماوەیەدا بەهاریکاری نێو دەوڵەتیی و ناوچەیی لەهەموو پارچەکانی کوردستان سەرکوتکرا. هاوکات هەندێك لەو دەوڵەتانەی کوردستانیان بەسەر پارڤەکرا، بە شێوەیەکی یاسایی دانیان پیانراو وەکو ئەندامێك لە کۆمەڵەی گەلان وەرگیران. بەمەش پێواژۆکێك لە مێژووی کورد دیماهی هات و پێواژۆکێکی تر دەستی پێکرد.

ماوەیەك بوو گەرەکم بوو لەسەر بابەتێکی ئیوها بنووسم، بۆ وەرام دانەوەی چەندین پرسیار، کە ڕەنگە مەژی زۆر لە ڕۆڵەکانی کوردی خەریك کردبێ، ئایا کورد بۆ دەوڵەتی نیەە؟ بۆچی پارڤەکراوە؟ بۆچی بەم چەشنە ڕەفتار لەگەڵ کورد دەکرێت؟ ئایا کەم وکوڕی لە خودی کەسایەتی مرۆڤی کورد دایە، وەك لەلایەن دوژمنانی کوردەوە بەگەرمی پڕوپاگەندەی بۆ دەکرێت، یاخود لەبەر دەوڵەمەندی و گرنگی و بایەخی شوێنی کوردستانە؟! دەستپێکی توێژینەوەکە خوێندنەوەی ئەو کتێبانە بوو لەسەر مێژووی کورد نووسراوە، پاشان مێژووی ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان بەسەر پارڤەکراوە. بۆئەوەی بە چاوێکی نوێ سەیری مێژووی کورد بکەین، بەبێ ترس و دوور لەکاریگەری ئەو مێژووەی کە بەشێواوی لەلایەن دوژمنانی کورد نووسراوەتەوە. هاوکات بەتەنیا ڕووداوەکان ڕیز نەکەین، بەڵکو هۆکارەکانی ڕوودانیان و پەیوەندیان بەیەکتر ڕوون بکەینەوە. ئەنجامی شەونخونی و هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر، ئەم توێژینەوەیە هاتە بەرهەم، کە لەدەروازەیەك و پێنج بەش پێکهاتووە. لە کۆتایشدا ئەو ئەنجامانە خراوەتە ڕوو کە توێژەر پێی گەیشتووە.

**دەروازە:** هەوڵدراوە ئەو زەمینەیە بگورێنرێ کە توێژینەوەکەی لەسەر بیناکراوە. باس لەسەرهەڵدانی هێزی نوێ و چڕبوونەوەی ململانێیەکە دەکا لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم، بەشێوەیەکی ووردتریش لەسیەکانی سەدەی نۆزدەهەم تاکۆتایی هەمان سەدە. کاریگەری ململانێیەکە لەسەر بزاڤی کورد و ڕووخانی میرنشینە کوردیەکان ڕوونکراوەتەوە، لەگەڵ کاریگەری ئەو ململانێیە نێو دەوڵەتیە لەسەر کپ کردنەوەی ڕاپەڕینەکانی کورد لەنیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەمدا.

**بەشی یەکەم:** بۆ ماوەی ۱۸۹۰ تاجەنگی جیهانی یەکەم تەرخان کراوە، لە سێ باس پێکهاتووە.

**باسی یەکەم:** باسی ئەو گۆڕانە ئابووری و سیاسیانە دەکا کە لەو ماوەیەدا روویانداوە کاریگەریان لەسەر کوردستان و دۆزی کورد هەبوو، هاوکات ئاماژە بۆ هاتنە ناوەوەی زلهێزی تر بۆسەر گۆڕەپانی ململانێیەکە دەکات، بە پلەی یەکەمیش ئەڵەمانەکان.

**باسی دووەم:** باسی کوردستان دەکا لەنێو بازنەی ئەو ململانێیە دیپلۆماتیکیەی لەسەر پرۆژەی هێڵی ئاسنی (شەمەندەفەر) بەرلین – بەغدا هاتە ئارا، کە زۆربەی ئەو هێڵانە بەسەر خاکی کوردستان دا تێدەپەڕی. واتە کوردستان بووە ئەو چەقەی لە ڕێگای ئەوەوە تۆڕی هێڵە ئاسنەکە، زۆربەی رۆژهەڵاتی بە ئەوروپا دەبەستەوە.

**باسی سێیەم:** تایبەتە بە کورد و شوێنی کوردستان لە ڕێکەوتننامەو هاوپەیمانیەتیە نێو دەوڵەتیی و ناوچەییەکاندا، هەروەها لە هەوڵی ئینگلیزەکان دەدوێ بۆ ئابلووقەدانی چالاکی ئەڵەمانەکان لە رۆژهەڵاتی ناڤین و کوردستان لەم ڕێگایەوە. لەگەڵ هەوڵی ئەڵەمانەکان بۆ شکاندنی ئەو ئابلووقەیە. هاوکات باسی کورد و ئەو شەڕ و ناکۆکیانە کراوە، کە وەك رەنگدانەوەیەکی ئەو ململانێیە لە نێوان ئێرانی و عوسمانیەکان روویدەدا.

**بەشی دووەم:** باسی کوردستانە لەماوەی جەنگی جیهانی یەکەم، لە دوو باس پێکهاتووە.

**باسی یەکەم:** لە شوێنی کوردستان توێژراوەتەوە وەك گۆڕەپانێکی ململانێی چەکداری و ئەو رووبەڕوو بوونەوانەی لەسەرخاکی کوردستان روویاندا. کە بەشێکیان چارەنووسی شەڕەکانی بەرەی رۆژهەڵاتی دیاریدەکرد، وەك شەڕی سەری قامیش، هاوکات ئاماژە بۆ ئەو ماڵوێرانی و دەردەسەریە کراوە، کەوا گەلی کورد لە ئەنجامی ئەم جەنگەدا دوچاری هات.

**باسی دووەم:** باسی کورد دەکا لە نێوان بزاڤی نەتەوایەتی، واتە هەوڵەکانی لەپێناو ئامانجە نەتەوەییەکانی خۆی، لەگەڵ هەوڵی لایەنە شەڕوانەکان بۆئەوەی کورد لەپێناو ئامانجەکانی خۆیاندا لەم جەنگە بەکاربێنن.

**بەشی سێیەم:** تایبەتە بە باری کوردستان لە دوای جەنگ، لە دوو باس پێکهاتووە:

**باسی یەکەم:** لەو ململانێ و ناکۆکیانە توێژراوەتەوە کە دوای جەنگ هاتە ئاراو رۆڵی کاریگەریان لە دیاریکرنی چارەنووسی کوردستان بینی. باسی هەوڵی زلهێزەکان کراوە بۆ دامەزراندنی ئەو دەوڵەتە ناوچەییانەی کە کوردستانیان بەسەر پارڤەکرا. شوێنی کوردستان و کاریگەری لەسەر دۆزی کورد لەم بوارەدا روونکراوەتەوە.

**باسی دووەم:** باسی ئەو ململانێیە دەگرێتە خۆ کەلەسەر پەترۆل و شوێنی جیوپۆلەتیکی کوردستان سەری هەڵدا. کە بوو بەتەوەری ململانێی سەر کوردستان. هاوکات لەو رایانەش توێژراوەتەوە کە لەم بارەیەوە نووسراون، لەگەڵ هەوڵدانێك بۆ هەڵسەنگاندنیان.

**بەشی چوارەم:** لەم بەشەدا ململانێی ناوچەیی لەسەر کوردستان خراوەتە روو، کە خۆی لەبنەڕەتدا، ململانێی تورك و فارس و عەرەب دەگرێتەوە. وەڵێ لەبەرئەوەی فارسەکان نەچوونە ناوجەنگەوە، دواتریش ئینگلیزەکان هەوڵیاندا بەهەمموو شێوەیەك لەم ململانێیەیان دووربخەنەوە، ململانێیەکەش زێتر لە باشوری کوردستان بوو، کە بەشێك بوو لە ئیمپراتۆریای عوسمانی پێشوو، ئینگلیزەکان گەرەکیان بوو بەمیسۆپۆتامیای بلکێنن، ململانێیەکە لەم پێواژۆکە زێتر لەنێوان تورك و عەرەب بوو لەسەر کوردستان. بۆیە رۆڵی فارسەکان باسێکی تایبەتی بۆ تەرخان نەکرا، بەڵکو لەدووتوێی بەشی سێیەم و بەشی پێنجەمدا، کە باسی بزاڤی کورد دەکرێ رۆڵی فارسەکان روونده‌کرێتەوە، بۆیە ئەم بەشە لە دوو باس پێکهاتووە.

**باسی یەکەم:** دەربارەی ململانێی دەسەڵاتداری ناسیونالستی تورکە لەسەر کوردستان. باس لە سەرهەڵدانی بزاڤی کەمالیستەکان و قۆناغەکانی ململانێیان لەسەر کوردستان کراوە، هاوکات ئاماژە بۆ دەسەڵاتی داتەپیوی عوسمانیەکان دەکرێت کە چۆن هەوڵیاندەدا کورد فریو بدەن و وابکەن وەك ئەنجامی دۆڕاندنیان لە جەنگ کوردستانیان لێ جوێ نەکرێتەوە.

**باسی دووەم:** باس لە ململانێی دەسەڵاتداری ناسیونالستی عەرەب دەکرێت لەسەر کوردستان، کە چۆن بەشێکی زۆری کوردستانیان وەك پارچەیەکی جوێ نەکراوە لە نیشتمانی عەرەبی حسێوکردووە! هەروەها ئاماژە بۆ هاتنی فەیسەڵ و هەوڵەکانی دەوڵەتی تازە دامەزراوی عێراقی بۆ لکاندنی بەشێکی گرنگی باشوری کوردستان بە مسیۆپۆتامیاوە دەکرێ.

**بەشی پێنجەم:** تەرخانکراوە بۆ بزافی کورد لە نێوان هاریکاری نێو دەوڵەتی و ناوچەیی، لە دوو باس پێکهاتووە:

**باسی یەکەم:** باسی هەوڵەکانی کورد خۆی دەکرێت لەدوای جەنگەوە تا کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٢٥. لەو راپەڕینانە توێژراوەتەوە کە لەو ماوەیەدا لە هەموو پارچەکانی کوردستان دایسان، هەروەها پەیوەندی و کاریگەریان لەسەر یەکتر روونکراوەتەوە، هاوکات باسی هەوڵەکانی داگیرکەران کراوە بۆ سەرکوتکردنەوەی ئەو راپەڕینانە.

**باسی دووەم:** باسی ئەو ڕێکەوتننامەو هاریکاریە ناوچەیی و نێو دەوڵەتیانە دەکرێت، کە لەدوای دەرچوونی بڕیاری کۆمەڵەی گەلان بەلکاندنی باشوری کوردستان بە میسۆپۆتامیا گرێدران لەپێناو لەناوبردن و نەهێشتنی بزافی نەتەوایەتی کوردی. هاوکات باسی راپەڕینەکانی کورد دەکرێت لەنێو تەونی ئەو ڕێکەوتننامانە. ئەم باسە لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٢٥ بەخۆوە دەگرێ تا ساڵی ١٩٣٢. کە دوا باسی توێژینەوەکەیە.

**ئەنجام:** پوختەی ئەو خاڵانەی تیا روونکراوەتەوە، کە توێژەر لەئەنجامی توێژینەوەکەیدا پێی گەیشتووە.

ئەو ئەستەنگانەی رووبەڕووی توێژەر هاتن گەلێك زۆرن، رەنگە لەپێشەوەی هەموویان بەکارهێنانی زمانی کوردی بێت ! لەبەرئەوەی دوای نۆ ساڵ لە راپەڕینی خەڵکی باشوری کوردستان و لە هەرێمی کوردستانی ئازاد دا، ئەوە یەکەمین نامەیە بەزمانی کوردی دەنووسرێت، زمانی کوردیش وەك دەزانین نە لەرووی ڕێنووسەوە یەکیەتی هەیە، نە لەرووی زمانەوە. واتە نووسین بەو زمانە دەوڵەمەندو ... ناگزوورە ! لە بابەتێکی ئەکادیمی مێژوویی، کە هێشتا کەس کاری پێ نەکردووە، هەنگاوێکی سەخت و تژی ئەستەنگ بوو، وەلێ وەك دەڵێن ڕێگای هەزار میل لەیەك هەنگاوەوە دەست پێدەکات، هەرچۆنێك بێت بە باشمان زانی بەهەموو کەم و کوڕیەکەوە ئەم هەنگاوە هەڵێنین و شەرەفی نووسینەوەی یەکەم نامەی ئەکادیمی لە بواری مێژوودا بەزمانی کوردی وەدەست بێنین. تا خوێنەریش دوچاری ئەستەنگ نەبێت، وامان بەگونجاو زانی کە لەپاشکۆکان، فەرهەنگۆکێك بۆ ئەو ووشانە بکەین کە لەوانەیە لای خوێنەرێکی ئاسایی نامۆ بێت. بەمەش ئەگەر بۆ کەمێکیش بێت ئەرکی خوێندنەوەی سووکتر بێت. لە ئەستەنگەکانی تر نەبوون، یاخود کەمی ئەو سەرچاوانەی لەسەر ئەم بابەتە نووسراوە. هاوکات هەژاری کتێبخانەکانی کوردستان لەم جۆرە بابەتانە. هەروەها لەبەردەست نەبوونی

بەڵگەنامەکان بەشێوەیەکی راستەوخۆ، کەبەداخەوە لە کوردستان تا ئێستا شوێنی تایبەت بەپاراستنی بەڵگەنامەکان دانەمەزراوە. سەرباری ئەمە ئەو بەڵگەنامانەی هەن، لەبەردەستی ئەو دەوڵەتانەدایە کە کوردستانیان بەسەر پارڤەکراوە و یادەستیان ناگاتێ، یا بەئەستەنگ دەستیان دەگاتێ !

یەکێك لە ئەستەنگەکان چۆنیەتی بەکارهێنانی زاراوەکان بوو، لەبەرئەوەی بەشی زۆری مێژووی کورد لەلایەن دوژمنانیەوە نووسراوە، بۆیە هەموو هەوڵێك دراوە ئەم مێژووە بشێوێنرێ، ویستوویانە ناوی کوردستان لە نێو ململانێیەکان بسڕنەوە. یاکوردستانیان بە بەشێك لەو دەوڵەتانە ژماردووە و شوێنی کوردستانیان بەئەنقەست گوم کردووە، یاخود زاراوەی وایان بەکارهێناوە کە رووی راستەقینەی شتە بنەڕەتیەکان بشارێتەوە. بۆ وێنە لەجیاتی باشوری کوردستان (ویلایەتی موسڵ)یان بەکارهێناوە ! جا ئەگە ربێت و باشوری کوردستان بەکاربێنین، ئەوا زاراوەکە لەواتاکەی خۆی فراوانتر دەبێت و بەشی باشوری رۆژهەلاتی کوردستانیش دەگرێتەوە، کەجیایە لەو دەوڵەتەی بەشەکەی تری باشوری کوردستان (ویلایەتی موسڵ)ی بەرکەوتووە. بۆ چارەسەرکردنی ئەم ئەژواریە هەوڵماندا ئەگەر مەبەستمان باشوری کوردستان بەواتا فراوانەکەی بێت، ئەوا وەکو خۆی بەکاری بێنین، ئەگەر مەبەستیشمان ویلایەتی موسڵ بێت، ئەوا باشوری کوردستان، لەو شوێنانەی پێویستیش بێت، - ویلایەتی موسڵ - کەی لەتەك بنووسین، تاسەر لە خوێنەر نەشێوی و بابەتەکانی لێ تێکەڵ نەبێت.

ئەو بەڵگەنامەو سەرچاوانەی دەستمان کەوتن ئەو روانگەیان لەکن چێکردین، کە ئەو وولاتانەی کوردیان بەسەر پارڤەکراوە، زۆر رەگەزپەرستانە مامەڵەیان لەگەڵ کورد کردووە، بەهەموو شێوەیەك هەوڵیانداوە ناسنامەی کورد بوونی گەلی کورد بسڕنەوە. ئەو دروشمە بریقەدارانەی کە بۆ برایەتی و هاوئایینی بەرزکراوەتەوە زێتر بۆ فریودان بووە. ئەمە وایکرد زۆر راستەقینە هەیە پێویستە وەکو توێژەرێك بینووسین و ئەگەرنا پێمان وادەبێ لەدەست پاکی مێژوویی لاماندا وە. کە لەئەنجامدا دڵنیاین ئەگەر لە روانگەیەکی مێژوویی و ئەبستراتیکەوە سەیر نەکرێن رەنگە بەشێوەیەکی تر وەدیارکەون ! هەرچۆنێك بێت توێژینەوەی ئەکادیمی پێویستە راستەقینە مێژووییەکان بدرکێنرێ و نەخزێتە بن باری روانگەی سیاسیەوە.

هەوڵماندا بەگوێرەی توانا بەنەرمی مامەڵە لەگەڵ بەڵگەنامەکان بکەین، ئەگەرچی بەشێکی زۆری ئەو بەڵگەنامانەمان لەدووتوێی کتێب، یا ئەو نامانەی ماستەر و دکتۆرا وەرگرتووە کە لەو دەوڵەتانەی کوردستانیان بەسەر پارڤەکراوە، بەتایبەتی لە زانکۆکانی عێراق وەرگیراون.

بۆ نووسینەوەی ئەم بابەتـە پشـت بەژمارەیـەکی زۆر لەسـەرچاوە بەسـتراوە، لەوانـە ئـەو کتێبانـەی کـورد خۆیـان نووسـیویانە، کەبەداخـەوە ژمارەیـان زۆر کەمـەو بەپەنجـەی دەسـت دەژمێردرێن، بەتایبەتی لەماوەی بەر لەجەنگی جیهانی یەکەم کە چەند کتێبێك هەیـە ئاماژە بـۆ ئەو سەردەمە دەکات، لەوانە یاداشتەکانی زنار سلوپیێ. یـاخود ئـەو کتێبانـەی وەرگێڕدراونەتـە سەر زمانی کوردی، لەوانە کتێبەکەی لازاریف (کێشەی کورد)، کەیەکێکـە لەکتێبـە دانسـقەو نایابەکانی لەسەر کورد نووسـراوە لـەکۆتایی سـەدەی نۆزدەهـەم و چارەکی یـەکـەمی سـەدەی بیستەم. ئەم کتێبە بەشێوەیەکی بنەڕەتی پشتی بە بەڵگەنامەکانی ئەرشیفی روسی بەسـتووە. بۆیـە لە رێگای ئەم کتێبەوە توانرا ژمارەیەکی زۆر بەڵگەنامەی روسـی بەسـەر بکرێتـەوە. هـەرچی لـە ماوەی جەنگ و دوای جەنگە، سوودمان لەو یاداشتنامانە وەرگرت کـە لەلایـەن ئـەو کەسانەوە نووسراوە کە لەو رۆژگارەدا ژیاون و کەم یـا زۆر بەشـداری رووداوەکانیـان کـردووە. لەوانـە یاداشتنامەکانی رەفیـق حیلمـی و ئەحمـەد تـەقی و حەسـەن هوشـیار و شـێخ لـەتیف. هـەروەها کتێبەکانی ئەحمەد خواجە. هاوکات سوود لە یاداشتنامەی ئەو کوردانە وەرگیراوە کـە بـە زمـانی فارسی نووسیویانەتەوە، وەکـو یاداشتەکانی (شـێخ رەئوفـی ضیـایی)، یـاخود مـەردۆخی کـە لەدووتوێی کتێبەکەی کورد و کوردستان ئاماژەی بۆ کردووە.

هەروەها سـوود لـەو سەرچاوانە وەرگـیراوە کـە بـەزمانی عـەرەبی نووسـراون، یـاخود وەرگێڕدراونەتە سـەر زمـانـی عـەرەبی. لەوانـە کتێبـەکانی (الحسنی) وەکـو (العـراق في ظـل المعـاهدات) و (تـاريخ الـوزارات العراقيـه) و... هتـد، کـە لـە رێگایانـەوە ژمارەیـەکی زۆر لـە بەڵگەنامـەکانی حکومـەتی عـێراقی بەسـەر کراوەتـەوە. لـەپاڵ ئەمەشـدا سـوودێکی زۆرمـان لـە کتێبەکانی عەبدولعەزیز سلیمان نەوار وەرگرت. وەکو (المصالح البريطانيـــة في انـهار العـراق و تاريخ العراق الحديث ...). کـە پشـتیان بەژمارەیـەکی زۆر لـە بەڵگەنامـەی دانسـقەی بـەریتانی بەستووە. ئەمە سەرباری ژمارەیـەکی زۆر لـەو سـەرچاوانەی کـە لەبیبلۆگرافیاکـە ئاماژەیـان بـۆ کراوە.

لەگـەڵ ئەمانـەدا پشـت بەژمارەیـەك لەسـەرچاوەی فارسـی بەسـتراوە، یـاخود ئەوانـەی وەرگێڕدراونەتـە سـەر زمـانی فارسـی، لـەو کتێبـە پڕ بایەخانـەی کەسـوودی لێ وەرگـیراوە، کتێبەکەی کاوە بیات، (شورش کردهای ترکيه و تأثيرآن بر روابـط خـارجی ايـران) بـوو. کـە پشتی بەژمارەیەکی زۆر لە بەڵگەنامەکانی شـالیارگەی هـەندەرانی بـەریتانی بەسـتووە. هـەروەها

کتێبێکی تری هەمان نووسەر، (ایران و جنگ جهانی اول)، کـە تایبەتـە بـە ژمارەیـەکی زۆر لـە بەڵگەنامەکانی شالیارگەی ناوەخۆی ئێرانی لە کاتی جـەنگی جیـهانی یەکـەمدا. کـە نووسـەری ناوبراو کۆی کردۆتەوە، بەتایبەتی بۆ بەشی دووەمی توێژینەوەکـە سـوودی لێ وەرگـیراوە، کـە بەراستی بەڵگەنـامـەی پـڕبایـەخیـان بـەخۆوەگـرتووە دەربارەی باری رۆژهەڵاتی کوردسـتان لـە ساڵەکانی جەنگی جیهانی یەکەم. یاخود ئەو بەڵگەنامە ئینگلیزیانەی وەگێڕدراونەتە سەر زمـانی فارسی، وەکـوو ((اسـناد محرمانـۀ قـرارداد ۱۹۱۹)). ئەمـە جگـە لـەو بەڵگەنامـە ئینگلیزیانـەی وەگێڕدراونەتە سەر زمـانی عـەرەبی، وەکـو کتێبەکـەی ولیـد حـەمدی ((الکـرد وکردسـتان في الوثائق البریطانیة، یاخود ئەو بەڵگەنامەی د. ئەحمـەد عوسمـان لـەژێر نـاوی ((کردسـتان في عـهد السلام)) بەزنجیرە لە گۆڤاری (الثقافة)ی بلاوکردۆتەوە. لەپاڵ ئەو بەڵگەنامـە بەریتانیانـەی عزیـز الحاج کە لەدووتوێی کتێبەکەی (القضیـــة الکردیـە في العشـرینات) بـلاوی کردۆتـەوە. ئەمـە سەرباری ئەوەی سوود لەژمارەیەك لەسەرچاوەی تورکـی وەرگـیراوە، وەکـو (NUTUK)ەکـەی مستەفا کەمال و (ISTIKLAL SAVAS VE LOZAN)ەکەی عیسمەت ئینونۆ، کە سـەربردەکانی کۆنگرەی لـۆزان بـاس دەکـات. هـەروەها پشـت بـە ژمارەیـەکیش لـە سـەرچاوەی ئینگلـیزی بەستراوە کە لەبیبلۆگرافیاکە ئاماژەی بۆ کراوە.

لە کۆتاییدا ئەوە مـاوە بڵێـم، ئەگـەر هـەم و کـوڕی و ناڕاسـتیەك لـەم توێژینەوەیـەدا هەبێت، بەهیچ کلۆجێك ئەنجامی کەمتەرخەمی نیە، ئـەوەی زانـراوە کـراوە، مرۆڤیـش هـەرگیز نـاتوانێ هـەموو کـەم و کوڕیـەکانی خـۆی پڕبکاتـەوە، ئـەوەی وابزانـی کـەوا نـەزانی خـۆی پڕکردۆتەوە، ئەوا لە گۆماوی نەزانیەکی تاریك و قـووڵ مەلـەدەکات. هیواداریـن توانیبێتمـان راژەیەکی مێژووی کورد بکەین ئەگەر کەمیش بێت.

# دەروازە

لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە، بەشێوەیەکی گشتی ململانێ لەسەر ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی ناڤین گۆڕانێکی گەورەی بەسەردا هات. دوو هێزی تر لە گۆڕەپانەکە ڕۆلیان دیارترو بەرچاوتر کەوت. ئەوانیش فەڕەنگ و ئینگلیزەکان بوون.

دوای ئەوەی ناپلیۆن لە ساڵی ١٧٩٨ میسری داگیرکرد. بەریتانیەکان مەترسیان لەسەر بەرژەوەندیەکانی خۆیان لە ڕۆژهەلاتی ناڤین پەیداکرد. ئەمەیان بە سەرەتایەك زانی بۆ گەفی فەڕەنگەکان لە هیند. رای کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلات لەم بارەیەوە زۆر ئاشکرابوو. لە نووسراوێکی لێژنەی نهێنی سەر بەم کۆمپانیایە کە لە ١٨ حوزەیرانی ١٧٩٨ دا نووسراوە، ڕوونیان کردۆتەوە کەوا لە مەترسی فەڕەنگەکان بۆ سەر هیندستان هەڵدەلەرزن، ئیمپراتۆریاکەیان لە ڕۆژهەلات شتێك بووە فەڕەنگەکان بە بەردەوامی ئێرەییان پێ بردووە. هەروەها ئەوە نیشان دەدەن زانیاریان لابووە کە حکومەتێکی پێشوویان هێویەکی ترسناکی هەبووە، گەرەکی بووە لە ڕێگایەك بگانە هیندستان لە ڕێگای ترۆپکی هێوی باش" رأس الرجاء الصالح" کورتر بێت [٤٨:٨٤]. کەواتە ئینگلیزەکان مەترسی ئەوەیان دەکرد فەڕەنگەکان بەکورترین ڕێگا بگەنە هیندستان و زەبرێك لە بەرژەوەندیەکانیان بوەشێنن. بێگومان کورتترین ڕێگاش ڕێگای فورات بوو ! ئەمەش ئەوە دەردەخا کە ئەو هەوڵەی فەڕەنگەکان پەیوەندیەکی پتەوی بە کوردستان هەبوو. بۆیە ئینگلیزەکان بۆ ئەوەی کۆسپیان بۆ چێ بکەن، هەر لەهەمان ساڵدا کۆمیساریەکیان لەبەغدا کردەوە، بەم جۆرە کوردستان کەوتە نێوان سێ جەمسەری ململانێ، یەکێك لە میسرو یەکێك لەبەغدا ئەوەی تریشیان لە هیندستان، بەر لەویش ئێران بوو، کە بەشێکی گەورەی ڕۆژهەلاتی کوردستانی پێوە لکێنرابوو. بۆ هەمان مەبەست دەبینین لەنێوان ساڵانی ١٨٠٠-١٨٠٧ کۆمەڵێك ڕێکەوتننامە لەنێوان روس و فەڕەنگ و ئینگلیزەکان گرێ دەدرێت.

فەڕەنگەکان هەر بەوە نەوەستان لەگەڵ روسەکان ڕێکەون، بەڵکو هەوڵیاندا لە بـەغداش جێ پێی ئینگلیزەکان لەق بکەن، بۆیە کاتێك سلێمان پاشای بچووك (١٨٠٨-١٨١٠) بـووە والی بەغدا، لێپرسراوە بەریتانیەکان دوچاری دڵە ڕاوکێیەك بوون، گومانیان لەوە پـەیدا کـرد، والی نوێ لەسەر حسێوی بەریتانیەکان سیاسەتی نزیـك بوونـەوە لـە فەڕەنگـەکان بگرێتـە بـەر. بەتایبەتیش دامەزراندنی ئەم والیە لە ئەنجامی هەوڵەکانی باڵوێزی فـەڕەنگ لـە ئەسـتانە دا هـاتبوو [٨٤: ٩٠]. دوای ئەو هەنگاوانەی فەڕەنگ، ئینگلیزەکان راشکاوانەتر بـۆ نـاوەوەی کوردسـتان واژی بوونەوە. لەساڵی ١٨٢٠ ریچ گەشتێکی بۆ کوردستان کرد. ئەمە زەندەقی عوسمانیـەکانی برد. چونکە دەیانزانی ئینگلیزەکان لە کوردستان شتێکیان لەبن سەردایە. دوای ئـەو گەشـتەی ریچ، هەر چەندە سلێمانی بەناوچەیەکی ئیمپراتۆریای عوسمانی دەژمێردرا، مەحمود پاشا بـڵاوی کردەوە کە لەبن دەسەڵاتی شای ئێران دەبێت. بۆ بارمتـەش کوڕێکـی خـۆی نـاردە کرماشـان. خالفین وای بۆ دەچێ ئەم بڕیارەی بەپێی ئامۆژگاریەکانی ریچ ئەنجام دابێ، چونکـە لـەو کاتـەدا ئێران پـتر لـەبن دەسـەڵاتی ئینگلیزەکـان دابـوو، بۆیـە فـراوان بوونـی ئـێران لەسـەر حسـێوی عوسمانیەکان لە سوودی ئەواندا بوو، لەلایەکی تر خۆشکردنی ئاوری دوژمنـداری لـەنێوان ئـەم دوو دەوڵەتە رێگای ناوبژیوانی بۆ ئینگلیزەکـان خۆشـدەکرد [٥٠: ٥٠-٥١]. ئـەم پێنگاوانـە بووە سۆنگەی ئەوەی لە سـاڵی ١٨٢٢ شـەڕ لـەنێوان ئـێرانی و عوسمانیـەکان دایسـێ، سـاڵێك دواتر پەیماننامەی ئەرزەڕۆمی یەکەم گرێدرا.

روودانی گۆڕان لە تەرازووی ئـەم هێزانـەو ئـەو ئـەژواری و تەنگژەیـەی لـەو دەقـەرەدا سەری هەڵدا، بەرایێ لە بەرژەوەندی کورد دابوو، توانی سوود لـەو ململانێیـە نێـو دەوڵەتیـەدا وەرگرێ. وەك فرایزەر دەڵێ : "بوژانەوەی راستەقینەی میری سۆران لەکاتی شەڕی نێـوان روس و ئێران دەست پێدەکات. کاتێك ئێرانیەکان ناچار بوون سوپاکانیان بـۆ بەرامبـەر ئـەو دوژمنـە بکێشنەوە کە مەترسی لەسەر وولات زێتر بوو. میر ئەو هەلەی قۆستەوەو هەموو ئـەو زەویانـەی گێڕایەوە کە ئێرانیەکان لـێیان بێ بەش کردبوو. بگرە زۆر ناوچەی تریشی خستە بـن رکێفـی خۆیەوە" [١٥٣: ١١-١٢] تەنانەت رۆڵی کورد لەو ململانێیەدا تا ئـەو رادەیـە بـەرز بـووەوە، ئەو دەوڵەتانە کوردیان بە سۆنگەی هەموو شەڕو ئاژاوەیەکی نێوان خۆیان دەزانی. لەو نامەیەی ئێرانیەکان بۆ باڵوێزی بەریتانی لە ئەستانەیان نارد، شەڕو شۆڕی نێوان ئـەم دوو دەوڵەتـە، واتـە ئێران و عوسمانیەکانیان "لەڕەفتارو کرداری کوردانی بەد نیهادو دانیشتوانی ئەولای سنوورەوە" [٢٦: ١١٨] دەزانی !.

ئێرانیەکان ئەو نامەیان بەهەر مەبەستێك و لەسایەی هەر پاساودانێك نووسیبێ، ئەوە دەسەلمێنی کورد رۆڵی دیاریان لە رووداوەکاندا هەبووەو هەوڵیانداوە ئاشتی و شەڕەکان بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانی خۆیان بجووڵێنن، هاوکات کاریگەریشیان لەسەر نەخشەی سیاسی ئەم دوو هێزەدا هەبووە، چونکە زۆر لەمیرە دوورخراوەکان لە ئەستانە یاخود لە تەوریز بوون، واتە لە مەڵبەندی دەسەڵاتەوە نزیك بوون، بۆیە هەمیشە لایەکیان لە مەژی سیاسەتوانانی ئەم دوو دەوڵەتە داگیر کردبوو، منشیء بەغدادی دەڵێ : "ئەو پاشایانەی لەکار خرابوون، لەبەغدا ژمارەیان دەگەیشتە هەزار سوار" [٣٤:٢٤٧].

هەر چۆنێك بێت کوردەکان رقێکی زۆریان بەرامبەر عوسمانی و ئێرانیەکان هەبوو. ئەمە وایکردبوو هەر هێزێکی نوێ سەرهەڵبداو بێتە ئەو دەڤەرە پشتگیری بکەن. بۆیە کاتێك شەڕی تورکی – روسی ١٨٢٨–١٨٢٩ دایسا، کورد هەوڵیاندا خۆیان لەو شەڕە بدزنەوە. میرنشینەکانی هەکاری و بۆتان بەشداری شەڕیان نەکرد، بەهلوول پاشا کوردێکی بایەزید بوو هەوڵیدا هاوپەیمانیەتی لەگەڵ روسەکان گرێ بدا، کەچی سەرنەکەوت، فینشسکی دەڵێ : "لەکاتی شەڕی روسی – تورکی، کورد سەرداری هەڵوێست بوون" [١٧٨:١٤٢]. تەنانەت کاتێك سوپای روسی لە ساڵی ١٨٢٩ ئەرزەرۆمی گرت، ئەو شارە زۆرینەی کورد بوون، وەك پۆشکین، شاعیری گەورەی روسی کە وەك رۆژنامە نووسێك بەشداری ئەم شەڕەی کرد، نووسیویەتی : "ئەم شارە موسڵمانە کە لەلایەن ١٠ هەزار سەربازەوە گیراوە، تاقە کەسێکیش لە دانیشتوانی بۆ جارێکیش نەهات بێزاری دەربڕێ، بەرامبەر بە کردەوەی ناهەمواری سەربازێك" [٣:٨٧]. لە ساڵی ١٨٣١ کاتێك دوو میسینێری ئەمەریکایی لە کوردستان دەگەڕان، شوانێکی کوردیان تووش هات. شوانە وای زانی ئەوانە روسن، بۆیە ئەمەی بەهەلێکی لەبار زانی و پێی راگەیاندن فەرمانڕەوای ئەوان زۆردارەو زوڵمیان لێ دەکات. هەروەها پێی گوتن ئەمە زێدی کوردانەو داوای یارمەتی لێ کردن لەدەست فارسە قزڵباشەکان رزگاریان بکەن [٦٣:٢٢].

زێدە بوون و چڕبوونەوەی ململانێی نێو دەوڵەتی، وەك ئاماژەی پێکرا، کاریگەری گەورەی لەسەر بزاڤی نەتەوەیی کورد هەبوو، لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا چەندین میری بەناوبانگ وەدەرکەوتن، کە جێگای دیاریان لەمێژووی کوردا گرتۆتەوە.

وەك ئاشکرایە هەر لە بیستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا رۆڵی ئینگلیزەکان روو لە زێدەیی و رۆڵی فەرەنگەکان ڕوو لە کزی بوو، روسەکانیش تا دەهات رۆڵیان لەدوتوێی

ململانێیەکە کاریگەرتر بوو. کاتێك محەمەد عەلی لە میسر ئەستێرەی بەختی کەوتە درەوشانەوە، فەرەنگەکان بەهەلێکی لەباریان زانی بۆ گەڕاندنەوەی نفوزی لەدەست چووی خۆیان، ژەنرال کیلگنو، باڵوێزی فەرەنگ لە ئەستانە، لە ساڵی ١٨٢٥ گوتی : "گێڕانەوەی نفوزی سیاسی و بازرگانیمان لە رۆژهەلات لەسەر پەیوەندیمان بە محەمەد عەلی وەستاوە" [١٧٤:١٠١] "محەمەد عەلی"یش کاتێك بەرەو شام هات، لە کوردستان نزیك کەوتەوە. ئەو سەرکەوتنانەی محەمەد عەلی وەدەستی هێنا وای کرد کلیلی باکورو رۆژئاوای کوردستانی بکەوێتە دەست، یاخود ئەگەر هەر نەبێت ئەو دەڤەرەی لە دەوڵەتی عوسمانی لاتەریك کرد [٢١٥:١٩٨]. لەو کاتەدا میرنشینی سۆران لەترۆپکی بەهێزیدا بوو، گەیشتبووە پێواژۆکی پێگەیین و فراوان خوازی. ئەمەش پەیوەندیەکی پتەوی بەم گۆڕانە نێو دەوڵەتیانەوە هەبوو ناشێ لێی جوێ بکرێتەوە. هەندێك لە مێژوونووسان وای بۆ دەچن کەوا پەیوەندی لەنێوان میری سۆران و سوپاکانی محەمەد عەلی لەشامدا هەبووە، حوسێن حوزنی باسی چەند نامەیەك دەکات لەنێوان میری رواندزو محەمەد عەلی ئالوگۆڕ کراوە، کە لەدوای گرتنی ئامێدی و زاخۆ و ژەنگار پەیمانی یارمەتی دانی یەکتریان گرێداوە. بەپێی ئەو پەیمانە لەشکرەکانی میسر روو بە سوریەو ئەدەنە بچێتە خوار، میریش روو بەمێردین و ئامەد (دیاربەکر) لەشکرکێشی بکات [١٦:٦٨]. یەکێکی وەکو ساڵح قەفتان لەم بارەیەوە نووسیویەتی : محەمەد عەلی داوای لەمیری رواندز کرد پەیمانێك گرێ بدەن و خاکی عوسمانی لەنێو خۆیاندا پارڤە بکەن، وەلێ ئینگلیزو فەرەنگەکان ئەمەیان ژنەوت و رێگایان نەدا [٢٥:٣٧٠]. لەراستیدا ئەگەر مشت و مڕێکیش لەسەر دەقی نامەکان و مێژووەکانیان دا لە ئارادا بێت [١٦٠:٨٢] گومان لەوەدا نیە کردارە سەربازیەکانی هەردوولا ئەوە دەسەلمێنن کە بەرەو یەك رووگە کاریان کردووە، نەك بەتەنیا میری رواندز بەڵکو تیماوی بەگ، سەرۆکی هۆزی مللی و نەوەی تەیمور پاشا، لەگەڵ ئیبراهیم پاشا رێکەوت و پاڵپشتی سوپای میسری کرد بۆ گرتنی شاری مێردین و نەیهێشت هێزەکانی عوسمانی بەرەو ئەو شارە بکشێن [١٣٣:٢٣]. تەنانەت هەندێك سەرچاوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن سوپاکەی ئیبراهیم پاشا لەسەر گۆشتی مەڕی کوردستان دەژیا [١٥٩:١٢].

ئینگلیزەکان لەوە دەترسان میری سۆران ساتێك لە ساتەکان بێ هێوی بێت و لە رقی عوسمانیەکان میرنشینەکەی بخاتە ژێر فەرمانڕەوایی میسری. بۆیە دەیانویست وابکەن میسریەکان بەشداری ئەژواریەکەی میری سۆران نەکەن. بۆ ئەوەی ململانێیەکەش تەنگژەیەکی گەورەی لێ نەکەوێتەوە، بەشێوەیەکی راستەوخۆ پەیوەندیان بەمیری سۆران

کردو ریچارد وودیان R.Wood ناردەلای، تا میر رازی بکات مل کەچی سوڵتان بێت و گوێ نەداتەدنەدانی فارسەکان. بەو هێویەی باڵوێزخانەی بەریتانی لە ئەستانە لەکن سوڵتان مشوری بۆ بخواو لێبوردنی بۆ وەرگرێ و بەپێی فەرمانێکی سوڵتانی، جارێکی تر بەسەر بەرزی بینێرێتەوە سەر میرنشینەکەی خۆی [١٠٧:٢١٥].

ئەمە ئەوە روون دەکاتەوە بەرژەوەندی ئینگلیزەکان لەدوولاوە کەوتە مەترسیەوە، هاتنی ئیبراهیم پاشا بۆ شام، کە بەدەست و فیتی فەرەنگەکانیان دەزانی، لەگەڵ بەرزبوونەوەی رۆڵی میری سۆران. ئەو دوو هێزە مەترسی راستەوخۆیان لەسەر رێگای ووشکانی هیندستان و رێگای فورات هەبوو. کە فەرەنگەکان هەر لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە، ئاواتی وەدەست هێنانی ئەو رێگایەیان لە ئەندێشەدا بوو، وەك لەنامەیەکی ناپلیۆن بۆ تەزاری روس هاتووە : "رێگای فورات نەخشەی دوا رۆژ دەنەخشێنی" [٣٧:٩٧]. بۆیە لەکاتی ئەو تەنگژانەدا ئینگلیزەکان هەوڵی وەدەست هێنانی جیاوکی روباری فوراتیان داو لەساڵی ١٨٣٤ ئەو ئاواتەیان بەئەنجام گەیشت. هنری . ب. لینچ کە خۆی رێگای فوراتی پشکنی، لە یاداشتەکانیدا باسی ئەوە دەکات کە فراوان کردنی چوارچێوەی نفوزی بەریتانیەکان لەم ناوچەیەدا توانای ئابووری و سیاسیان لە میسۆپۆتامیا زێدە دەکا، هەروەها پێی وابوو هەبوونی کەشتی بەریتانی لە فورات دەبێتە بەرپەچدانەوەیەکی بەهێز بۆ نفوزی روسەکان لە باشوری کوردستان و میسۆپۆتامیاو کەنداوی فارس، کە لەزێدەبووندا بوو. هاوکات دەبووە خاڵی بەیەکەوە گەیاندنی کەشتیگەلی بەریتانی لەکەنداوی فارس و دەریای سپیدا. هەروەها کونسوڵەکانی بەریتانی کە لە شارە گەورەکانی رۆژهەلاتی ناڤیندا بڵاو بووبونەوە، بەیەکتری دەگەیاند. ئەمەش دەبووە سۆنگەی ئالوگۆڕکردنی زانیاری و رێکخستنی کارەکان لەنێو خۆیانداو، کاری دیپلۆماتیکی ئینگلیزەکانی ئاسان دەکرد [٦٢:٢١٦]. بەم جۆرە ئینگلیزەکان گەرەکیان بوو لە رێگای کوردستانەوە دەریای سپی بە کەنداوی فارس ببەستنەوە.
بەم پێنگاوەش بەبەردێك دوو چۆلەکەیان دەکوشت، لەلایەك رێگایان لەزێتر تەشەنە کردن و پەهاوێشتنی میسریەکان دەگرت، لەلایەکی تر لەرێگای کەنداوی فارسەوە ئەو دەروازەیان لەرووی روسەکان دادەخست کە تیایدا خەونی لە مێژینەیان دەهاتە دی، ئەویش گەیشتن بوو بەئاوە گەرمەکان، لەهەردوو باریشدا دەبووە سۆنگەی بە پەراوێز کردن و لاتەریك کردنی میرنشینە کوردیەکان، کە ئەو کاتە لێدان و لەناو بردنیان ئاسان دەبوو. بۆ ئەم مەبەستەش دەبوایە دەوڵەتی عوسمانی بەهێز بکەن، تا بتوانێ ئەم کارەیان بۆ ئەنجام بدا. وەك ژەنراڵ

ئاوساند **Thausand** لە بیرەوەریەکانیدا نووسیبووی : "هیچ گەلێك نیە قەرەبووی تورکەکان بکاتەوە، بۆیە پێویستە بەبێ هێزی لەسەر رێگای هیندستان بهێڵرێنەوە و نەشێن هیچ زیانێکمان پێ بگەیەنن" [١٦٠: ١٤٧-١٤٨]. لەپێناو هێنانەدی ئەم مەرامانە، هەردوای پەیمانەکەی "کیوتاخ" لە ئایاری ١٨٣٣ و پەیمانەکەی "هونکیار سکەلەسی" * لە تەموزی هەمان ساڵدا، دۆخی جیهانی ئیمپراتۆریای عوسمانی باشترو پتەوتر بوو. سوڵتان مەحمود بریاریدا بەر لە هەموو شتێك حسێو لەگەڵ کوردەکان پاك بکاتەوە، ئەوە بوو لەساڵی ١٨٣٤ بەسەرکردایەتی رەشید پاشا، بیست هەزار تورك بە ئاوروو ئاسن کوردستانیان تەنی [٤٥:٤٨].

میری رواندز، لەو کاتەدا وەك دکتۆر روز دەڵێ : "زۆر ئارەزووی دەکرد پەیوەندی نێوان روسیاو ئێران بزانێ [١٥٣:٢٣]. لەساڵی ١٨٣٥ میر هێرشی بردە سەر هەندێك لە دەڤەرەکانی باکوری رۆژهەلاتی کوردستان، کە لەبن دەسەلاتی قاجاریەکاندابوو، بەو نیازەی بیانخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە. دوای ئەوەی بەسەر ئەو هێزانەدا سەرکەوت کە لە "خوی"یەوە کرابووە سەری، توانی ناوچەی قوتور تا نزیك سنوور بگرێ [٣٠٥:١٣٩]. ئەو هێرشەی میری سۆران لەم پێواژۆکەدا، پەیوەندیەکی ووردی بە ململانێیە نێو دەوڵەتیی و ناوچەییەکەوە هەبوو، چونکە میر لەکاتێکدا ئەو هێرشەی کرد کە زێتر پێویستی بەدۆستایەتی ئێرانیەکان هەبوو ! بۆیە ئەم پێنگاوە چەند گریمانێك بەخۆوە دەگرێت، لەلایەك دەشێ هەوڵێکی پاشای گەورەبێ بۆ نزیك بوونەوە لە ئینگلیز، کە لەوانەیە ئینگلیزەکان خۆیان دەستیان لەم کارەدا هەبووبێت ! بۆ ئەوەی لەلایەك دوژمنداری بخەنە نێوان میری سۆران و ئێرانیەکان. لەلایەکی تر عوسمانی و ئێرانیەکان لەیەکتر نزیك بکەنەوە ! لەدوایشدا ئەوەیان بۆ هاتە دیی. هەرچەندە میر محەمەد پەیوەندی بەشای قاجار کردو تەبەعیەتی ئێرانی قبووڵ کرد، بەرامبەر بەکارێکی هاوبەش دژی عوسمانیەکان [١٦٠:١٤٧] وەلێ ئێرانیەکان بەمە رازی نەبوون و کەوتنە هاریکاری عوسمانیەکان. لەنامەیەکدا مەسعود خان، شالیاری هەندەرانی

---

* بەستنی پەیماننامەی هونکیار سکەلەسی لەنێوان عوسمانیەکان و روسەکان، نفوزێکی مەزنی دا بەتەزاری روس لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتی عوسمانی. روسیا بەڵێنی بە دەوڵەتی عوسمانیدا سوپای بداتێ لەکاتێکدا ئەگەر هێرشی کرایە سەر. بەمەش روسیا تەنیا دەوڵەتی عوسمانی بۆ خۆی وەك کۆلۆنیالەك مسۆگەر نەکرد، بەڵکو دەروازەکانی "دەریای رەش"یشی بۆ خۆی دابین کرد [١٠٦:١٧٤].

ئێران، بۆ زێرەڤانی کاروباری هەندەرانی دەوڵەتی عوسمانی ناردووە، تیایدا دەڵێ : "لەم چەند ساڵەدا چەندین جار لەلایەن میری رواندز دەست درێژی کراوەتە سەر خاکی ئەم خاوەن دەسەڵاتەو زیانی گەورەشی پێگەیاندووە. بۆ تەمێکردن و بەرپەچدانەوەی ئەم یاخییە، بەهۆی پەرەسەندنی دەست درێژی زۆریەوە بۆ سەر سنوورەکانی هەردوولا، هەردوو دەوڵەت، ئالو گۆڕکردنی کاربەدەستانی خۆیان زیدە کردووە، تاوەکو ئەم یاخییە سەرکوتبکەن" [٧٥:٦٤].

بەم شێوەیە هەردوولا کەوتنە هاریکاریکردن بۆ لەناو بردنی میرنشینی رواندز. ئینگلیزەکان بەگەرمی کاریان بۆ ئەو هاریکاریکردن و لەیەکتر نزیك بوونەوەیە دەکرد، لەنامەیەکی شالیاری موختاری ئینگلیز بۆ میرزا مەسعود خان هاتووە : "ئینگلیزەکان زۆر بە پەرۆشەوەن بۆ ئەوەی ئەو کارو بارانەی پەیوەندیان بە سنووری ئێران و رۆمەوە هەیە، بەیەکگرتوویی و خۆشی چارەسەر بکرێن. هەر وەختێك بۆ تەمێکردنی تێکدەر، یا رێگرێك لەشکرکێشی پێویست بێ، هەردوو دەوڵەت بەیەکەوە رێکەون بۆ لێدانی ئەو تێکدەرە" [٢٦: ١٢٦-١٢٧]. بۆ ئەم مەبەستەش بەرژەوەندی ئینگلیزەکان لەدەست پیاهێنانەوەو بەهێزکردنی سوپای عوسمانیەکاندا بوو، ئەگینا وەك (ڤون مۆلتکە)* لە بیرەوەریەکانی خۆی نووسیویەتی "ئیمپراتۆریای عوسمانی بەرامبەر پارڤە بوون خۆی ناگرێ"، هەروەها نووسیویەتی : "ناچێتە ئاوەزەوە ئیمپراتۆریای عوسمانی زۆر بمێنێتەوە، ئەگەر لە سنوورە سروشتیەکەی خۆی نەوەستێ، لەوە زێتر بەردەوام نابێ. هەرچەندە داواکانی سوڵتان راست بێت، ئامەد (دیاربەکر) و روها (ئورفە)و بەغدا وەکو دورگەیەك وایە لەنێو دەریایەکی کوردی - عەرەبی نامۆدا بێت" [١٧٧: ٢٠٠]. سەرباری ئەوە راوێژکاری پروسی ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد کە لەماوەی هێرشەکانی ساڵی ١٨٣٧ بۆ سەر ژەنگارو جزیرە، دوو ئەفسەری ئینگلیز لەبارەگای عوسمانیەکان دا بوون، یەکەمیان کۆلۆنیل کۆنسایدی ئەوەی تریان کاپتن کێچیل بوو

---

* هلموت ڤون مۆلتکە Moltke, Helmuth Von (١٨٠٠-١٨٩١) سەرکردەیەکی سەربازی ئەڵەمانی بوو بە پلەی "فیلد مارشال" (مهیب) لە ساڵی ١٨٢٢ چووە سوپای پروسیا، ٦٦ ساڵ راژەی کرد، لە ساڵی ١٨٣٥-١٨٣٩ بوو بە راوێژکاری سەربازی تورکەکان [١٢٧: ١٠٧]. مۆڵتکە لە زۆر لەو هێرشانە بەشداری کردووە کە کراوەتە سەر میرنشینەکانی کوردو لە بیرەوەریەکانی خۆیدا ئاماژەی بۆ کردوون.

[١٩٠:١٢] ئەوانە هاریکاری عوسمانیەکانیان دەکرد، نەخشەی چۆنیەتی گرتنی قەلاو شارەکانیان بۆ دادەنان. بەم جۆرە ئەگەر هاریکاری ئینگلیزەکان نەبوایە میرنشینە کوردیەکان وا بەئاسانی نەدەڕوخان، بۆیە بەراشکاوی دەتوانین ئێژین دەوڵەتی ئێرانی و عوسمانی، شەڕو ئاشتیان بەدەست خۆیان نەبوو، هەڵوێستەکانی حکومەتی فارس ئەوەمان بۆ دەردەخەن کەوا شا گەمەیەك بوو بەدەستی روس و ئینگلیزەکان. نەدەشیا بڕیارێکی یەکلایی کەرەوە بدات [٣١:١٠٣].

ئینگلیزەکان پێیان وابوو دەبێ بەشی شێریان لە کوردستان هەبێ، بەتایبەتی لە باشوری کوردستان. هنری راولسون، کە لە ساڵانی ١٨٤٠ کونسوڵی بەریتانی بوو لە بەغدا، لەم بارەیەوە دەڵێ : روس و فەڕەنگ رقیان لە ئینگلیزەکان دەبێتەوە، لە سۆنگەی ئەو سەرکەوتنانەی لە ئاوی کوردستان * وەدەستیان هێناوە، سیاسەتوانی گەورەی فەڕەنگسی "گیزو" بەریتانیەکانی بەوە تاوانبار دەکرد کە رێگای دەریاوانیان لەدوو رێگای کورتی جیهانی مونۆپۆل کردووە، رێگای میسر و رێگای فورات [٢١٦: ٦٥-٦٦].

لە سۆنگەی ئەو تەنگژە بەردەوامەی نێوان عوسمانی و ئێرانیەکان و دەست تێوەردانی روس و ئینگلیزەکان، هەلێکی لەبار بۆ میری بۆتان رەخسا، توانی بەماوەیەکی کەم ناوچەیەکی فراوانی کوردستان ئازاد بکات، نفوزی میر بەدرخان، وەك دکتور رایت و مستەر بیرپ دوای چاوپێکەوتنیان لەگەڵیدا باسی دەکەن، لەرۆژهەڵاتەوە دەگەیشتە سنووری فارسەکان. لە رۆژئاواوە تا میسۆپۆتامیا**، لە دەروازەی ئامەدەوە تا دەروازەی موسڵ، ناوبانگیشی لەهەموو شوێنێك بلاو ببووەوە [٦٢:٣١٢]. بۆیە نوێنەرانی روس و ئینگلیز و فەڕەنگ، هانی عوسمانیەکانیاندا پەلاماری میری بۆتان بدەن، عوسمانیەکانیش دەیانویست پەیوەندی نێوان کوردو نەستووریەکان تێکبدەن. پاشای موسڵ لەنامەیەکی بۆ مارشیمون هەرێی ئەوەی پێدا ئەگەر دژی کوردەکان بجوولێتەوە پشتی دەگرێ [٣٩:٢٤٥] گەیشتنی "گرانت"یش ئەگەرێکی گەورە بوو بۆ ئەوەی هەڵوێستی نەستووریەکان بگۆڕێ. کە بەئارامی

---

* بەداخەوە زۆر لەمێژوونووسان بۆ شاردنەوەی راستەقینە ئاوەکانی عێراق بەکاردەهێنن. کە ئەو کاتە عێراق بوونی نەبوو.

** رەنگە مەبەستی لە ناوچەکانی نێوان خاپور و فورات بێت .

لەبن سایەی دەسەڵاتی کورددا دەژیان. "گرانت" وای لێکردن دژی کوردەکان راست بنەوە، سەرباری ئەمەش بەناوی دامەزراندنی مەڵبەندێکی میسینێری دەستیکرد بەدروستکردنی نیمچە قەڵایەك، تەنانەت شوێنی ئازووقەو بەرگری کردنی تیا چێکردبوو [٢١٥: ٣١٠-٣١١]. بێگومان ئەم رەفتارانە سیاسی بوون و ئەگەر جیاوازی ئاینیش لە ئارادا بووبێ، هیچ پەیوەندیەکیان بە ئاینەوە نەبووە.

لە ئەنجامدا میری بۆتان بۆ تەمێ کردنیان سوپای کردنە سەر، دەوڵەتی عوسمانیش ئەگەر ماوەیەك بەر لەو کاتە مانەوەی میر بەدرخانی بەکەم و کورپەك لە دەسەڵاتی ناوەندی دەژمارد، ئەو کاتە مانەوەیانی بەجێگای شەرم دانا [٢٤٥:٦١]. بۆیە هەمدیس گەمەکەی میری سۆران دەستی پێکردەوە، لەلایەك کەوتنە هاریکاری دەوڵەتی عوسمانی، لەلایەکی تر هانی ئێرانیاندا دژی میری بۆتان بوەستێ و ئەگەر هەر نەبێت دڵدەیان نەدات. ئەنجامی ئەمەش، کاتێك هەندێك لە سەرۆکە کوردە راپەڕیوەکان پەنایان بۆ کاربەدەستانی ئێران بردو پرسی ئەوەیان کرد، کە ئەگەر هاتوو سەرنەکەوتن دڵدەیان دەدات ؟! ئێرانیەکان بەراشکاوی گوتیان : ئەگەر بەرەو رووی هێزەکانی عوسمانی ببنەوەو بەرگری بکەن، ئەوا وەك دوژمن سەیریان دەکەن و چاوەڕوانی ئەوە نەبن بە دەنگیانەوە بێن، خۆ ئەگەر بێ تەق و تۆق جزیرە چۆڵ بکەن ئەوا پەنایان دەدەن [٢٤٧:١٢]. بەم چەشنە میرنشینی بۆتانیش کەوتە نێو دانەی ململانێیە نێو دەوڵەتی و ناوچەییەکەو بووە گوری بەرژەوەندی زلهێزەکان. لە ساڵی ١٨٤٧ میرنشینەکەی بۆتانیش دیماهی پێ هێنرا، هەر ساڵێك دوای ئەوە شۆڕش زۆربەی وولاتانی ئەورووپای گرتەوە، پەتای ئەم شۆڕشانە گەیشتە موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە باڵکان [٢٧١:١٥٦]. لەراستیدا کاریگەریان لەسەر کوردستانیش کەم نەبوو، بۆ وێنە هەردوای شۆڕشی ١٨٤٨ ئیتاڵیا، کوردستان بووە پەناگەی ئەو هاونیشتمانیە ئیتاڵیانەی لەبەر ئەگەری سیاسی ناچار بوون زێدی خۆیان جێ بهێڵن [٢٦٢:٢٤٨]. دوای سەرکوتکردنی راپەڕینەکەی بۆتان، لە سۆنگەی ئەو گۆڕانە بەلەزانەی لە پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکانەوە هاتە ئارا هاوکات قووڵبوونەوەی تەنگژەکان و تێکچوونی باری ناوەخۆی دەوڵەتی عوسمانی بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی، وردە وردە لەکوردستان رەگی راپەڕینێکی تر پنجی داکوتا. لەو کاتەشەدا دەوڵەتی عوسمانی و ئێران هەردوولا روو لەکزی بوون. بێ هێزی ئەم دوو دەوڵەتە وایکرد گۆڕانێك بەسەر

سیاسەتی زلهێزەکان دا بێت لە رۆژهەڵاتی ناڤین. دوودڵی و بێ بڕوایی جێگای متمانەو بڕوا بوونی گرتەوە. رکابەرەکان لەیەکتر دەسەنگرینەوە ! ئینگلیزو فەرەنگەکان لەوە دەترسان روسەکان دەست بەسەر گەرووەکاندا بگرن. هەرچی روسەکان بوون لەوە دەترسان دەوڵەتی عوسمانی لەناکاو بڕوخێ و ئینگلیزەکان بتوانن نفوزو دەسەڵاتی خۆیان بەسەر رۆژهەڵاتی ناڤین بسەپێنن. بۆیە هەر دیاردەیەك لە دیاردەکانی بێ هێزی دەوڵەتی عوسمانی ترسی هەردوولایانی زێتر دەکرد، هەر رووداوێکی تایبەت بەدەوڵەتی عوسمانی هەردوولای دەوروژاندن [١٦٥:٢٧١]. لەنێو ئەم دوودڵی و بێ متمانەییەدا روسەکان پێیان باش بوو دەوڵەتی عوسمانی پارچە بکرێت و لەم دڵەراوکێیە رزگاریان بێت، بۆ ئەم مەبەستەشیان، لەلایەك هەوڵیاندا پەیوەندیەکانیان لەگەڵ ئێران پتەو بکەن، لەلایەکی تر زێتر لەکورد نزیك ببنەوە. بایەخ پێدانی حکومەتی تەزاری بە کوردەکان کە بە نەتەوەیەکی ئازاو شەڕکەر ناسرابوون، بۆ ئەوە بوو تا دژی شای ئێران و حکومەتی عوسمانی شەڕیان پێ بکا، یاخود بەلایەنی کەمەوە بێلایەن بن و دژی روسیا نەجەنگێن [٤٨:٣٠].

ئەم کاودانە نوێیە وایکرد لە تشرینی دووەمی ١٨٥٣ روسەکان دژی دەوڵەتی عوسمانی شەڕ رابگەیەنن. ئەگەری پۆلەتیکی بنەڕەتیش، مکوڕ بوونی روسەکان بوو لەداگیرکردنی ئەستانەو چارەسەر کردنی دۆزی رۆژهەڵات [٣٠:١٧٨]. ئەم شەڕەش وەکو هەموو شەڕەکانی تری نێوان عوسمانی و روسەکان یەکێك لەبەرەکانی شەڕ بەرەی قەوقاز بوو، بۆیە روسەکان لەو بەرەیەدا دەستیان بە پەلاماردان کرد، دوای ئەوەی لە ساڵی ١٨٥٤ "بایەزید"یان گرت، هاوسۆزی کورد لەگەڵ روسەکان زێتر بوو، هەروەها کاریگەری زۆری لەسەر رووداوەکانی کوردستان هەبوو. چونکە کورد بەبەردەوامی لە هەلێك دەگەڕان قەوارەی لەدەست چووی خۆیان بگەڕێننەوە، عوسمانیەکان ئەگەر شیابوون میرنشینە کوردەکان لەناوبەرن، نەشیابوون گیانی ئازادیخوازیو سەربەخۆیی لەناخی کوردا کپ بکەنەوە. لەهەمان کاتدا روسەکانیش زێتر لەکورد هاتنە پێشەوە. وەك مینورسکی لەکتێبەکەی تێبینی و ووردبوونەوە نووسیویەتی : "هەر کاتێك شەڕ لەدوای قەوقاز دایسابوایە، ئێمە زێتر بایەخمان بەکورد دەدا، هەر سەرۆکی بزووتنەوە کوردیەکان خۆیان ئاگاداریان دەکردینەوە، پەیوەندیمان باش بێت لەگەڵیاندا، ئەم بارە بەردەوام بوو، بەتایبەتی لەساڵی ١٨٥٣" [١٧٤:٤٤].

سەرکەوتنی روسەکان لەبەرەی قەوقاز ترسی خستە دڵی ئینگلیزەکانەوە، بۆیە هەوڵیاندا لە پەنای خۆتێهەڵقورتاندنێك چەند ئامانجێك بهێننە دی. لەوانە سنوورێك بۆ نفوزی روسەکان لە رۆژهەلات دا بنێن و لەناوی بەرن. هەروەها لەرێگای لایەنگیری کردنی خەلیفەی موسڵمانان باری گرژی هیندستان هێور بکەنەوە. سەرباری ئەمەش گەرەکیان بوو ئەو شەڕە بقۆزنەوە بۆ ئەوەی نفوزی خۆیان لە کەنداوی فارس پتەو بکەن [١٨٢:٢٧١]. تەنانەت بەر لەدایسانی شەڕی "کریم"یش، ئینگلیزەکان دەیانزانی روسەکان گەرەکیانە بەتەنیا دەوڵەتی عوسمانی پارچە بکەن. لەو یاداشتنامەی کە راولسون (Rawlson) لە ١٣ حوزەیرانی ١٨٥٣ بۆ سکرتێری دەوڵەت بۆ کاروباری هەندەرانی نارد، تیایدا باسی توانای پارچەبوونی دەوڵەتی عوسمانی دەکرد. بۆیە وولاتەکەی هاندەدا لە رێگای هێزی سەربازیەوە دەست بەسەر ئەو ناوچانەدا بگرێ کە دەکەوتە نێوان زێی بچووك و دەریای سپی [٩٧: ٦١-٦٢]. ئاشکرایە ئەم ناوچانە باشورو باکوری رۆژئاوای کوردستان دەگرێتەوە، سۆنگەی ئەمەش ئەوە بوو ئینگلیزەکان دڵنیابوون ئەگەر روسەکان لە باشوری قەوقازەوە بەرەو خوار واژی بینەوە، لە دوولاوە مەترسیان بۆ سەر بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا دەبێت. لەلایەك لەکەنداوی فارس، لەلایەکی تر لە دەریای سپی. ئەوەی مەترسیەکانی ئینگلیزی زێتر دەکرد، ئێران هێزێکی زۆری لە کرماشان کۆکردبوەوە. کە ئەمە ئەگەر مەترسی پەلاماردانیشی لێ نەکرا بوایە، عوسمانیەکانی ناچار دەکرد هێزێکی زۆری بەرامبەر گل بدەنەوە [٢١٦: ١٠٥-١٠٦]. هەرچی عوسمانیەکان بوون، بۆ ئەوەی بەرپەچی ئەم پێنگاوانەی ئێرانیەکان بدەنەوە و ناوچەکانی بابان و سۆران بە سوپای کورد بتەنن، عەبدوللا بەگی بابانیان بانگهێشت کرد، کە لە ئەستانە لە تاراوگە بوو، تا هێزی کورد کۆبکاتەوەو بەرگری لەناوچەکەی خۆی بکات، دوای ئەمەش رەسول پاشای دوا میری سۆرانیان ناردە کەرکوك تا لەوێ هێلەکانی بەرگری بەهێز بکات [٢١٥:٣٤٤]. شایەنی ئاماژە پێکردنە عوسمانیەکان تا ئەو کاتەش بۆ ئەوەی هێوی بابانەکان نەبڕن و لەکاتی پێویست سوودیان لێ وەرگرن. زوو زوو ئەو فەرمانڕەوایانەیان دەگۆڕی کە لەم دەڤەرەدا دایاندەنان. بۆ وێنە قادری بابان دەڵێ : "بەکورتی تا ئێستا هەردوو ساڵ جارێك لەلایەن دەوڵەتی رۆمەوە فەرمانڕەوایەك بەسەر وولاتی باباندا فەرمانڕەوایی دەکات" [٢٩:١٣٧]. بەم جۆرە شەڕ زۆربەی دەڤەرەکانی کوردستانی گرتەوە، لەو کاتەدا، "یەزدانشێر" باری شەڕی "کریم"ی قۆستەوەو دژی دەوڵەتی

عوسمانی راپەڕی، یەزدانشێر لەگەڵ روسەکان هاوسۆز بوو، چەند جارێك نامەی بۆ ناردن و داوای هاریکاری و یارمەتی لێکردن.

ئەو ناوچانەی راپەڕینەکەی تیا دایسا، دەکەوتە نێوان هێزەکانی روس و دەریای سپی ناڤین. بۆیە مەترسی کەوتە سەر بەرژەوەندی ئینگلیزەکان، کە توانیان فەرەنگەکان بۆ لای خۆیان رابکێشن و بە جووتە دژی روسەکان بکەونە شەڕەوە. ئەوە بوو شەڕی "کریم" بە شکستی روسەکان دیماهی هات، لە ئاکامدا پەیماننامەی پاریس * لە شوبات و مارتی ١٨٥٦ لەژێر سەرکردایەتی شالیاری هەندەرانی فەرەنگسا ویلوسکی Wulewski کوڕی نایاسایی ناپلیۆن گرێدرا بۆ چارەسەر کردنی دۆزی رۆژهەلات لەدوای شەڕی کریم [١٢٧: ١٦٥-١٦٦]. ئینگلیزەکان لەم شەڕەدا بەتەنیا یارمەتی عوسمانیەکانیان نەدا دژی روسەکان، بەڵکو یارمەتیان دان بۆ لێدان و سەرکوتکردنەوەی راپەڕینەکەی "یەزدانشێر"یش، وەك خالفین نووسیویەتی : "داوا لە سەرۆکەکانی ئینگلیز لە رۆژهەلاتی تورکیا کرا، بەهەر جۆرێك بێت راپەڕینی کوردەکان لەناو بەرن، بۆ ئەمەش زێڕ کەوتە کار، نوێنەری کونسوڵی ئینگلیز لە موسڵ (راسام) کەوتە گفتوگۆکردن لەگەڵ یەزدانشێرو سەرکردەکانی تری راپەڕین. بەناوی ناوبژیوانیەوە توانی ناکۆکیان لەنێوان چێ بکا، لە ئەنجامدا چەند سەرۆك هۆزێك خۆیان لەجەنگ کێشایەوە [٥٠: ١٠٩-١١٠]. هەرچی روسەکان بوون ئەوا لەجیاتی یارمەتی، نامەیەکیان بۆ یەزدانشێر ناردو پێیانگوت : "سوارەکانت دامرکێنەوەو خەریکی ئیش و کاری خۆت بە" [٥٠:١٠٣]. دەتوانین ئێژین ئەمە هەڵوێستی راستەقینەی روسەکان بوو بەرامبەر بەکورد تا جەنگی جیهانی یەکەم.

---

* بەگوێرەی پەیماننامەی پاریس ١٨٥٦ دەریای رەش بەبێلایەنی مایەوە، گەرووەکان بۆ کەشتیە بازرگانیەکانی هەموو دەوڵەتان ئاوەڵا کران، جگە لەکەشتیە جەنگیەکان، لەناو ئەوانە کەشتیەکانی روسیاو دەوڵەتی عوسمانیش، وەلێ دەربارەی کەشتی جەنگی دوو هەلاوێردنی تیا بوو : ١- هەموو دەوڵەتێك کە نوێنەری دیپلۆماتیکی لەکن تورکەکان هەبوو بۆی هەبوو کەشتیە جەنگیە سووکەکانی تێپەڕێت. ٢- ئەو دەوڵەتانەی ئەندام بوون لە لێژنەی ئەوروپی بۆ دانوب مافیان هەبوو دوو کەشتی جەنگی بنێرن بۆ پاسەوانی کردنی دانوب، یاخود بۆ پاسەوانی کردنی کەنارەکانی، هەروەها ئەو پەیماننامەیە لە تورکیا و روسیای قەدەغە کرد دامەزراوی سەربازی و دەریایی لەسەر کەنارەکان چێ بکەن [١٥:١١٥].

هەرچەندە روسەکان لەشەڕی کریم دوچاری شکست بون، چاویـان لەخەونـە فـراوان خوازیەکەی خۆیان نەپۆشی. لەساڵی ١٨٥٨ بارون کونفلند بەراشـکاوی رایگـەیاند : "ئامـانجی روسەکان لە رۆژهەلاّتی نـاڤین ئەوەیـە بگەنـە کـەنداوی فـارس، هـەوڵدەدەن بـە پێنگـاوی یـەك لەدوای یەك ئەم ئامانجەیان بهێننە دی. بۆ ئەمەش چەند رێگایەك هەیە دەتوانن بیگرنە بـەر. ئـەو هێڵەی لە "کارس"ەوە بەرەو فورات و میسۆپۆتامیا دەڕوات. لەگەڵ ئەو هێڵەی لە ڕەوانـەوە ** بەرەو دەریاچەی وان، پاشان موسڵ لە دۆڵی دیجلەو دواتریش میسۆپۆتامیا. هێڵەکەی تریش لـە تەورێزەوە بۆ شوستەر [١٧٧: ١٦٩-١٧٠]. بۆ گەیشتن بـە ئـاوی کـەنداو، لـەو ڕێگایانـەوە دەبوایە کوردستانیان لەبن دەست بێ.

ئەو شەڕو شۆڕانەی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران، ئەو هەموو ڕاپەڕینانەی کورد دژی جەوروستەمی داگیرکەران، باری داتەپیوی ئابووری هێندەی تر نالەبار کرد. لەگەڵ ئـەوەش ئـەم دوو دەوڵەتە بۆ بـەهێزکردنی خۆیـان بـەردەوام بـوون لـە کۆکردنـەوەی بـاج و رووتاندنـەوەی دانیشتوانی چەوساوەی کوردستان. ئەگـەرچی برسـیەتی و قـات و قڕیەکە لـە شـوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکی تـر ئـایری بـوو، وەلـێ بەگشتی هـەموو کوردسـتانی تـەنیبوو. لـەپاڵ ئـەم کاودانـە ئەستەنگە، عوسمانیەکان، بەفیتی ئینگلیزەکـان هـەمدیس پـەلاماری سنوورەکانی ئێرانیـاندا، لـە ساڵی ١٨٦٢ کاتێك لیژنـەی دیـاریکردنی سـنووری نێـوان ئـەم دوو دەوڵەتـە کەوتـەوە کـار، عوسمانیەکان قوڵیان لـێ هەڵماڵی و لەژێر سەرکردایەتی مێژووری ئینگلیزی "فردریـك ملینگـن" کە لە لەشکری عوسمانی ناوی "سەیف بەگ"ی لەخۆی نابوو، دووبارە ناوچـەی قوتوریـان داگـیر کردەوە [٥٠:١٢٩].

لە پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی نۆزدەهـەمدا، ووردە ووردە هـێزی تـر دەهاتنـە سـەر شانۆی ململانێیەکە، وەکو ئەمەریکا. لەلایەکی تر رۆڵی فەڕەنگـەکانیش زێـتر بـەرز دەبـوەوە، ئەمەش لە ئەنجامی ئەوە بوو، هەردوو دەوڵەتی ئـێران و عوسمـانی کەوتبوونـەژێر بـاری قـەرزێکی گەورەی بیانیەوە. لە ساڵی ١٨٧٢ رۆیتەر جیاوکێکی گەورەی لە ئێران وەدەست هێنا، بۆ ئەم مەبەستەش بەتایبەتی چاوی بە "پسمارك"ی راوێژکاری ئەڵەمانی کەوت، تا بەیەکەوە کـار بکـەن بۆ ئەوەی لە رووی ئابووریـەوە سوود لە وولاّتی فارس وەرگرن. وەلـێ پسمارك ئەم پێشنیارەی رەتکردەوە، چونکە نەیدەویست پەیوەندی لەگەڵ روسەکان تێك بچێت. کە بەتوندی دژی ئەم جیاوکە بوون [١٠١: ٢٠-٢١].

---

** رەوان Rewan = یەریڤان .

هەرچەندەی هێزی نوێ و زێتر دەهاتنە سەر گۆڕەپانی ململانێیەکە باری کوردستان هێندەی تر رژدترو سەختتر دەبوو، دەربارەی ئەو کاودانەی بەسەر کورد هاتبوو، بەپلەی یەکەم ئینگلیزەکان بەر پرسیار بوون، لە ساڵی ١٨٧٣ کونسوڵی روس لە ئەرزەڕۆم بۆ باڵویزی گشتی روسی لە ئەستانەی نووسی : "لەبارەی کوردەکانەوە، رۆڵی بنەڕەتی ئینگلیزەکان وازی دەکەن نەك تورکەکان" هەروەها ئەوەی روونکردەوە کەوا کونسوڵی ئینگلیز کاریگەری گەورەی هەبووە لەسەرکوتکردنەوەی راپەڕینەکانی کورد. هەتاوەکو کونسوڵەکانیان خۆیان لیستی ناوی سەرۆك کوردەکانیان تەیار دەکردو دەیانناردبۆ باڵویزی ئینگلیزی لە ئەستانە. ئەویش هەڵدەستا بەدوورخستنەوەی ئەو کوردانە لە کوردستان [٢٤٥:٥٩]. بۆ وێنە کونسوڵی ئینگلیز لە ئەرزەڕۆم گەشتێکی بۆ کوردستان کرد بۆ ئەوەی زانیاری دەربارەی ئەو سەرۆکە کوردانە کۆ بکاتەوە کە جێگەی مەترسی بوون بۆ دەوڵەتی عوسمانی، لەڕێی دیاری و بەڵێنەوە هەوڵیدا ئەو سەرۆکانە بۆ لای خۆیان رابکێشێ [١٣:٤٨].

هەمدیس نێوان عوسمانی و روسەکان بەرەو گرژی دەڕۆیشت، بۆ روسەکانیش ئاسان بوو پاساودانێك بدۆزنەوە تا پەلاماری دەوڵەتی عوسمانی بدەن، چونکە لەساڵانی ١٨٧٥- ١٨٧٦ عوسمانیەکان زۆر دڕندانە راپەڕینەکانی باڵکانیان سەرکوتکردبووەوە. ئەمە بەشێوەیەکی گشتی ئەوروپاو گەلانی دیانی لە باڵکان زویر کردبوو. هاوکات دەوڵەتی عوسمانی لەناوەوە دوچاری دارزان و تەنگ و چەڵەمە ببوو، بەرادەیەکی وا نەدەشیا ئارامی و ئاسایشی خۆی بپارێزێ [٢٤٠:٤٠١]. ئەوە بوو لەساڵی ١٨٧٧ هێرشیان کردە سەر عوسمانیەکان و جەنگ دایسا، ئەو جەنگەی لە مێژوودا بەجەنگی تورکی - روسی ١٨٧٧-١٨٧٨ ناسراوە. لەم جەنگەدا کورد هەمدیس لە سۆنگەی شوێنی جوگرافیەوە نەیدەتوانی بێلایەن بمێنێتەوەو بەشداری نەکا. هەر لە ساڵی "١٨٧٦"ەوە گەلێك لە سەرۆکە کوردەکان ئەوەیان بۆ روسەکان دەرخست کەوا گەرەکیانە بچنە پاڵ ئەوان. وەلێ روسەکان دەستیان بەرروویانەوەنا [٤٥:٥٣]. لەگەڵ ئەوەش مینورسکی نووسیویەتی : "لەساڵی ١٨٧٧-١٨٧٨ تیپێکی میلیشیای کورد کە لە (١٣٠٠) کەس پێکهاتبوو شەڕیان بۆ کردین، ئەگەرچی ئەو تیپە گرنگیەکی جەنگیی ئەوتۆی نەبوو، وەلێ دەربارەی رەوشتی سەربازەکان گەلێك راپۆرتی چاك لە سەرۆکەکانیانەوە نووسراوە" [٤٤:١٧٥]. بەم چەشنە کوردەکان ئەگەر بەژمارەیەکی کەمیش بووبێ هەندێکیان لەپاڵ روسەکان بوون، وەلێ زۆرینەی دژی روسەکان جەنگان، لایەنی ئاینیش رۆڵێکی کاریگەری لەم بوارەدا هەبوو. هاوکات بەشێکیش لەکورد ئەم شەڕەی بەهەلزانی و دژی دەوڵەتی عوسمانی راپەڕی. لەدەرسیم ژمارەیەك لە سەرۆکە کوردەکان راپەڕین

و بەنهێنی پەیوەندیان بە روسەکانەوە کرد کە لە ئەسکەندەرپۆل گرد ببوونەوە [٢٧:١٥٦].
ئەم بارەی کوردیش ئەوە دەگەیەنێ بزاڤی کورد لەدوای راپەرینەکەی (یەزدانشێر)ەوە تا ساڵی ١٨٨٠ وەکو گەمیەکی بێ لێخوڕ بوو لە دەریایەکی بێ کەنار، پێلەکان بە ئارەزووی خۆیان گەمەیان پێدەکرد. کوڕەکانی بەدرخان پشتی گەڕانەوەیان لەو شەڕەدا هەوڵیاندا شتێك بکەن، وەلێ زوو فریویان خواردوو کەوتنە داوەوە [١٣: ٧٣-٧٧]. تورکەکان لەو جەنگەدا باریان لەنگ و گلۆلەیان کەوتبووە لێژی. روسەکان بەماوەیەکی کەم زۆر شوێنیان لەناوچەکانی خواەرووی قەوقاز داگیر کرد. لە ١٧ مارت ئەردەهانیان گرت و لە ٣٠ نیسان ژەنراڵ (ترکوکاس) توانی بایەزید داگیر بکا [١٢٥:١٣٤]. تورکەکان زۆر شەڕی خۆ بەکوشت دانیان کرد. عوسمان پاشا هەر بۆ ئەوەی سەربازەکانی لە برسان نەمرن هێرشێکی کرد لە ئەنجامدا ٤٠ هەزار سەربازی بەدیل گیرا [٤٠١:٢٤٠]. ئەم شکستانە سوڵتانی عوسمانیان ناچار کرد داوای وەستانی جەنگ بکات. ئەوە بوو پەیمانی سان ستیڤانو گرێدرا، ئەم پەیمانە بە لەگوینێك لە بەرژەوەندی روسەکان دابوو، لەنگی خستە هاوسەنگی هێزەکان لە ئەوروپا.
بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیە کارس و ئەردەهان و ئەرزەرۆم کەوتە دەست روسەکان. کە ئەمە ئینگلیزەکانی دوچاری نیگەرانی و دڵەڕاوکێیەك کرد، ئەوەی لەروانگەی ئەوان جێگەی مەترسی بوو، ئەگەرچی زێدە ڕۆیشیان تیادا دەکرد، ئاسان بوونی گەیشتنی روسەکان بوو بە باشوری کوردستان و کەنداوی فارس * . هاوکات ئەم فراوان بوونەی روسەکان مەترسی دەخستە سەر رێگاکانی گواستنەوەی بەریتانیا چ لە میسرو چ لە کوردستان بۆ سەر هیندستان [٢١٧: ٢٩٩-٣٠٠]. ئەم هۆکارانە بوونە ئەگەری شلەژانی پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکان و نێوان زلهێزەکان بەرەو گرژی چوو. بۆیە لەسەر پێشنیاری (پسمارك)ی راوێژکاری ئەڵەمانی لە حوزەیرانی ١٨٧٨ کۆنگرەی بەرلین گرێدرا. کە ئێرانیش هەوڵیدا بەشداری ئەم کۆنگرەیە بکا. بۆ ئەم مەبەستە ناسرەدین شا، فەرمانی بە شالیاری موختاری ئێران دا لە لەندەن تا زەمینە خۆش بکا ئێران لەو کۆنگرەیەدا بەشداری بکا. کەچی هەر لە سەرەتاوە روسەکان رووێکی خۆشیان نیشان نەدا. هەرچەندە ئێرانیەکان بەنهێنی لەگەڵیاندا رێکەوتبوون و رێگەیان پێدا بوون کارە سەربازیەکانی خۆیان لە تەورێزو کرماشان ئەنجام بدەن [٦٩:٣٢٢].

---

* لەم بارەیەوە روسەکان تیورێکیان هەیە steppein stone ، گوایە هەر لەسەردەمی پەترۆسی گەورەوە (petter) سیاسەتی روسیا ئەوە بووە بگاتە پارچەیەك لە ئاوە گەرمەکان لە ناوچەی کەنداو. بۆ ئەم مەبەستەش ژمارەیەکی زۆر لە بەڵگەنامەو رووداو دەهێننەوە [٢٧:٣٣٨].

لەو كۆنگرەیەدا پەیماننامەیەك گرێدرا، بەگوێرەی بەندی (٦٠) دەبوایە دەوڵەتی عوسمانی دەست بەرداری ناوچەی قوتوری كوردستان بێت بۆ ئێرانیەكان [٣٣:٣٢٢]. هەرچی بەندی (٦١) بوو دەبوایە چاكسازی لەویلایەتە ئەرمەن نشینەكان بكرێت، هەروەها ئەرمەنەكان لە كوردو چەركەسەكان بپارێزرێت [١٣٦:١١٣]. شایەنی باسە ئەم بەندە كوردی زۆر نیگەران كرد، چونكە زۆر لەو ویلایەتانەی ئەرمەنەكان بەهی خۆیان دەزانی كورد بەزێدی رەسەنی باب و باپیرانی خۆیان دادەنا. دەڵێن كاتێ شێخ عوبێدوللا بەناوەڕۆكی ئەو بەندەی زانی، گوتی : "چی دەژنەوم ؟ واتە ئەرمەنەكان گەرەكیانە وولاتێكی سەربەخۆ لە (وان) دامەزرێنن و نەستووریەكان بەیداخی ئینگلیز بەرز بكەنەوە، من هەرگیز مۆڵەتی شتی ئیوها نادەم، ئەگەر ناچاریش بم چەك بەژنان هەڵگرم" [٢٢:٢٤]. لەم بارەیەوە جەلیلی دەڵێ : "هەرچەندە كوردەكان شوێنێكی گەورەیان لە سیاسەتی عوسمانی و بەریتانیاو روسیاو دەوڵەتانی تردا هەبوو، وەلێ نە لەرۆژانی شەڕو ناكۆكی، نە لەكات و ساتی گفتوگۆ ئاشتی خوازەكەی سان ستیڤانو، نە لە كۆنگرەی بەرلیندا دۆزی كورد بەرەو پێشەوە نەبزواو بەشێوەیەكی جیا سەیر نەكرا" [٦٠:١٣]. بارو دۆخی كوردستان دوای كۆنگرەی بەرلین، بە بەردەوامی خراوتر دەبوو، گەیشتە رادەیەكی وا گەلی كورد چیتر بەرگە نەگرێ و توانای دان بە خۆداگرتنی نەمێنێ. لەو كاتەدا وەك كونسوڵی روس لە ئەرزەڕۆم نووسی : "بڕوام وایە كوردستان بیر لەراست بوونەوە دەكاتەوەو خۆی بۆ تەیار دەكات" [٥٥:١٣]. هەر لەساڵی ١٨٧٨، باڵوێزی روسیا لە تاران ژنەوتبووی شێخ عوبێدوللا خەریكی كۆكردنەوەی هاوكارەكانیەتی بۆ جەنگ دژی توركیا. بۆ رزگاركردنی كوردستانی عوسمانی و دانانی حكومەتێكی سەربەخۆ، كە پایتەختەكەی موسڵ بێت [١٦٧:٥٠].

ئینگلیزەكان گەرەكیان بوو بەلەزی مشووری ئەوە بخۆن راپەرینەكەی كورد سەرنەگرێت، نەیاندەویست ئەو دەوڵەتەی تازە لەبەر دەستی روسەكان رزگاریان كردبوو، دوچاری ئەژواری و تەنگژەی ناوەخۆ بێت و پارچەیەكی گرنگی لێ جوێ بێتەوە. بۆیە لەهەموو لایەكەوە دوژمنانی كورد هەوڵیاندەدا رووێكی دزێو بۆ شێخ و شۆڕشەكەی چێ بكەن. بۆیە (ئابۆت) كاتێك چاوی بە شێخ كەوت، دەڵێ : "ئەو كەسە ترسناكە نەبوو كە نووسراوەكان وێنەیان كێشابوو" [٥٦:٢٧٨]. ئاشكرایە ئینگلیزەكان ئاگاداری زۆربەی ئەو نامانە بوون كە شێخ بۆ ئەم لاو ئەولای دەنارد. ئەو نامانەش بۆنی جوێ بوونەوەو دامەزراندنی دەوڵەتی كوردیان لێ دەهات. لەو نامەیەی لە ٢٢ ئەیلولی ١٨٨٠ بۆ ئیقبالودەولەی فەرمانڕەوای وورمێی نارد، ئەم راستەقینەیەی تیا دركاندبوو، شێخ بەراشكاوی نووسیبووی :

"کورد چیتر نایانەوێ و ناتوانن بەپارچە بوویی لەنێوان تورکیاو ئێران دا بژین، ئەوان ناتوانن ئەو بێ ریزیە قبوول بکەن، بۆیە بڕیاریان داوە یەکگرن و لەدەوڵەتێکدا پەرای خۆیان بکەن" [٥٩:٦١].

ئینگلیزەکان بەرایێ هەوڵیاندا هەمان ئەژواری میر بەدرخان بۆ شێخ عوبێدوللا چێ بکەن، ئەویش ئەژواری ئاسوریەکان بوو. وەلێ شێخ زیرەکانە خۆی لەو کۆسپە وەلادا. لەپاڵ ئەمەشدا هەوڵیدا دەوڵەتە گەورەکان دەرگای بەروودا بکەنەوە. بۆیە کاتێك هێزەکانی بەسەرکەوتوویی چوبوونە ناوەوەی ئێران، شێخ بە (ئابۆت)ی راگەیاند "یەك ووشە لە ئینگلیزەکان بەسە بۆ ئەوەی هێزەکانی لە ئێران بکێشێتەوە" [٥٧:٢٧٨]. هاوکات لەو نامەیەی شێخ بۆ میسینێری ئەمەریکایی لە وورمێی نارد هێوی ئەوەی دەخواست روسەکان یارمەتی بدەن. هەروەها چاوی لەوە بوو دەوڵەتە گەورەکان لە رەوشی کوردستان بکۆڵنەوەو ئاگاداری ئەو هەموو زوڵم و زۆرەبن کە لێیان کراوە [٥٩:٦٦].

لەراستیدا راپەڕینەکەی شێخ عوبێدوللا ترسێکی زۆری بۆ سەر پەیوەندی نێو دەوڵەتان هەبوو، کە لە کۆنگرەی بەرلین بڕیاری لەسەر درابوو، وخەریك بوو سەقامگیر دەبوو. روسەکان ئەگەرچی لەم کۆنگرەیەدا بڕێك لەدەست کەوتەکانی سان ستیڤانۆیان لەدەستدا، لەگەڵ ئەوەش وەکو هێزێکی لە قەوارەی خۆیان زلتر هاوسەنگە ئەورۆپاییەکەیان تا رادەیەك لەنگ کردبوو، هاوکات ئەو نزیك بوونەوەیان لە ئێران، کە لەسەر داوای ئەوان ناوچەی قوتور درا بە ئێران، جێگەی مەترسیەکی گەورە بوو بۆ بەرژەوەندیەکانی ئینگلیز لە رۆژهەلاتی ناڤین، چونکە ئێران وەکو بەربەستێك وا بوو لەنێوان بەرژەوەندیەکانی روس لەباکورو بەرژەوەندیەکانی ئینگلیز لە باشورو کەنداو. ئەمانە تەنگژەیەکی سیاسی و دەروونیان بۆ ئینگلیزەکان چێکردبوو. لەگەڵ ئەوەش سەرهەڵدانی راپەڕینێك بەم ئاستەی راپەڕینەکەی شێخ عوبێدوللا، ئەوەی لێ ڕەچاو دەکرا روسەکان خۆیان تێ هەڵقورتێنن و لە بەرژەوەندی خۆیاندا بیقۆزنەوە ! لەلایەکی تر ئەو بارەی لە کوردستان گورابوو، نە ئەوان و نەدەوڵەتی عوسمانی نەدەشیان بەهێز کپی بکەنەوە، بۆیە باشترین پێنگاو کە پەرای بەرژەوەندیەکانی ئینگلیزی دەکرد ئەوە بوو وا لە راپەڕینەکە بکەن رووەو ئێران کلپە بسێنێ. لەم بارەیەوە لازاریف جوانی بۆ چووەکانێ نووسیویەتی : "دەوڵەتی عوسمانی بەنهێنی پشتگیری ئەم هەوڵەی شێخ عوبێدوللای دەکرد، لەمەشدا نیازی ئەوەبوو تەوژمی بزاڤی کورد ئاڕاستەی ئێران بکات. سەرئێشەو ئەژواریش بۆ روسیای کۆنە دوژمنی چێ بکات" [٤٥:٥٥]. هاوکات بۆ ئەوەی

ڕیزی شۆڕشگێڕان لەیەك بترازێنن پڕوپاگەندەی ئەوەیان دەکرد گوایە سوڵتان نیازی وایە لە ئەرزەڕۆمەوە تا وان و دیاربەکر و موسڵ، هەرێمێکی تایبەتی کوردستان پێکبهێنن و عەبدوڵلا پاشای خەڵکی سلێمانی، کە داردەستی خۆیان بوو بکەنە سەرداری ئەو هەرێمە [١٣:١٣٤]. هەرچی دەربارەی هەڵوێستی ئێران بوو، ئەوا وەك لەنامەیەکی عەباس میرزادا هاتبوو، پێیان وابوو، : "مەژی ئەو شێخە لە ئاوەز لایداوەو تێکچووە، گەرەکیەتی دەسەڵاتی بکەوێتە دەست و ببێتە خودانی (کوردستانات)" ! * [٣٣١: ٣٤-٣٥].

ئەگەر ئەم دەستپێکەی شۆڕشگێڕان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە بووە سۆنگەی ئەوەی بەلەزی ناوچەیەکی فراوان ئازاد بکەن، هاوکات هۆکارێکی گرنگیش بوو بۆ ڕووخان و لەناوچوونی ڕاپەڕینەکە ! هەرچەندە ڕاپەڕینەکە مەترسیەکی وای بۆ ناسرەدین شا چێکرد، ناچار بوو بروسکە بۆ ئەسکەندەری دووەم، تەزاری ڕوس لێ بداو تکای لێ بکا بۆ پاراستن و سەلامەتی سنوورەکانی ئازربایجان چی بەپێویست دەزانێ بیکا [١٣:١٤٩] لەپاڵ ئەمەدا داوای هاریکاری لە ئینگلیز و دەوڵەتی عوسمانیش کرد، بۆیە وەك سافراستیان دەڵێ: "شێخ عوبێدوڵلا دەیتوانی تەورێزو ئازربایجانیش بن دەست بکات ئەگەر ڕێکەوتنی تورك و ئێران نەبوایە، بەهاندانی ڕوس و ئینگلیز بۆ دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەی" [٥:٤٠]. تەنانەت کار گەیشتبووە ئەوەی مەترسی ئەوەیان دەکرد پێشمەرگەکان بەرەو تاران بڕۆن ! [٢٣٥:٢٣٩]. بەم جۆرە ئینگلیزو عوسمانیەکان بەمەرامی خۆیان گەیشتن و توانیان مەترسیەکان لەخۆیان دوور بکەنەوە، لەهەمان کاتدا وابکەن ڕوسەکانیش هاریکاریان بکەن.

ڕاپەڕینەکەی شێخ عوبێدوڵلا کە لەناوەڕاستی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا ڕوویدا، بەڕوونی ململانێی نێو دەوڵەتیی و ناوچەیی لەسەر کوردستان نیشاندەدا، ئەگەرچی لەدوای ئەو زۆر هەوڵی تر درا بۆ ڕاپەڕین، وەلێ دەشێین ئێژین تا دوای جەنگی جیهانی یەکەم، هیچ ڕاپەڕینێکی تر بەو فراوانیەی شێخ عوبیدوڵلا نەهاتە ئاراوە، لەگەڵ ئەوەش ململانێ لەسەر کوردستان نەوەستا. هەر لەدوای ئەو ڕاپەڕینەش، ڕۆڵی هەندێك هێزی تر کەوتە درەوشانەوە. لەوانە ئەڵەمانەکان کە سیاسەتی کشان بەرەو ڕۆژهەڵاتیان گرتە بەر، بەم چەشنە ململانێ لەسەر کوردستان لە قۆناغێکەوە پێی نایە قۆناغێکی تر...

---

* مەبەستی لە کوردستانی گەورەیە.

# بەشی یەکەم
## کوردستان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم تا جەنگی جیهانی یەکەم

### باسی یەکەم : کوردستان و کاریگەری گۆڕانی باری ئابووری و سیاسی نێو دەوڵەتیی

گۆڕانکاری ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی لەنێو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا، لەهەموو چاخ و سەردەمێك کار لەیەکتری دەکەن. ئەو پێشوەچوونەی لە سایەی شۆڕشی پیشەسازیەوە هاتە ئارا، کار لەیەکتر کردنەکەی گەورەترو بەلەزتر کرد. جیهان بوو بە ناوچەیەکی بچووك، ململانێ لەسەر بەرژەوەندیەکان گەیشتە هەموو شوێنێك.

ناوچەی دەریای سپی بەشێوەیەکی گشتی و رۆژهەلاتی ناڤین بەتایبەتی، بووە گۆڕەپانی گرنگترین و قووڵترین ململانێی نێو دەوڵەتی. شوێنی ستراتیژی ئەو ناوچەیە بایەخێکی زیتری پێ بەخشیبوو، کە خاڵی بەیەکگەیاندنی هەرسێ کیشوەری ئاسیاو ئەفەریکاو ئەوروپا بوو، ئەلقەی بەیەکگەیاندنی رۆژهەلات و رۆژئاوا بوو [١٧٥:٢٢١]. وەك برونسنیش دەڵێ : "کوردستان، وولاتی کوردان، ناوچەیەکی ستراتیژی رۆژهەلاتی ناڤینەو گرنگترین بەشەکانی تورکیاو ئێران و عێراق و سوریا پێکدەهێنێت" [٤٧:٢٩]. بۆیە کوردستان هەمیشە بایەخێکی گەورەی هەبووە، سەرە رێگاو مەڵبەندێکی ترانزێت بووە لەنێوان دەریای رەش، قەزوین، دەریای سپی ناڤین و کەنداوی فارسدا [١٩:٥٥]. بەشێك لە بازرگانی ئەوروپی کاتێك لەرێگای بەسرەوە دەگەیشتە بەغدا، بەهۆی کاروانچیەکانەوە سنووری دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی دەبڕی، پاشان بۆ کرماشان و هەمەدان، تا دەگەیشتە تاران. لەو دەڤەرانەدا سێ رێگا ئەو دوو دەوڵەتەی بەیەکتر دەبەستەوە، رێگای ئەهواز، خانەقین، سێیەمیان رێگای هەولێرو رانیە بوو [٩٧:٥٨]. کەواتە ئەو رێگایە شادەماری رێگای ووشکانی هیندستان بوو. ئەو هیندستانەی ئینگلیزەکان هەر لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمەوە ململانێیان لەپێناو دەکردو بەگەوهەری تاجی بەریتانیای مەزنیان دادەنا. دزرائیلی وای بۆ دەچوو ئەستانە کلیلی رێگای هیندە. بۆیە لەساڵی ١٨٧٥ پشکەکانی خدێوی (ئسماعیل)ی لەکەناڵی سویس کڕی، وەك

ڕێگا خۆشکردنێك بۆ ئەوەی بەریتانیەکان دەست بەسەر ئەو کەناڵە دابگرن و بەرپەرچی هەموو باڵادەستیەکی روسەکان لە گەرووی بۆسفۆڕو دەردەنیـل بدەنـەوە [٢١٧:٢٩٦]. بـاڵا دەسـتی روسەکانیش لە گەرووەکاندا گەفی لە بەرژەوەندیـەکانی بـەریتانیا دەکـرد لـە رۆژهـەڵاتی نـاڤین بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی. چونکە روسەکان لە ئێرانیش نفوزیان زۆر بوو، و بـاڵا دەسـت بوون. بەم جۆرە کوردستان دەکەوتە نێو ئەو بازنەیەی لە دوولاوە پەنجەی روسەکان خنخنۆکەی دەگرت، لە باکورو رۆژئاواوە.

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا ئینگلیزو فەرەنگەکان، دواتـر ئینگلـیزو روسـەکان. لـە نەوەدەکانی سەدەی نۆزدەهەمیشدا ئەڵەمانەکان وەك هێزێکی نـوێ، بـە چوستیەوە هاتنـە سـەر شانۆی ململانێیەکە. ئاشکرایە دوا بەدوای شەڕی سەربەخۆیی و راگەیاندنی یـەکێتی ئەڵـەمانی لە ساڵی ١٨٧١، پێشوەچوونی زۆر گەورەو بەلـەزیان بەخۆیانـەوە بینـی، بەتایبـەتی لـە بـواری ئابووریەوە. ئەمە لە کاتێکدا سەرەتاکانی شۆڕشی پیشەسـازی لـە بـەریتانیادا سـەری هـەڵدا *. بۆیە ئینگلیزەکان لەو کاتەدا لەخەڵکی تر زێتر پێویستیان بە کەرەستەی خاو هەبوو. کەرەستەی خاوی کوردستانیش لـە مێـژ بـوو سـەرنجی راکێشـابوون. لـە سـاڵی ١٨٧١ پـرۆژەی پـاڵاوتنی پەترۆلیان لە باقوبە ئامادە کـرد، وەلـێ ئـەم پرۆژەیـە سـەرکەوتنی وەدەسـت نـەهێناو شکسـتی خوارد. لەو کاتەدا وولاتە ئەوروپاییـەکانی تریـش داوایـان پێشـکەش دەکـرد بـۆ وەبـەرهێنانی پەترۆل لە مەندەلی و گەیارەدا. هەر لەهەمان سـاڵدا پسپۆڕەکانی ئەڵـەمانیش هاتنـە ئـەو دەڤـەرە [٥٦:١٨٨].

ئەو گەشە سەندن و پێشوەچوونەی ئەڵەمانەکان وای لە سیاسـەتوانە سـەرمایەدارەکانیان کرد بـیر لـە پـەیداکردنی زەوی نـوێ بکەنـەوە. کـەچی کـاتێك لـەم دەرگایـەیاندا، ئینگلـیزو

---

* سەرەتاکانی شۆڕشی پیشەسازی لە ئینگلتەرا لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەهـەمدا بـەر لـە دەوڵەتـە ئەوروپاییەکانی تر سەری هەڵدا، زێدەبوونێکی بەرچاو لە هەموو بوارەکانی بەرهەم هێنان بەدی دەکـرا، هەتا نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم، بەرهەمە چێکراوەکـانی ئینگلـیزی هـەموو بازاڕەکـانی جیـهانی گرتبوو، لەکاتێکدا دەوڵەتە ئەوروپاییەکانی تر هێشتا لەرووی پیشەسازیەوە پێشوە نـەچوو بـوون. لـە ساڵی ١٨٧٠ ئینگلیزەکان ٢/٣ کۆی بەرهـەمی پیشەسـازی هـەموو جیـهانیان بەرهـەم دەهێنـا، بۆیـە بەکارگەی جیهان ناوزەند دەکران [١٢١:٥٥].

فەڕەنگەکان هەموو شوێنە لەبارەکانیان مونۆپۆل کردبوو، بۆیە چاویان بڕیە دەوڵەتی عوسمانی. بۆ ئەم مەبەستەش ڕێگایەکی وایان گرتە بەر پێویست بە تێچوونی سەربازی نەکات، هاوکات روو بەڕووی بەرهەڵستیەکی ئاشکرا نەبنەوە لەلایەن دەوڵەتە ئەوروپاییەکانی ترەوە [٣٨:١٤٨]. لەگەڵ ئەوەش وەك دكتۆر سەمعان پەترۆس دەڵێ: "بەلەزی پێشوەچوونی ئەڵمانەکان لەلایەك، تەنگی بوارەکانی دەرەوەی فراوان خوازی ئیمپریالیزمی لەلایەکی تر، بووە سۆنگەی روو بەڕوو بونەوەیەکی سیاسی توند لە گۆڕەپانی سیاسەتی نێو دەوڵەتیداو بەدایسانی ئاوری جەنگی جیهانی یەکەم دیماهی هات [١٥:١٨٢]. کەواتە گۆڕانە ئابووریەکان گۆڕانی سیاسی بەدواوە هات، هەردوو بوارەکەش، کاریگەری گەورەی لەسەر کوردستان هەبوو. وەك شەمزینی دەڵێ: "کوردستان وەك دەوڵەمەندترین ناوچە پەترۆلیەکانی دوو رۆژهەڵاتی ناڤین و نزیك، سەرنجی دەوڵەتە ئیمپریالیستیەکانی راکێشاو کۆنترۆڵکردنی بوو بەیەکێك لە ئامانجەکانیان. سەرەنجام کوردستان بووە گۆڕەپانی ململانێیەکی توندو تیژی نێوان ئەڵمانیاو بەریتانیاو روسیای تەزاری. بۆ بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەو فریودانی کورد، سیخوڕانی ئینگلیزو ئەڵمان روس خزانە ناو کوردستانەوەو هەریەکەیان لاف و گەزافی ئەوەی لێدەدا وولاتەکەی مافی گەلان دەسەلمێنێ و پشتیوانی لە داخوازیەکانی گەلی کورد دەکا" [٩٨:٢٨]. لە کاتێکدا هەر ئەو ململانێیە بوو، لە سی و چلەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە ببووە سۆنگەی مانەوەی چەوسێنەران و داگیرکەرانی کوردستان، واتە هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی، تەنانەت ئەو ململانێیەی روس و ئینگلیز بوو ڕێگای دابووە ئێران "کەمێك لەسەر بەخۆییەکەی خۆی بپارێزێ" [٢٧:٩٦]. روسەکان بەکامی دڵ حەزیان دەکردو هەوڵیاندەدا ئێران وەکو دەوڵەتێکی بێ هێزو لاواز بمێنێتەوە، تا دەسەڵاتیان لەم دەڤەرە بەردەوام بێت و بازاڕەکانی کوردستان بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن. ئەلڤێریێف یاریدەدەری کونسوڵی روس لە (وان) نووسیویەتی: "پێویستە بەهەموو توانایەکمانەوە بازاڕەکانی کوردستان بۆ خۆمان راکێشین و ڕێگا نەدەین بکەوێتە بن باڵ و سایەی ئەڵمانیاوە. بەم جۆرە کوردستان بۆ روسەکان واتاو گرنگیەکی تایبەتی هەبوو. بازاڕێك بوو کەل و پەلیان تیا دەفرۆشت و سەرچاوەیەکیش بوو بۆ کەرەستەی خاوی کشتوکاڵی. ئەم پەیوەندییە ئابووریەش، دەبوایە دەسەڵاتی سیاسی بەدوادا بێت کە بایەخێکی گەورەی بۆ روسیای تەزاری هەبوو لە رۆژهەڵاتی نزیکدا [٤٥:٧٢]. هەروەها کوردستان لای ئینگلیزو ئەڵمانەکانیش بایەخی خۆی هەبوو،

بۆیە هەموو ئەو لایەنانە بەردەوام زیرەڤانی یەکتریان دەکـردو لـە تەشـەنەکردنی نفـوزی یـەکتر دەسـڵەمینەوە، لـەم بارەیـەوە کونسـوڵی فـەرەنگ لـە ئـەرزەرۆم نووسـیویە : "هـەر هێنـدەی کونسوڵێکی روس سەردانی ئەم یان ئەم سـەرۆکی کـوردی بکردایـە، کونسـوڵێکی ئینگلیـزی خێرا سەردانی دەکرد، کونسوڵەکانی بەریتانیا هەمیشە وەك سایەی کونسـوڵەکانی روس بـوون و لێیان جوێ نەدەبوونەوە" [٤٥:١٥٧].

هاتنە ناوەوەی ئەڵمانەکان بۆ رۆژهەڵات و کوردستان بەتایبـەتی، بـاری ململانێیەکـەی رژدتر و ئاڵۆزتر کرد. ئەوەی هەڵزنانی ئەڵمانیای بەرەو ئـەو دەڤـەرە ئاسـانتر دەکـرد ئـەوە بـوو سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم بەو پێیەی خەلیفەی موسڵمانان بوو، پێـی وابـوو ئەڵـمانیا تاکـە هێزە هاوسۆز بێت لە وەدەست هێنانی کۆمەڵەی ئیسلامی (الجامعە الأسلامیە) کە ئەو هەوڵی بۆ دەدا و دەیویست وەکو ئامرازێك بەکاریبێنێ لەپێناو وەدیـهێنانی مەرامـە سیاسـیەکانی خـۆی. هەروەها ئەڵمانەکان هیچ پارچەیـەکیان لـەزێدی موسـڵمانان داگـیر نـەکردبوو، هاوکـات لـەو دەمـەی پـەیوەندیان لەگـەڵ گرێدابـوون، ئەڵمانـەکان نیازپـاکی خۆیـان سـەلماندبوو، سیاسەتوانەکانیان، لە پسمارکی راوێژکارەوە تـا ئیمـپراتۆر ولهـەمی دووەم، رایاندەگـەیاند کـە ئامـانجی ئـەوان بەتـەنیا ئابووریـەو هیـچ چاوتێـبڕینێکی سیاسـیان لـە دەوڵـەتی عوسمـانیدا نیـە [٩٧:١٥٩]. هەر لەساڵی (١٨٧١)ەوە سیاسـەتێکی خۆپارێزیـان گرتـە بـەر. لـەنێوان سـاڵانی ١٨٧١-١٨٩٠ گـەرەکیان بـوو ئـەو دەستکەوتانەیان بپـارێزن کـە وولاتەکـەیان لەشـەڕی (١٨٦٦-١٨٧١) وەدەستی هێنا بوو، بۆیە لەو کاتەدا لەگەڵ بیرۆکەی وەدەست هێنانی زەوی نوێـدا نـەبوون [٩:١٤٣]. لەگـەڵ ئـەوەش سـەرهەڵدانی هـێزێکی وا، هـەر دەبوایـە لەگـەڵ بەریتانیەکان روو بـەڕوو ببێتـەوە، بێگومـان ئـەم روو بەڕووبونـەوەش هـەر لـەبواری ئـابووریدا نەدەمایەوە، چونکە پێشبڕکێ لەسەر بازرگانی دەرەوە، رەنگدانەوەی لەسـەر سیاسـەتی دەرەوەی هەردوو وولاتدا هەبوو. هاوکات ئەم پێشوەچوونە ئابووریەی ئەڵـمان، دەبوایـە ئەسـتوندەیەکی دەسەلاتی سیاسیشی لەگەڵدا بێت، کە دەیکرد وەدەست هێنانی کۆلۆنیاکان، یـاخود بەلایـەنی کەمەوە ناوچەی نفوز، کە ئەمە خۆی لەخۆیدا دەبووە سەرەتایەك بـۆ ئـەوەی ئینگلیزەکـان بـالا دەسـتیان لـە جیـهاندا لەدەسـت بـدەن. ئـەو بـالا دەستیەی لـە کۆتـایی شـەڕەکانی نـاپلیۆن و سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا وەدەستیان هێنابوو [٦٧:١٨٢].

ئەو گۆڕانە ئابووری و سیاسیانە کاریگەری گرنگیان لەسەر پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکان هەبوو. بۆ وێنە شەڕی روسی - تورکی ۱۸۷۷ ململانێی روس و ئینگلیزەکانی لەسەر ناوچەکانی ئاسیای ناڤین بەلەزتر کرد. بەریتانیەکان پتر بایەخیان بەزێدەکردنی نفوزی خۆیان دا، لە کوردستان و فارس و ئەفغانستان. لە ساڵی ۱۸۷٦ جێگری پاشای هیند، لورد لیۆن (Leon) لەسەر ئەوە مکوڕ بوو کە سنوورەکانی باکوری هیند فراوان بکرێت. بۆیە دەیویست لە رۆژهەلاتی ناڤین زەوی تر داگیر بکەن، بەو ئامانجەی بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا لە نیمچە کیشوەری هیندی لە مەترسیّ روسەکان خاترجەم بکات. لە ساڵی ۱۸۷۹ دزرائیلی رایگەیاند : "ئێستا هیند سنوورێکی دیاریکراوی نیە !". هەر بۆیە ئینگلیزەکان لەنێوان سالانی (۱۸٤۹-۱۹۰۰) (۱۱۰) شەڕیان لەسەر سنوورەکانی باکوری هیندستان کرد. (٦٤) شەڕیان بەتەنیا لەنێوان سالانی (۱۸۷۰-۱۸۹۸) بوو [۱۲۱:٥٦]. "کرزن"یش پێی وابوو سنووری هیندستان لە فوراتەوەیە ! ئەمەش ئەوەی دەسەلماند کوردستان وەك دڵی رۆژهەلاتی ناڤین، هەر لایەك دەستی بەسەر دابگرتایە، دەشیا دەست بەسەر دەڤەرەکانی تریش دابگرێ. بۆیە بالا دەستی روسەکان لە کوردستان، بەتایبەتی لە رۆژهەلات و باکوری رۆژهەلاتی کوردستان، دەست وەشاندنێك بوو لە بەرژەوەندیەکانی ئینگلیز لە رۆژهەلات بەگشتی و هیندستان بەتایبەتی. چونکە وەك ئاماژەی پێکرا، دابەزینی روسەکان بەرەو ئاوە گەرمەکانی کەنداوی فارس و دەریای سپی ناڤین. لەرێگای کوردستانەوە بوو ! .

دۆڕاندنی دەوڵەتی عوسمانی لە شەڕی (۱۸۷۷) و داگیرکردنی بەشێك لە خاکەکەی لە لایەن روسەکانەوە، کە چەند دەڤەرێکی سنووری کوردستانیشی لەگەڵدا بوو، وەك بایەزید. هەروەها گرێدانی پەیماننامەی (سان ستیڤانۆ) بە ئاشکرا بووە سۆنگەی لەنگ بوونی تای تەرازووی هێزەکان لە رۆژهەلاتی ناڤین بەگشتی و ئەو دەڤەرە بەتایبەتی. چونکە سان ستیڤانۆ دەریای سپی بۆ روسەکان ئاوەلا کرد، ئەمەش مەترسی بۆ ئینگلیزەکان چێکرد لە هەلزنانی روسەکان بەرەو رێگای هیند. بۆیە بەرژەوەندیەکان روو بەرووی یەکتر بوونەوەو مەترسی دایسانی شەڕ هاتە ئارا. لەو کاتەدا ئەڵمانەکان خۆیان تیّ هەڵقورتاندو بەسەرۆکایەتی پسمارك کۆنگرەی بەرلین گرێدرا، کە بەهۆیەوە ئینگلیزەکان توانیان باری دۆڕانی عوسمانیەکان کەمێك سووکتر بکەن و روسەکان لە دەریای سپی دوور بخەنەوە [۲٦٦:۹۳]. ئەو پەیماننامەیە بەچاکسازی ئەرمەنی لە ئەناتۆلیای رۆژهەلات ناسراوە، کە روسەکان سەرباری دەریای سپی، لە

کەنداوی فارسیش دوور خرانەوە. ئینگلیزەکان دوای ئەوە دەستیان کرد بە پیادەکردنی سیاسەتی فراوان خوازی لە دەوڵەتی عوسمانی و ڕێگای هیندیشیان خستە ژێر سایەی خۆیانەوە [١٠٥:٣٣٢]. بۆیە دەتوانین کۆنگرەی بەرلین بەخاڵی وەرچەرخان دابنێین لە پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکان، وەك ئاماژەی پێکرا. سەرەتای لەیەکتر دوورکەوتنەوەی عوسمانی و ئینگلیزەکان لەم خاڵەدا دەست پێدەکات، هەروەك چۆن سەرەتایەکیشە بۆ پتەوبوونی پەیوەندی دۆستایەتی و هاریکاری لەنێوان عوسمانی و ئەڵەمانەکان. هەرچەندە پسمارك لە کۆنگرەی بەرلین رایگەیاند کە ئامانجی سەقامگیربوونی ئاسایشە لە ئەوروپا، وەلێ دوای ئەو کۆنگرەیە پەیوەندی نێوان روس و ئەڵەمانەکان تێکچوو، روسەکان چەند کارێکی نادۆستانەیان بەرامبەریان ئەنجامدا. بۆیە ئەڵەمانەکان پێشوازیان لە "دۆستایەتی" تورك کرد. ویستیان دەوڵەتی عوسمانی بەهێزبکەن تا وەکو هاوپەیمانێك دژی روسەکان بەکاریان بهێنن. ئەگەر دژی ئەوان شەڕیان راگەیاند [١٢٥: ٩٣-٩٤]. لەهەمان کاتدا پەیوەندی ئەڵەمانەکان لەگەڵ ئێرانیەکانیش بەرەو باشی دەچوو. نوێنەری پسمارك و خودی پسمارك خۆی، هیوای روودانی چاکسازیان دەربارەی ئێران نیشاندا، هاوکات پەیوەندی و نامەگۆڕینەوە لەنێوان پسمارك و ناسرەدین شا لە ئارادا بوو [٣٢:٣٢٢].

ئەو بارە نوێیەی سەری هەڵدا وایکرد ئینگلیزەکان واز لە سیاسەتی پاراستن و هێشتنەوەی دەوڵەتی عوسمانی بێنن. لەگەڵ ئەوەش خۆیان وەدوور دەگرت لە تێکەڵ بوونی هەر پرۆژەیەکی نێو دەوڵەتی بۆ نەهێشتنی دەوڵەتی عوسمانی، نەبادا ئەو کارە ببێتە سۆنگەی ئەوەی بەشە گرنگەکانی بکەوێتە دەست روسیا، کە بێگومان کوردستان بەشێکی گرنگ و پڕ بایەخ بوو بەگوێرەی روسیا. لە ئادگارەکانی سیاسەتی نوێی ئینگلیزیش ئەوە بوو لەساڵی ١٨٨٢ میسری داگیر کردو لەهەمان کاتیشدا کەوتە جەنگ دژی نفوزی دەوڵەتیی عوسمانی لە کەنداوی فارس [٢٧٤:٢٥٢]. نەوەك روسەکان لە سۆنگەی بێ هێزی عوسمانیەکان بتوانن جێ پێیەك لە کەنداودا بکەنەوە. لەبەر ئەوەی یەکێك لە ڕێگاکانی هاتنی روسەکان بۆ کەنداو ڕێگای فورات بوو، بۆیە بایەخی سیاسی و سەربازی فورات بووە بابەتێکی زۆر ترسناك، پەیوەندیەکی پتەوی نەك تەنیا بەدەوڵەتی عوسمانیەوە هەبوو، بەڵکو بە وولاتی فارس و هەموو ئەو دەڤەرانەی دەکەوێتە نێوان دەریای سپی و دەریای قەزوین و ئۆقیانووسی هیندی هەبوو[١٣٥:١٥٧]. کە ئەمەش بە ووردی شوێنی ستراتیژی کوردستان دیاریدەکا وەك چەقی ململانێیەکە، بۆیە ئەو گۆڕانانە کاریگەری ترسناکیان لەسەر کوردستان و مرۆڤی کورد

هەبوو. سەرباری گەمەی ئەو زلهێزانە، کوردستان بەشێوەیەکی راستەوخۆ لەبن دەستی هێزە ناوچەییەکاندا بوو، کە هێندە لاوازو چرووك بوون، وەك ئاماژەی پێکرا تەنیا بەرژەوەندی لایەنە رکابەرەکان سەربەخۆی هێشتبوونەوە! ئەوانە لەپاڵ دواکەوتوویی خۆیان کوردستانیان بەتەواوی پشتگوێ خستبوو، تەنیا بەسەرچاوەیەکیان دەزانی بۆ گرتنی سەربازو کۆکردنەوەی باج، زۆربەی ئەو تەنگژە ئابووریانەی دوچاری ببوون کەوتبووە ئەستۆی ئەو کشتیارانەی دوور لە سەنتەر دەژیان [٢٥٧:١٠٠]. کە ئەمەش بەشێوەیەکی سەرەکی کوردستانی دەگرتەوە.

هاوکات لەگەڵ ئەمەدا ئەڵەمانەکان جموجۆڵەکانیان گەشە پێدەدا، قۆناغی هەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەم سەرەتایەك بوو بۆ وەبەرهێنانی ئەڵەمانیا لە دەرەوە. لەو دەمەشدا داوای وەبەرهێنان لە ئەناتۆلیا لەنێو ئەڵەمانەکان بەرز دەبووەوە، بەو پێیەی بوارێکی لەبار بوو بۆ ئیمپریالیزمی ئەڵەمانی [١٠٦:١٤٩]. بۆیە نێردەکانیان کەوتنە پشکنینی کوردستان و راپۆرتیان دەربارەی بەرز دەکردەوە، لەساڵی ١٨٨٤ کاتێك کوردستان لەبن باری قات و قڕی و برسیەتی دەیناڵاند، نێردەیەکی ئەڵەمانی لە کەرکوك و دەوروبەری خەریکی توێژینەوەی جیولۆجی بوون. راپۆرتێکیان نووسی، تیایدا ئاماژەیان کرد کەرکوك دەڤەرێکی پەترۆلی گەورەیەو کێڵگە پەترۆلیەکانی لە رووی زەویەوە نزیکن [١٩٩: ٧٥-٧٦]. دەوڵەمەندی کوردستان و بوونی ئەو هەموو سامانە تیایدا، لەپاڵ شوێنە ستراتیژی و جیوپۆلەتیکیەکەی، وایکردبوو هەریەك لە لایەنە رکابەرەکان هەوڵبدات ئەوانەی تر لە کوردستان دوور بخاتەوە. ئەگەر هەرنا هەوڵی ئەوە بدات سەرەداوی بەرژەوەندیەکانی خۆی لەبن دەستی خۆیدا بێت. بۆیە بە بەردەوامی کێشەیان بۆ یەکتر دەنایەوە، گەلێك جارانیش دەیانویست هێزی تر بخەنە ناو ململانێیەکەو هاوسەنگی هێزەکانی پێ رابگرن. بۆ وێنە روس و ئینگلیزەکان کاتێك لەسەر سنوورەکانی ئاسیای ناڤین و ئەفغانستان تێکچوون، ئینگلیزەکان داوایان لە ئەڵەمانەکان کرد ناوبژیوانی بکەن. وەلێ پسمارك لەنیازی ئینگلیزەکان گەیشتبوو، دەیزانی بەرژەوەندی ئەوان لەوەدایە ناکۆکی بخەنە نێوان هێزەکان و دژی یەکتریان بەکاربێنن [١٢٦:١٥٩]. لەگەڵ ئەوەش ئەو رکابەرایەتیەی نێوان روس و ئینگلیزەکان، لەسەرەتادا یارمەتیەکی زۆری ئەڵەمانەکانیدا بۆ هاتن بەرەو رۆژهەڵات و کوردستان. لەساڵی ١٨٨٣ لەسەر داوای سوڵتان عەبدولحەمید نێردەیەکی سەربازی ئەڵەمانی بەسەرۆکایەتی ڤون گوڵتز، بۆ رێکخستنی کاروبارە سەربازیەکان هاتە دەوڵەتی عوسمانی، ئەم نێردەیەش ناوبەناو راپۆرتی دەربارەی دەوڵەتی عوسمانی دەناردە وولاتەکەی [١٧٧:٢١٣].

هاتنی ئەو نێردەیە ئینگلیزەکانی خستە مەترسیەوە، پێیان وابوو هانی دەوڵەتی عوسمانی دەدا بەرەنگاری بڕیارەکانی کۆنگرەی بەرلین بێتەوە، کە لەلایەن دەوڵەتە

ئەوروپاییەکانەوە دەرچوو بوو [١٢٥: ٩٤-٩٥]. ئەوەی زێتر مەترسی لە دڵی ئینگلیزەکان گوراند، لەو ماوەیەدا، لە تشرینی یەکەمی ١٨٨٤ نێردەیەکی تری ئەڵەمانی گەیشتە ئێرانیش کە بەو پەڕی گەرمیەوە پێشوازیان لێکرا. ناسرەدین شا رایگەیاند باوەڕی پتەوی بەوە هەیە کە پێویستە پەیوەندی لەگەڵ بەرلیندا هەبێت، هەروەها رێگای بە نێردەکەدا بەشێوەیەکی کاتی لە یەکێك لە کۆشکەکانی ئەودا بمێننەوە. لە دوو مانگی یەکەمدا نێردراوی ئەڵەمانی چەندین جار چاویان بە خودی شا کەوت [٩٥:٥٢].

لە ئەنجامی ئەم هەوڵ و کۆششانەو لەپێناو پتەوتر کردنی جێ پێی ئەڵەمانەکان لە رۆژهەڵاتی ناڤین و وەدەست هێنانی چەند جیاوکێك، لە ساڵی ١٨٨٩ تەزاری ئەڵەمانی گەشتێکی بۆ دەوڵەتی عوسمانی کرد. بە پێچەوانەی خوونەریتی رۆژهەڵاتی، خێزانەکەی خۆی لەتەك خەلیفەی موسڵمانان، سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم، سواری ئەو گالیسکەیە کرد کە بۆ تەزارو سوڵتان تەیار کرابوو [١٠٦:٢٦٦]. کە ئەمە چەند عوسمانیەکانی سەرسام کرد، زێتر بەریتانیەکانی ترساند، بگرە روسەکانیش زەندەقیان چوو. بۆیە لەهەمان ساڵدا هەوڵیاندا خۆیان لە سەرۆکە کوردەکان نزیك بکەنەوە. نیکۆلای دووەم بانگهێشتی جافەر ئاغای شکاك و عەبدولڕەزاق بەدرخان و سەید تەهای نایری کرد. زۆر دیاری پێ بەخشین و بەڵێنی هێندە خۆشی دانێ، کە گەلی کورد زێتر هانبدات بۆ وەدەست هێنانی ئامانجەکانی ! [٣٩:١٩].

هەر دوای سەردانەکەی ئیمپراتۆری ئەڵەمانی، سوڵتان عەبدولحەمید فەرمانێکی * دەرکرد. بەپێی ئەو فەرمانە دەڤەرە پەترۆلیەکانی کوردستانی خستە سەر خەزێنەی تایبەتی خۆیەوە. بۆ ئەوەی لەلایەك ببێتە موڵکی ئەو لەلایەکی تر لەدەستی دەوڵەتە ئەوروپاییەکانی تری دوور بخاتەوە [١٩٩: ٨٢-٨٣]. دوای ئەوە لە ساڵی ١٨٩٠ گولبنگیان **، کە

---

* مێژووی دەرچوونی ئەم فەرمانە بۆتە جێی مشت و مڕی مێژوونووسان. هەندێك لەو بڕوایەدان سوڵتان ئەو فەرمانەی لە ساڵی ١٨٨٨ دەرکردووە، بەشێکی تر ١٨٨٩ بەراست دەزانن. کەچی ئەو راپۆرتەی لێژنەی بازرگانی فیدراڵی سەر بە ئەنجومەنی پیرانی ئەمەریکی کە لەساڵی ١٩٥٢ دەریکرد، ساڵی ١٨٩٠ بەراست زانیوە [١٩٩: ٨٢-٨٣]. بەرای ئێمە ئەو دوو مێژووەی دوایی لەراستی نزیکترە، چونکە کاریگەری سەردانەکەی تەزاری ئەڵەمانی پێوە دیارە. ئەو فەرمانە لە ساڵی ١٨٩٨ نوێکرایەوە، واتە لەو ساڵەی ئیمپراتۆری ئەڵەمانی گەشتی دووەمی بۆ دەوڵەتی عوسمانی کرد.

** کالوست سرکیس گولبنگیان. بەوە دەناسرا شارەزاییەکی زۆری لەنهێنیەکانی دیپلۆماتیك و سیاسەتی هەندەران دا هەیە، تەنانەت بەتالێرانی پەترۆل ناوزەند دەکرا. دواتریش بەمستەر ٥٪ . رۆڵێکی

ئەندازیاریێکی زیخی بەرچەڵەك ئەرمەنی بوو، راپۆرتێکی بەنهێنی و راستەوخۆ دا بە سوڵتان عەبدولحەمید. تیایدا بەشێوەیەکی سەرنج راکێش باسی کێڵگە پەترۆلیەکانی کوردستانی دەکرد لەگەڵ چۆنیەتی سوود لێ وەرگرتن و پێشخستنی. هەروەها باسی ئەوەی دەکرد چۆن سەرمایەی گەورەی بێگانە بۆ وەبەرهێنانی بێنن ! لەم راپۆرتەدا ئەوەشی روونکردبووەوە کە ئەم پرۆژەیە قازانجێکی وای تیایە لەبن نایەت [٧٢:١٦١]. ساڵێکیش دوای ئەوە والی کرماشان کاتێك خاترجەم بوو پەترۆل لەناوچەکەیدا هەیە، پەیوەندی بەیەکێك لە لێپرسراوە فەرەنگەکان کرد بەناوی ژاك دی مورگان **Jac gues demorgan**، بۆ ئەوەی کاربکاو لەم بابەتە بتوێژێتەوە، ئەویش ساڵێك بەدوای ئەوە، واتە لە ساڵی ١٨٩٢ بڵاوی کردەوە کەوا پەترۆل لە قەسری شیرین دا هەیە [١٢:٣١٤].

ئەو گۆڕانانە بایەخی کوردستانیان زێتر کرد. بۆیە لە ساڵی (١٨٩٠)ەوە دۆزی کورد لە روانگەی بەریتانیەکانەوە پایەکی تری وەرگرت، بۆ ئەوەی وەکو چەکێك دژی روسەکان بەکاری بێنن [٧٠:١٨٠]. بێ سۆنگە نیە هەر لەهەمان ساڵیشدا دەوڵەتی عوسمانی سوارەی حەمیدی دامەزراند. کە ئەڵەمانەکان رۆڵی گەورەیان لەمەدا هەبوو، بۆ ئەوەی ئەو دەڤەرە لەژێر نفوزی عوسمانیەکان بهێڵنەوەو روس و ئینگلیزەکان نەپرژێنە سەر ئەوەی لەم رۆچنەیەوە خۆیان لە کاروباری عوسمانیەکان هەڵقورتێنن. روسەکانیش لەم بارەیەوە دریغیان نەدەکرد، لە کانونی دووەمی ١٨٩١ ژەنراڵ ئەبرۆچێت داوای لە زینۆڤێف کرد، کە سەرۆکی بەشی ئاسایش بوو لە شالیارگەی کاروباری هەندەراندا، بە ووردی ئاگای لە دۆخی ئەناتۆلیای رۆژهەڵات بێت کە زۆربەی کوردستان دەگرێتەوە. هێزەکانی لەوێ پتەو بکات و پەل و لقی سوارە پێکبهێنێ[٤٥: ١٤٦-١٤٧]. هەر دووساڵیش دوای ئەوە روسەکان رێکەوتننامەیەکیان لەگەڵ ئێرانیەکان مۆر کرد، بەپێی ئەو رێکەوتننامەیە ئێران دەستی کرد بەگوێزانەوەی دوو هەزار خێزانی کوردی جەلالی بۆ ناوچەکانی ناوەوەی ئێران [٢١٥:٣٢٤].

کوردستان بەتەنیا گۆڕەپانی ململانێی روس و ئینگلیزو ئەڵەمانەکان نەبوو، بگرە ئەمەریکاییەکانیش گەرەکیان بوو خۆیانی تێخزێنن، کوژرانی (لینتسی)یان کە میسینێرێکی ئەمەریکی بوو. لەساڵی ١٨٩٥ کردە بیانگەیەك و کونسوڵخانەیەکیان لە ئەرزەرۆم کردەوە، خۆیان تەیار کرد لە خارپوتیش یەکێکی تر بکەنەوە، هەرچەندە تورکەکان لەسەرەتا

---

گەورەی لە دانوستانەکانی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و کۆمپانیا پەترۆلیە بێگانەکان وازی کرد [٧٣:١٦١].

رووگرژیان نواند، وەلێ لە ئەنجامدا دوای ئەوەی هێزیان پێ نیشاندرا، رەزامەندی خۆیان دەربڕی [٤٥:١٦١]. شایەنی باسە لەو کاتەدا سیخوڕەکانی ئینگلیز بە ووردی لە کوردستان دەگەڕان و نەخشەی ڕێگاوبان و لایەنی تۆبۆگرافی کوردستانیان دەکێشا [٣٤٦:١٣٧]. ئەوانیش هەوڵیاندەدا وەکو ئەمەریکاییەکان کێشەی ئەرمەنەکان بقۆزنەوە. بۆیە داوایان لە روسیا کرد رازی بێت کەوا کەشتیگەلی ئینگلیزی بێتە ئەستانە، تا سوڵتان ناچار بکەن داخوازی ئەرمەنەکان جێبەجێ بکات، تەزاری روس ترسا ئەوە ببێتە سۆنگەی زێدەبوونی دەسەلاتی بەریتانیەکان لە دەوڵەتی عوسمانی، بۆیە بەهاوکاری فەڕەنگە هاوپەیمانەکانیان ئەم پێشنیارەی ئینگلیزەکانیان رەتکردەوە [٣٤٧: ٢٠٤-٢٠٥].

لەو کاتەدا کە هیچ یەکێك لە پاشاکانی ئەوروپا ئامادە نەبوو ناوی خۆی لەکەدار بکاو سەردانی سوڵتانی سوور بکات * . لەساڵی ١٨٩٨ ئیمپراتۆری ئەڵەمانی سەردانی دووەمی بۆ دەوڵەتی عوسمانی کرد. کە ئەمە بایەخێکی ئێجگار گەورەی هەبوو [١٣٢: ١٥٣-١٥٤]. جێگای ئاماژە پێکردنە تەزاری ئەڵەمان لەو کاتەدا لە سیاسەتی هەندەراندا دەستی ئاوەڵاتر بوو، چونکە ساڵێك بەر لەو کاتە (پۆلۆ) ببووە راوێژکاری ئەڵەمانیا، کە کابرایەکی مل کەچی ئەو بوو، سەرباری ئەوەی سیاسەتی دەست بەسەرداگرتنی جیهان مەژی ئەویشی داگیر کردبوو [٣٤٤:١٠٧].

ئەم رووداوانە ئەوە روون دەکاتەوە کەوا لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا لەگەڵ سەردەرهێنانی سەردەمی ئیمپریالیستی رۆڵی کوردستان لە رووی سیاسەتی جیهانیەوە تا رادەیەکی زۆر پەرەی سەند [٤٥:٩٦]. لەم پێواژۆکەدا روسەکان گەرمتر کەوتبوونە خۆ بۆ هێنانەدیی خەونە دێرینەکەیان بەکردنەوەی پێگەیەك لە کەنداوی فارس، بۆیە دەبوایە دەسەلاتیان لە کوردستان، بەتایبەتی باشوری کوردستان، کە دەکەوێتە سەر دەروازیەکی کەنداو لەناوچەی لوڕەکانەوە بچەسپێنن. لەساڵی ١٩٠٠ ئەم ئاواتەیان هاتە دی و لەنگەر گرێکیان بۆ کەشتیەکانیان لە کەنداو وەدەست هێنا. ئەم هەنگاوەی روسەکان ئینگلیزەکانی دوچاری دڵەراوکێیەك کرد. کرزن پێی وابوو ئەمە دەبێتە سۆنگەی تێکشکانی بازرگانی و لەنگ بوونی هاوسەنگی هێزەکان، لەهەمان کاتدا دەمارگیری لەنێو فەرمانڕەوایانی ناوچەکە دروست دەکرد. لەم بارەیەوە گوتی : "روس و ئینگلیزەکان لەکوێ دەجەنگن با بجەنگن،

---

* دوای کوشتاری ئەرمەن سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە ئەوروپا بە سوڵتانی سوور ناوزەند دەکرا، چونکە دەستی بەخوێنی ئەرمەنەکان سوور ببوو.

وەلیێ نابێ لەکەنداو بواری ململانێی خوێناوی بدرێ" [٢٧٥:١٠]. کەچی روسەکان مکوڕ بوون لەسەر هەوڵەکانی خۆیان، بەبێ ئەوەی بواری روو بەڕوو بوونەوەی راستەوخۆی سەربازی بدەن لەگەڵ ئینگلیزەکان. لە ساڵی ١٩٠٢ ئەفسەرێکی روسی بەناوی "سیکلۆڤنیکوف"یان لەگەڵ نێردەیەك نارده ولایەتەکانی میسۆپۆتامیا، دوای تەواو بوونی گەشتەکەی پەرتوکێکی گرنگی نووسی، کە زۆر هەواڵ و زانیاری تژی بایەخی دەربارەی باری سیاسی ئەو دەڤەرەو کەنداوی فارس بەخۆوە گرتبوو، ئەوەی روونکردبوەوە کەوا ئەو شوێنەی ئینگلیزەکان لە میسۆپۆتامیا هەیانە پەیوەندیەکی پتەو و راستەوخۆی بە کۆنترۆڵی راستەقینەیان هەیە لە کەنداوی فارس [٣٤٦:١٤١]. ئینگلیزەکانیش پێیان وابوو روسیا تەنیا بەشێکی ئێرانی گەرەك نیە، بەڵکو هەموو ئێرانی گەرەکە، وەڵێ بەلەزی ئەو کارەی ئەنجام نەداو ئەو نیازەی ئێستا ناخاتە روو [٣١٦: ٧-٨]. فەرەنگەکانیش بەهەمان جۆر تا دەهات زیتر بایەخیان بە کوردستان دەدا. کونسوڵەکانیان لە بەغدا هەوڵیاندەدا ناکۆکی لە نێوان نەستووریەکان و کاپولیکەکانی کوردستان دایسێنن، هەر لەم کاتەدا لە باخچەی فەرەنگەکان، یاخود یانەی فەرەنگەکان لە بەغدا پێشوازی گەرمی شوێنەوار ناسەکانیان دەکرد [١١٨:١٨٨]. کە بێگومان ئەمانە زۆربەیان سیخوڕو چاو ساغ بوون و لەژێر پەردەی شوێنەوارناسی خۆیان حەشار دابوو.

سەرباری مەترسی سیاسی ئەو ململانێیە لەسەر کوردستان و چارەنووسی گەلی کورد، ئەو گۆڕانکاریانە لە رووی ئابووریەوە کوردستانیان کردبوو بە بازارێکی گەورەی کاڵای بێگانە. کە ئەمە لەگەڵ ئەوەی پیشەگەریە کۆنەکەی کوردستانی لەناو دەبرد، شتێکی ئەوتۆ، بەهەمان لەزی لەناو بردنەکە جێگای نەدەگرتەوە. بۆ وێنە کاتێك مارك سایکس چووە سلێمانی بینی ئەوانەی لە پیشەسازی تفەنگ دروست کردندا کاریان دەکرد، ژمارەیان لە ١٥٠ کەس کەمتر نەبوو، وەڵێ دوای ئەو وەك ئەدمۆندز دەڵێ ئەو پیشەیە شوێنەواری نەمابوو [٦٨:٢٣٦].

فەرەنگەکان مقۆمقۆی ئەوەیان بوو ئەو لاتەریکیە بشکێنن، کە ئەڵەمانەکان هەر لە سەردەمی (پسمارك)ەوە بەسەریاندا سەپاندبوون. بۆ ئەم مەبەستە سیاسەتی خۆیان بە سیاسەتی هەندەرانی روسەکانەوە گرێدابوو، روسەکانیش مەبەستیان ئەوە بوو لە پاڵ هێنانە دی مەرامە ئیمپریالیستیەکانی خۆیان، رادەیەك بۆ زیدەبوونی نفوزی ئەڵەمانەکان دابنێن، سەرەنجامی ئەم هەموو ململانێ و بگرەو بەردەیەش لە رۆژهەڵاتی ناڤین ماڵوێرانی زیتری گەلی کوردو دادۆشینی زیتری کوردستان بوو.

ئاشکرایە کە وەك ئەنجامێکی ئەو گۆڕانە ئابوری و سیاسیانە، پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکان پێویستیان بە سەر لەنوێ رێکخستنەوە دەکرد. بۆیە ماوەی نێوان نەوەدەکانی

سەدەی نۆزدەهەم تا ساڵی ۱۹۰۲، بە ماوەی ڕێکخستنەوەی پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکان دەژمێردرێت. فەرەنگەکان لە هێنانەدی ئەم مەبەستە ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو، بەتایبەتی دوای ژێر کەوتنەکەیان بەرامبەر ئینگلیز لە فاشودە. لەهەمان کاتدا خاترجەم بوون لەوەی ئەڵەمانەکان ناوچەی (ئەلزاس و لۆرێن)* یان بۆ ناگەڕێننەوە، نەشیاندەتوانی بەتەنیا روو بەرووی ئەڵەمانەکان ببنەوە، کە گەورەترین هێزی زەمینییان هەبوو لەجیهان، یاخود بەرەو رووی ئینگلیزەکان ببنەوە، کە گەورەترین هێزی دەریاییان هەبوو لە جیهان [۹۷:۱۲٤]. بۆیە هەوڵیاندەدا خۆیان لە روسەکان نزیك بکەنەوە، کە ئەمەش دەبووە سۆنگەی بەهێزبوونی تای تەرازووی روسەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین و پێچەوانەی خواست و بەرژەوەندی ئەڵەمان و ئینگلیزەکان بوو. هەرچی روسیای تەزاری بوو، لە دوا دوایی سەدەی نۆزدەهەمدا گۆڕانێکی تەواو بەسەر سیاسەتی هەندەرانی داهاتبوو بەرامبەر ڕۆژهەڵاتی ناڤین. لە ئاسیای بچووك و بەشە ئەوروپاییەکەی تورکیا تەنیا ئەوەی گەرەك بوو ئەو مافەی هەبێت پاپۆڕە جەنگیەکانی بچنە نێو دەریای سپی و بگەڕێنەوە. بە پێچەوانەی ئەمەشەوە لە ئێران و ئەناتۆلیای ڕۆژهەڵات، لەگەڵ کاودان و هەڵوێستی ناوەوەی ئازربایجانی ئێران و کوردستان و ئەرمینیای تورکیا، ڕۆڵێکی گەورەیان لە سیاسەتی هەندەرانی روسەکاندا دەبینی و بەلایانەوە زۆر گرنگ بوو بۆ پاراستنی سنوورەکانیان [٤٥:۱۲٤]. کە لەو کاتەدا مەترسی زۆریان لەسەر بوو. لەلایەك بەهۆی کوشت و کوشتاری ئەرمەنەکان کە ناو بەناو رویدەدایەوە، لەلایەکی تر وەرگرتنی جیاوکی پەترۆلی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو لەلایەن دارسی Darcy، کە ئەمە بەشێوەیەکی راستەوخۆ گەفی لە بەرژەوەندی روسەکان دەکرد لە کوردستان و کەنداوی فارس، چونکە ئینگلیزەکان بەم کارەیان شیان بەر بەستێك لە بەردەم پێشوەچوونی روسەکان بۆ کەنداو دابنێن و ڕێگایان لەتەشەنەکردنی نفوزیان گرت لەو دەڤەرەدا [۳۱٥: ۲۰۳-۲۰٤]. سەرباری ئەمە وەرگرتنی ئەم جیاوکە رەچاوی ئەوەی لێدەکرا ئینگلیزەکان بە بیانگەی پاراستنی، بەشێوەیەکی راستەوخۆ هێزی سەربازی بێننە ئەو دەڤەرە. هاوکات دەستکەوتنی پەترۆل لە شوێنێکی وا ستراتیژی و گرنگ، بەهێزبوونی باری ئابووری ئینگلیزەکانی بەهێز دەکرد. لەگەڵ ئەوەش بنکەیەکی لەبار بوو بۆ پەلهاویشتن و فراوان خوازی لە هەموو دەڤەرەکانی ڕۆژهەڵاتی ناڤین. چونکە کەنداو وەکو کلیلێك بوو بۆ کوردستان و ئێران و میسۆپۆتامیاو هیندستان. ئینگلیزەکان دەیانتوانی لەڕێگای کوردستانەوە بەرەو سنوورەکانی روسیا هەڵزنێن. کە ئەمە

---

* دوو ناوچەی سنوورین لەنێوان ئەڵەمانیاو فەڕەنگسا. زۆر لە شەڕەکانی نێوان ئەم دوو وڵاتە لەسەر ئەو ناوچە دەوڵەمەندە بووە.

هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆی لە روسەکان دەکرد. وەك یەکێك لە مێژوونوسەکانی روس نووسیویەتی : "چاوپۆشینمان لەو جیاوکەی ئینگلیزەکان وەدەستیان هێنا - مەبەستی جیاوکی دارسی بوو - یەکەمین پێواژۆکی شکست هێنانی ئابووری و سیاسی ئێمە بوو لەسەرەتای جەنگی ژاپۆنی - روسیدا، تەنیا چەند ساڵێك کات گەرەك بوو تا حکومەتی ئێمە هەست بەم شکستە بکات" [٣١٥: ٢٠٣-٢٠٤].

بەم جۆرە ئینگلیزەکان زیرەکانە کاریان بۆ ئەوە دەکرد تا هەوساری هەموو ناوچەکە لەدەست ئەوان بێت، قاڵ بوونەوەیان لەبواری ئیمپریالیستی و سیاسەت، وایکردبوو بە ووردی باری نێو دەوڵەتی هەڵسەنگێنن و تێی بگەن. جگە لەمەترسی روسەکان، ئەوان لەنیازی پرۆژەی هێڵی ئاسنی بەرلین - بەغداش گەیشتبوون. بۆیە دەبینین دوای جیاوکی دارسی، ئەڵەمان و ئەمەریکاییەکانیش بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ هاتنە نێو گۆڕەپانی ململانێ لەسەر پەترۆلی کوردستان [٤٢:١٩٦]. بەندەکانی ئەم جیاوکە وای لە یەکێك لە نووسەرە بێلایەنەکان کرد کە بەسەیرترین جیاوکی سالوخدان بکات لەمێژووی نوێ، چونکە ئەو مۆنۆپۆلە مەزنە وایکرد بەریتانیا بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری مەزن لە ئێران و کوردستان وەدەست بێنێت. لە رووی کرداریشەوە ئەم دەڤەرە بخاتە ژێر سەرپەرشتی خۆیەوە، هەروەها ڕێگای بۆ ڕێکەوتنامەی روسی - ئینگلیزی ساڵی ١٩٠٧ خۆشکرد [٧٤:١٧١].
بەریتانیەکان بۆ پاراستنی ئەم جیاوکەو بەرژەوەندیە زیندووەکانی تریان لەم ناوچەیە، لە ساڵی ١٩٠٥ ڕێکەوتنێکیان لەگەڵ خانەکانی بەختیاری مۆرکرد. بەپێی بەندی یەکەمی ئەم ڕێکەوتنامەیە مافی چاڵ هەڵکەندن و ڕێگا کردنەوەو ڕاکێشانی بۆڕی پەترۆل لەناوچەکانی بەختیاری درا بەدارسی، کە دەبوایە بۆ ماوەی پێنج ساڵان ئەم کارانە ئەنجام بدات، هەروەها خانەکانی بەختیاریش بەڵێنیاندا داوای نرخی ئەو زەویانە نەکەن کە نەچێنرابوون، وەلێ بەگوێرەی جێگا چێنراوەکان، خاوەن جیاوك بۆی هەبوو نرخێکی ڕەواو گونجاویان بۆ دابنێ.
لەبەر ئەوەی پاراستنی بۆڕیەکانی پەترۆل خرابووە ئەستۆی بەختیاریەکان، بەپێی بەندی پێنجەم دەبوایە هەر زیانێك لە ئەنجامی کەمتەرخەمی ئەوان ڕوویدا بوایە، ئەوا کۆمپانیاکە بۆی هەبوو داوای قەرەبویان لێ بکات [٣١٥: ٢٠٩-٢١٠]. دوای ئەو دەستکەوتانە سیاسەتی بەریتانیەکان بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەو ناوچەیەدا ئەوەبوو بارەکە وەکو خۆی بمێنێتەوە و هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەیەت [٦٨:٣٠٩]. بۆیە زیرەڤانی هەموو هەڵس و کەوتەکانی

ڕکابەرەکانیان دەکرد لە کوردستان. لەم بارەیەوە شالیاری هەندەرانی بەریتانی داوای هەندێك زانیاری کرد دەربارەی دکتۆری ئەڵمانی هۆگوگرۆپ. کە لە ساڵی ١٩٠٦ وولاتەکەی جێ هێشتبوو، دوای ئەوەی زۆر شوێن لە ئاسیای ناڤین گەڕا، لە ڕێگای روهاوە (ئورفە) گەیشتە بەغدا. ماوەیەك میوانی ئیبراهیم پاشای مللی بوو [١٨٧:٩٧]. هەر هەمان دکتۆر لە تشرینی دووەمی ١٩٠٧ سەردانی کرماشانی کرد، ئەم زانایە لە رۆژهەڵاتی ناڤین کەرەستەیەکی زۆری دەربارەی دۆخی ئابووری و سەربازی کۆکردەوە، بەتایبەتی لەو دەڤەرانەی خێڵە کوردەکانی تیادا دەژیا [٤٥: ١٧٥-١٧٦]. بەگوێرەی رای کونسوڵی گشتی روسیا لە حەلەب، ئەڵمانەکان وەکو یەکەم هەنگاو دەیانویست دەسەڵاتی خۆیان بە دەوڵەتی عوسمانی بڵاوبکەنەوە، پاشان نێوان روس و تورکەکان تێکبدەن ! [٤١:٣٢٩]. ئینگلیزەکان بۆ ئەوەی پێنگاوەکانی ئەڵمانەکان چرووك بکەنەوە، بەلەزی سەردانی ئەو دەڤەرانەیان دەکرد کە ئەڵمان و روسەکات ئەسپی سیخوڕێتی خۆیان تیا تاودەدا. لەم روانگەیەشەوە (مارك سایکس)ی گەڕۆك ! خێرا خۆی گەیاندە شێخی شەمدینان، توانی ئاخاوتنەکەی لەگەڵ روسەکان تا رادەیەك چرووك پێ بکات [٤٥:١٦٨]. دوای ئەوەش خۆی گەیاندە ئیبراهیم پاشای مللی کە ئەڵمانەکان سەردانیان کردبوو [٣١:١٣٣].

چالاکی ئەورووپاییەکان لە کوردستان لەو ماوەیەدا گەیشتبووە ترۆپك و کوردستان ببوو بە مۆڵگەی سیخوڕێتی. ئەگەر سەیری پەڕتووکەکەی سۆن (گەشتێکی دەمامکدار بۆ میسۆپۆتامیا - رحلة متنكر الى ميسوپوتاميا) بکەین زۆر شتی سەیرمان بەرچاو دەکەوێت ! کە چۆن سیخوڕی ئەڵمانی و روسی و ئینگلیزی و ... هتد لە کوردستان تەراتێنیان دەکرد [١٨٠: ٣١٠-٣٢٤]. سەرباری ئەو کەسانەی وەکو سیخوڕ دەهاتنە کوردستان، کە ژمارەیان ئێجگار زۆر بوو لەبن زۆر پەردەدا کاریان دەکرد، لەوانە میسینێر، کە تەنیا میسینێرە پرۆتستانەکان لە دەوڵەتی عوسمانی ژمارەیان دەگەیشتە ٤٥٠ کەس، لەگەڵ چەند سەد کەسێك لەیاریدەدەرەکانیان [١٩٧:٩٦]. کونسوڵەکانیش، هەمان ئەرکی سیخوڕێتی‌یان ئەنجامدەدا. بۆ وێنە کونسوڵەکانی بەریتانی لەنزیك کەنداو دوو ئەرکیان هەبوو، لەلایەك راپۆرتیان بۆ نووسینگەی هەندەران دەنارد، لە لایەکی تر هەر کارێك پەیوەندی بە سیاسەتەوە هەبوایە ئەنجامیان دەداو دەبوایە بەراپۆرت بۆ حکومەتی هیندی بەرزبکەنەوە [٣٣٩:١٠٦]. هەر لەو ماوەیەشدا بوو چیستەری ئەمەریکی هاتە دەوڵەتی عوسمانی و چەند جیاوکێکی وەدەست هێنا،

هەندێك وای بۆ دەچن خودی سەرۆك رۆزفلت، سەرۆکی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەدوای ئەم کارەوە بوو، بۆ ئەوەی هەندێك مافی پێشینەی پەترۆل لە باشوری کوردستان بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن [١٩٩: ١٢٤-١٢٥]. هاوکات بۆ ئەوەی مکوڕی و راستگۆیی خۆیان بۆ تورکەکان نیشان بدەن، ٢٠ هەزار لیرەی تورکیان لە بانکی تورکی داناو کۆمپانیای عوسمانی - ئەمەریکاییان بەسەرمایەی ٦٠٠ هەزار دۆلاری ئەمەریکی دامەزراند [٣١٤: ١٨٠]. وەلێ بۆ بەختی رەشیان، چەند هەفتەیەك دوای ئەوەی چیستەر ئەو جیاوکەی وەرگرت، سوڵتان عەبدولحەمید لە ئەنجامی کودەتای تورکە لاوەکان دەسەڵاتی لەدەست دا. سەرچاوەکانی پەترۆل کە ببووە موڵکی تایبەتی سوڵتان گەڕایەوە بۆ دەوڵەت ! [٣٢٨: ٧٦-٧٧].

هاتنە ناوەوەی ئەو هێزانە وایکرد ئینگلیزەکان سەودا لەسەر هەندێك شت بکەن بۆیە بەماوەیەکی کەم بەر لەوەی پەترۆل لە (مسجد سلێمان) بدۆزرێتەوە، ئامادەیی خۆیان بۆ ئەڵەمانەکان نیشاندا کە دەستیان بەرهەڵدا بکەن لەو ناوچانەی دەکەوێتە نێوان تورکیا و باکوری بەغدا - کە دەکاتە کوردستان - بەرامبەر ئەوەی ئەڵەمانەکان دەستی ئەوان بەرهەڵدا بکەن لەو بەشەی دەکەوێتە باشوری بەغدا تا کەنداو [٢٧٥:١٧]. ئەمەش ئەنجامی ئەو گۆڕانە سیاسیانە بوو کە لە پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکان روویاندا، دوا بەدوای کودەتاکەی تورکە لاوەکان لە ساڵی ١٩٠٨. جێگای سەرنجە دوای ئەو کودەتایە شلەژانێك پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکانی گرتەوە. ئینگلیزو فەرەنگەکان جێگایان هاتە پێشەوەو ئەڵەمانەکان گەڕانەوە دواوە. روسەکانیش هەڵوێستیان بەرامبەر بە تورکەکان گۆڕا. ئەم هەڵوێستەش بەروونی لەو راپۆرتە دەردەکەوێت کە مسیۆ بۆمبارد Bombard باڵوێزی فەرەنگ لە ئەستانە لە ١٩٠٩/٧/٢٦ بۆ شالیارگەی هەندەرانی وولاتەکەی نارد. کە تیایدا باسی ئەوەی دەکرد چۆن باڵوێزی روسیا پێی راگەیاندبوو ئەرکی ئەو لە تورکیا ئەوەیە پەیوەندی نێوان روس و تورکەکان بەرەو باشی بەرێ و نیازی دۆستانەی روسەکان بۆ تورکیا روون بکاتەوە، تا متمانەو بڕوا بەیەکتر پەیوەندیەکانیان بگرێتەوە. هەروەها هەموو توانایەکی دەخاتە کار تا متمانە لای تورکەکان چێبکات، کە روسەکان هاو سۆزن لەگەڵ سیستەمە دەستوریە نوێیەکەیان [١٤٨: ٣٤٠]. ئەڵەمانەکانیش لەو کاتەدا پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت کە هیچ ئامانجێکی سیاسیان لەم دەڤەرە پەشۆکاوە نیە، تەنیا گەرەکیانە سیاسەتی دەروازەی والا سەقامگیر بێت،

بۆ ئەوەی بازرگانیەکەیان وەهەڕمێن کەویتەوە، کە لە سۆنگەی خراوی ڕێگاو بان و تاریفەی ڕوسەکان زیانێکی زۆری پێگەیشتبوو* [١٨١:١٧٩]. کەف و کوڵ و خوێن گەرمی تورکە لاوەکان بۆ گیانی نوێکردنەوەو ئازادی تەمەنی کورت بوو، زۆری نەبرد کۆنە پارێزی و شۆفینیستی جێگای گرتەوە، یەکێك لە دیاردەکانی ئەمەش کوشتاری ئەرمەنەکان بوو لە ساڵی ١٩٠٩. ڕۆژنامەکانی ئینگلیزو فەڕەنگ نارەزاییان بەرامبەر ئەو ڕووداوانە دەربڕی، کەچی ئەڵەمانەکان خۆیان لێ بێدەنگ کرد [١٥٧: ١٤٣-١٤٤]. بەم جۆرە پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکان بەرەو ڕووگەی پێشینی خۆی ڕێگای گرتەوە بەر.

ئەمەریکاییەکان دوای ئەوەی لە ڕێگای هەوڵەکانی چیستەر نەیانتوانی لە باکوری کوردستانەوە بێنە ژوورەوەی ململانێیەکەی سەر کوردستان، هەوڵیاندا لە ڕۆژهەلاتی کوردستان بەختی خۆیان تاقی بکەنەوە. لە ساڵی ١٩١١ ویستیان لە ڕێگای ناردنی نێردەکەی (مورگان چوستەر)ەوە بەرژەوەندیەکانیان دابین بکەن. چوستەر لە ئایاری ١٩١١ لەگەڵ نێردەکەی گەیشتە تاران. مافی سەرپەرشتی هەموو کاروبارێکی دارایی گرتە ئەستۆ، تەنانەت سەرپەرشتی زۆر لە دامودەزگا حکومەتیەکانی دەکرد. مافی ئەوەی هەبوو فەرمانبەر دامەزرێنێ ! چوستەر کارەکەی لەپێناو زێدەکردنی نفوزی وولاتەکەی بەکار دەهێنا. چالاکیەکانی تا رادەیەکی زۆر سنووری کارەکەیان بەزاندبوو، پەیوەندی لەگەڵ سەرۆکەکانی بەختیاری و سەرۆك هۆزەکانی ئەم ناوچەیە پەیدا کرد. بە بیانگەی کۆکردنەوەی دارایی و باج سوپایەکی دوانزە هەزار کەسی بەیەکەوە نا، هەروەها قسوریشی نەکرد لەوەی هەوڵبدا ناکۆکی بخاتە نێوان ڕوس و ئینگلیزەکانەوە [٩٤: ٥٢-٥٣]. بەم جۆرە ئەمەریکاییەکان هەوڵیاندا خۆیان لە دەڤەرە پەترۆلیەکانی کوردستان نزیك بکەنەوە، کە ئەمە لەلایەك زیانی بە بەرژەوەندیەکانی ئینگلیز دەگەیاند - ئەگەرچی ڕوسەکان پێیان وابوو، ئینگلیزەکان دەستیان لەهاتنی ئەو نێردەیەدا هەیە - [٥٦٢:٣٢٣]. لەلایەکی تر گەفی لە بەرژەوەندیەکانی ڕوس دەکرد، بۆیە بەگەرمی کەوتنە کار بۆ دوور خستنەوەی ئەو نێردەیەو لە ئەنجامیشدا سەرکەوتنیان

---

* لەو ماوەیەدا پیشەسازی ئەڵەمانەکان پێشوەچوونی زۆر بەلەزی بەخۆیەوە دەبینی. لەنێوان ساڵانی ١٨٨٨-١٩١٣، ژمارەی ئەو ئەڵەمانانەی لە بواری پیشەسازی و بازرگانیەوە کاریان دەکرد لە ٢٠ ملوێنەوە گەیشتە ٣٥ ملوێن. بەرهەمی ئاسن لە ٥ ملوێن تۆن گەیشتە ١٥ ملوێن تۆن. خەڵوز لە ٧٠ ملوێن تۆن گەیشتە ٢٠٠ ملوێن. بەشداری کردنی ئەڵەمانیا لە بارکردنی جیهانی لە ڕێژەی ٦٪ گەیشتە ١١٪، بایی بازرگانی دەرەوەی لە ٨٠٠ ملوێن دۆلار گەیشتە ٢٠٠٠ ملوێن. واتە دوو ملیار [٣٨٩:٢٤٠].

وەدەست هێنا. هەرچی فەرەنگەکان بوون، بۆ پتەوتر کردنی جێی پێی خۆیان زێتر گرنگیان بەهەوڵ و تەقەلای سیاسی دەدا، ئەوان زێتر چاویان بڕیبووە باشوری کوردستان و لەسیاسەتی ئینگلیزەکانیش بەرامبەر ئەو دەڤەرە بێزار ببوون [٣٥: ٢٨-٢٩].

باری کوردستان لەبن باری گرانی ئەم ململانێیەدا تا رادەیەکی زۆر پەشۆکا بوو، وەك لەیەکێك لە راپۆرتە بەریتانیەکاندا هاتبوو : "ناتوانین لەکاتی ئێستادا ئێژین باشوری کوردستان ناوچەی نفوزێکی دیاریکراوە. تا ئێستا ئەو پرسیارە لە ئارادایە کە ئایا دەکەوێتە بن نفوزی فەرەنگەکان لە سوریا، یاخود ئەڵمانەکان کە هەمیشە هەوڵدەدەن ڕێگایەکی بۆ بدۆزنەوە، یاخود روسەکان کە نفوزی خۆیان بۆ باکوری رۆژهەلاتی ئەو ناوچەیە فراوان دەکەن" ! [٢٢٨: ٨٩-٩٠]. بۆیە ئینگلیزەکان بۆ پارێزگاری کردنی بەرژەوەندیەکانیان و سەپاندنی دەسەلاتیان لە ناوچەکەدا، لەنیسانی ١٩١٣، زۆر بەنهێنی پرۆژەی بەیەکەوەلکاندنی کۆمپانیای پەترۆلی ئەنگلۆ – فارسی و کۆمپانیای پەترۆلی تورکیان خستە روو. دوای دانوستانێکی زۆر ئەم پرۆژەیە سەرکەوتنی وەدەست هێنا. هەردوای ئەوەش جیاوکی پەترۆلیان وەرگرت. لەکاتی دانوستانەکاندا، شالیاری هەندەرانی بەریتانیا یاداشتنامەیەکی دایە باڵوێزی تورکیا لە لەندەن، تیایدا هاتبوو : "حکومەتی خاوەن شکۆ پشت بە سوڵتانی عوسمانی دەبەستێ، بۆ ئەوەی هەموو کارێکی پێویست ئەنجامبدا بەبێ گیرۆ بوون [٣٠٠:٩]. تورکەکانیش دەیانویست ئەو بارە ئاڵۆزە بقۆزنەوە تا گەورەترین سوود وەدەست بێنن، بۆیە لەسەر چەند پەتێك گەمەیان دەکرد. لەکاتێکدا لەسەر پەترۆلی کوردستان دانوستانیان لەگەڵ ئینگلیزەکان دەکرد، هاوکات پشی پشیان بۆ ئەڵمانەکان دەکردو وەکو کارتێکی جەخت بەکاریان دەهێنان. ئەڵمانەکانیش دەیانزانی چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو پێنگاوە دیپلۆماتیکیانە بکەن، لەو کاتەدا ژەنراڵ (لیمان ڤون ساندرز) (Liman Von Sanders)یان هەڵبژارد بۆ ئەوەی سوپای تورکەکان رێکبخاتەوە، سەدان ئەفسەری تیپ و ئەفسەری ئەرکانی گشتی ئەڵمانی لەگەڵدا چوو، کاتێکیش هاوپەیمانەکان نارەزاییان بەرامبەر ئەم کارە نیشاندا تورکەکان وەرامیان دانەوە کەوا کەشتیگەلەکەیان ئەفسەری بەریتانی مەشقیان پێدەکا. ژاندارمە چەکدارەکانیشیان ئەفسەری فەرەنگسی، پەیوەندی سەربازیشیان لەگەڵ ئەڵمانەکان دەگەرێتەوە بۆ ٣٠ ساڵ لەمەو بەر [١٥٧: ١٤٧-١٤٨]. جەمال پاشا لە یاداشتەکانیدا دەربارەی هاتنی ئەو نێردەیە نووسیویەتی : "گەیشتنی ئەو نێردەیە سەرەتایەك بوو بۆ ئەوەی لەلایەن روس و فەرەنگ و ئینگلیزەوە هێرشی توندمان بکرێتە سەر. روسەکان بیانگەیان ئەوە بوو ئەگەر گەرووەکان بکەوێتە ژێر نفوزی ئەڵمانەکان لەوانەیە پتەوتری بکەن و لەمەشدا مەبەستیان روسیایە، بەهەرحاڵ واتای ئامانجێکی بەدومانی ئەو دەوڵەتەی تیایە. ئینگلیزو فەرەنگەکانیش رێچکەی روسەکانیان گرت [١٥٤: ٨٣]. لەراستیدا وەدەست هێنانی گەرووەکان بۆ ئەڵمانەکان واتایەکی گەورەی هەبوو،

دەیانتوانی بیکەن بەبنکەیەکی دەریای بۆ ئەوە هێڵە ئاسنەی وەکو مار بەناو خاکی کوردستان دەخشی و ئەستانەی لە ڕێگای کوردستان بەتاران دەبەستەوە، کە ئەمە باڵا دەستی ئەڵمانەکانی دەگەیاند لە هەموو ڕۆژهەڵاتی ناڤین. بەمەش زیانێکی گەورەی لە بەرژەوەندی هەموو لایەنە ڕکابەرەکان دەگەیاند. سۆنگەی دەسپێکی ڕوسەکانیش لەو نارەزاییە، ئەوە بوو کەل و پەلەکانی ئەوان لەرێگای کوردستانەوە دەگەیشتە ئەو دەڤەرەو بۆ بازارەکانی جیهان دەرۆیشت. مونۆپۆل کردنی ئەو گەرووانەش لەلایەن ئەڵمانەکان، کە هاوکات لەرێگای پرۆژەی هێڵی ئاسنی بەرلین – بەغدا خۆیان لە سنوورەکانی ئەوان نزیك دەکردەوە، مەترسیەکی گەورەی لێ چاوەڕوان دەکرا.

سەرباری ئەو گرژی و ئاڵۆزیە نێو دەوڵەتیەی لەسەر دەڤەرەکە هاتبووە ئارا، کاودانەکە نەدەگەیشتە ئەو رادەیەی ململانێی چەکداری جێگای ململانێی سیاسی و دیپلۆماتیکی بگرێتەوە. بەتایبەتی ئەڵمانەکان لە هێورکردنەوەی بارەکە رۆڵێکی بەرچاویان دەگێرا، چونکە ئارامی و ئاسایش زێتر لە بەرژەوەندی تەواوکردنی پرۆژە ئابوریەکانی ئەواندابوو. کە مەبەستی سیاسی و ستراتیژی زۆر گەورەیان لەپەنا حەشاردابوو. گەرەکیان نەبوو بەرژەوەندیە بنەڕەتی و سەرەکیەکانیان بکەنە گوری شتە سادەو لاوەکیەکان. ئینگلیزەکانیش لەو ماوەیەدا هەمان مەبەستی ئەڵمانەکانیان هەبوو. چونکە ئەوان کەنداوی فارس، کلیلی ناوچەکەیان لە رووی دەریاییەوە لەبەر دەست دا بوو، هاوکات کۆمپانیا پەترۆلیەکانی ئەوانیش لەکێڵگە پەترۆلیەکانی کوردستان باڵا دەست بوون. کە هەر ئەمەش بوو خەریك بوو دەبووە سۆنگەی گرژبوونەوەو تەنگژە لەنێوان کۆمپانیا پەترۆلیەکانی ئینگلیزو ئەڵمانەکان. لەو کاتەدا لایەنە رەسمیەکانی هەردوولا خۆیان تێ هەڵقورتاند. لە ١٩ مارتی ١٩١٤ لە شالیارگەی هەندەرانی بەریتانی، رێکەوتننامەیەك گرێدرا لەنێوان نوێنەری هەردوو حکومەتی بەریتانی و ئەڵمانی، هەروەها نوێنەری بانکی عوسمانی و کۆمەڵەی رویال دویچ و دارسی. بەگوێرەی ئەو رێکەوتننامەیە دەبوایە هیچ یەکێك لەو لایەنانە هەوڵی ئەوە نەدا بەتەنیا جیاوك لە پەترۆلی کوردستان وەدەست بێنێ [١٧١: ١٤٠].

جێگەی سەرنجە لە ئێرانیش نفوزی ئەڵمانەکان لە زێدەبووندا بوو. ماوەیەك بەر لەدایسانی جەنگ باڵێکی لیبراڵی لە ئێران سەری هەڵدا، داوای ئەوەیان دەکرد پێویستە هاوسەنگیەك لەنێوان زلهێزەکان لە ئێراندا هەبێت. تا بۆ ئاسانکردنی کاروباری وولات سوودی لێ وەربگرن. هەندێك لە سیاسەتوانان بۆ هێنانەدی ئەو هاوسەنگیە داوایان دەکرد پشت بە ئەڵمانەکان ببەسترێ [٢٦٤: ٢١]. هەر لەو کاتەشدا خەریك بوو گەلە کۆیەك دژی روسیا لەدایك دەبوو. چونکە رێبازی گشتی دەوڵەتە رۆژئاواییەکان لە باکوری کوردستان لەم پێواژۆکەدا، بریتی بوو لە بەرهەڵستی کردنی روسیا. پێیان وابوو روسیا بەتەنیا دەتوانێ جێ

پێی خۆی لە رۆژهەڵاتی ناڤین بکاتەوە [٤٥:٢٨٧]. لەمەشدا بەهەڵە نەچووبوون. ئەو راپۆرتانەی لە سیخوڕو چاوساغەکان بەرزدەکرانەوە، ئەوەیان دەسەلماند کەوا ئاسایشی گشتی لە کوردستان نەماوە، روسەکان لەناوچەکانی ئەرزەڕۆم و وان هانی کوردەکانیان دەدا داوای سەربەخۆی بکەن، بۆ ئەم مەبەستەش پارەیان دەدانێ [٢٢٨: ٩٣-٩٤]. لە هەموو سەیرتر ئەوە بوو کاتێك عەبدولڕەزاق بەدرخان بەهاریکاری سمکۆ لە شاری (خوی) خوێندگایەکیان بۆ زارۆکانی کورد کردەوە، بووە هەرا ! رۆژنامەکانی تورکی و ئەرمەنی هەواڵی کردنەوەی ئەو خوێندگایەیان بڵاو کردەوە. هەر یەکەشیان ئامانجەکەیان بەجۆرێك لێکدەدایەوە. تورکەکان لەوە تۆقیبوون کەوا کاریگەری روسەکان لەسەر کورد زێتر دەبێت. هەر بۆیە بەلەزی دەنگیان بەرزکردەوەو رایانگەیاند کە ئەوانیش پارە بۆ کردنەوەی خوێندگای کوردی تەرخان دەکەن. وەلێ ئەو دەڤەرە سنووریانەی کە تورکەکان بۆ خوێندگاکانیان هەڵدەبژارد، ئامانجی راستەقینەی وەدەردەخستن ! هاوکات کونسوڵی ئەڵمانەکانیش دەستی بەگەڕان کرد لە کوردستان، لایەنگری خۆی دەربڕی بۆ بەرەو پێشوەبردنی رۆشنبیری کوردان. رایگەیاند دوای ئەوەی کونسوڵخانەیەك لە وان دەکەنەوە، خوێندنگایەکیش بۆ زارۆکانی کورد دەکەنەوە [١٥٥:١٨١]. بەم چەشنە ئەڵمانەکان ئامانجەکانی خۆیان لە هاتنە ناوەوەی کوردستان لەبەرچاو دەگرت. ناکۆکی نێوان روس و ئینگلیزەکانیشیان لەم بارەیەوە دەقۆستەوە. هاوکات هەوڵیاندەدا ناکۆکی لەنێوان کورد و نەتەوە بن دەستەکانی دەوڵەتی عوسمانی بگورێنن، وەك ناکۆکی نێوان کوردو ئەرمەن، تا لەلایەك نفوزی خۆیان لە پەنایەوە زێدە بکەن، لەلایەکی تر لە شەڕەکانی داهاتوویان بەکاریان بێنن. چونکە ئەڵمانەکان نەیاندەویست سەربازەکانی خۆیان لە رۆژهەڵات بەکوشت بدەن. وەك تەزاری ئەڵمانی دەیگوت : "ئامادە نەبوو هێسکی یەك سەربازی ئەڵمانی بەهەموو دۆزی رۆژهەڵات بگۆڕێتەوە [٧٢:٢٥٩].

بەم جۆرە ئەو گۆڕانکاریە ئابوری و سیاسیانەی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا روویاندا، ململانێیان لەسەر کوردستان چڕتر کردەوە. هەوڵە دیپلۆماتیکیەکانیش نەدەشیان بەتەنیا ئەو ململانێیە رێکخەن و بەرێوەی بەرن، بۆیە ململانێیەکە شێوازێکی تری وەرگرت. ناکۆکی نێوان بەرژەوەندیەکانی ئەو هێزانە لە هەموو جیهان روو بەرووی یەکتر بووەوە. ئەوەش بووە سۆنگەی بڕینی زمانی دیپلۆماتیك و دانوستان و وەگەڕخستنی زمانی چەك. لە حوزەیرانی ١٩١٤ جەنگی جیهانی یەکەم دایسا، کوردستانیش وەك چۆن ببووە گۆڕەپانی ململانێیە سیاسی و ئابوریەکە لە رۆژهەڵاتی ناڤین. بەهەمان لەگوین بووە گۆڕەپانی بەیەکدادان و شەڕو کوشتار.

## باسی دووەم : کوردستان لە نێو بازنەی ململانێی دیپلۆماتیکی هێلی ئاسنی (بەرلین-بەغدا) دا.

شان بەشانی پێشکەوتنەکان هۆکارەکانی گواستنەوەش بەرەو پێشەوە دەچن ، داهێنانی هێڵی شەمەندەفەریش یەکێك بوو لەو ئەفراندنانەی گۆڕانێکی چلۆنایەتی بەسەر گواستنەوە داهێنا . تەنانەت لە سیەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە بۆ بەریتانیەکان ببووە مێردەزمەیەك و گەفی لە بەرژەوەندیەکانیان دەکرد !

سەرکەوتنەکانی محەمەد عەلی لە میسر و بەهێزبوونی میرنشینە کوردیەکان ، ببووە سۆنگەی زێدەبوونی نفوزی روس و فەڕەنگەکان ، کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا جێ پێی ئینگلیزەکانی لەق دەکرد . بۆیە پێشوازیان لەهیچ هۆکارێکی گواستنەوەی بەلەز نەدەکرد لە رۆژهەلاتی ناڤیندا . لەبەرئەوەش بوو هیچ زامن کردنێکیان نەدا بەو پرۆژەیەی ئەسکەندەروونەی بە قاهیرە و کەناڵی سوێس دەبەستەوە . چونکە پالمرستون پێی وابوو سەرباری لایەنە باشەکانی ئەم پرۆژەیە ، چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکرا ببێتە کێشەیەکی تژی مەترسی بۆ بەریتانیەکان [١٢٤:١٥٧] . هۆکارەکانی گواستنەوە لەپاڵ ئەرکە ئابووریەکەی ، ئەرکی سیاسی و ستراتیژی و سەربازیشی دەکەوتە ئەستۆ ، لەلایەك رۆڵی گەورەی لە هاتنە ئارای یەکێتی دەوڵەتەکان دەبینی ، وەکو یەکێتی ئیتاڵیا و ئەڵەمانیا لەلایەکی تر دەبووە بابەتی پێشبڕکێی ململانێی ئیمپریالیستی .

بەریتانیەکان هەرچەندە لە پرۆژەکانی دامەزراندنی هێڵی ئاسن دەترسان ، دوای ئاژاوەکانی ئەفغانستان و کەنداوی فارس لە ساڵی ١٨٣٧ ئارەزووی دامەزراندنی ئەو هێڵەیان پەیداکرد ، کە بە کوردستان و میسۆپۆتامیاوە تێپەڕبێ ، چونکە ئەو ئاژاوانە گەفیان لە شوێن و پایەی ئینگلیزەکان دەکرد لە هیندستان . [٢٧٦:٢١٥] . لە ساڵی ١٨٤٣ ئەلکسەندەر کابیل ، پرۆژەی هێڵی ئاسنی ئینگلتەرا – هیندی خستەروو ، بەمەرجێك ئەو هێڵە بە دۆڵی

فوراتدا بڕوات ! [٣٥٥:١٨٧] . لەگەڵ ئەوەش بەریتانیەکان بەرهەڵستی هەموو پڕۆژەیەکی هێڵی ئاسنیان دەکرد کە بەغدا بە ئەستانە* ببەستێتەوە ، چونکە پێیان وابوو هێزێك دەبەخشێتە دەوڵەتی عوسمانی و وای لێدەکا کەمتر بکەوێتە بن جەختی ئینگلیزەکان . [٩٨:٢١٦] . لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە جیاوازیەك هەبوو لە نێوان هەڵویستی حکومەتی ئینگلیزی لەگەڵ سەرمایەدارە ئینگلیزەکان، کە بەوپەڕی خوێن گەرمیەوە پڕۆژە لەدوای پڕۆژەی هێڵی ئاسنیان پێشکەش دەکرد . زۆربەی هەرە زۆری ئەو پڕۆژانەش پەیوەندیان بە کوردستانەوە هەبوو . لەساڵی ١٨٤٩ جۆن رایت پڕۆژەیەکی بۆ دامەزراندنی هێڵی ئاسن خستەروو، کە بە دۆڵی فوراتدا تێپەڕبێ . دوای سێ ساڵ هەندێك سەرەڕۆیی تر ، وەك جسنی و مەکنیل و هی تریش ، کۆمپانیای هێڵی ئاسنیان دامەزراند بۆ راکێشانی هێڵێك کە دەریای سپی بە کەنداوی فارس ببەستێتەوە . بۆ وەدیهێنانی پڕۆژەکەیان کارتی مەترسی هاتنە ناوەوەی روسەکانیان بۆ رۆژهەلاتی ناڤین بەرز کردەوە ، لەگەڵ ئەو سامانە زۆرەی لە کوردستاندا هەبوو، تا ئەو رادەیەی تورکیا و هیندیش دەیانتوانی سوودی لێ ببینن ! [٣٥٥:١٨٧] . یەکێك لە ئینگلیزەکان بە ناوی (ولیەم ئەندریو Sir Willim andrew) بایەخی پڕۆژەی هێڵی ئاسنی فوراتی لە چەند خاڵێکدا روونکردەوە . یەکێك لە خاڵەکان ئێرانیەکانی لە جەختی روسەکان رزگار دەکرد و دەیانتوانی لە رێگای دەریای سپیەوە دەروازەیەك بۆ بازرگانی لەگەڵ ئەوروپادا بکەنەوە ، هەرزانتر بێت لەو رێگا دووررو درێژەی بە دەریای رەشدا تێدەپەڕی، کە لەبن دەسەلاتی روسەکاندا بوو تێچوونیشی زۆرتر بوو . [١٢٧:٩٧] . هەر بۆ هەمان مەبەست لە ٣ حوزەیرانی ١٨٥٧ ئەندریۆ نامەیەکی بۆ پالمرستون ، سەرۆك شالیارانی ئەودەمی ئینگلیزەکان نارد ، تیایدا ئاگاداری کردەوە ئەگەر ئینگلیزەکان ئەو ئەرکە نەگرنە ئەستۆی خۆیان ، رێگای فورات دەکەوێتە بن دەستی خەڵکێکی تر . [٢٤٤:١٧٧] . لەو گفتوگۆیەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کەوا نیازی سیاسی و بەرگری روسەکان دەست بەسەرداگرتنی فورات بوو، نیازی رکابەرەکانیشی ئەوەبوو فورات نەکەوێتە دەست روسەکانەوە . لەسەر ئەم بنەمایە بایەخی هێڵی ئاسنی لەم وولاتەدا ، کە ئەنتاکیا بە کەنداوی فارس دەبەستێتەوە بایەخێکی گەورەی هەبوو . تاکە رێگا بوو بۆ تەیارکردنی سوپای پێویست لە فورات ، یاخود باشوری کوردستان ، بۆ پەلاماردانی باڵەکانی سوپای روس و رێگا

---

* ئەستەمبۆڵ

گرتن له پێشوەچوونی . چونکه ئەو پێشوەچوونەی روسەکان بەتەنیا گەفی لـە ئـێران و تورکیـا نەدەکرد ، بەڵکو مەترسی بۆ ئەو هێزەش هەبوو کە دەبوو لە کـاتی تەنگانـەدا یارمـەتی ئـەو دوو دەوڵەتە بدات ، بۆیە دەبوایە ناکۆکی لە نێوان روس و ئینگلیزەکان لەسەر ئەو دەڤەرە پـەیدابێ . لـەم ناکۆکیـە سەربازیەشـدا ، هێڵی ئاسـنی فـورات بایـەخێکی وای دەبـوو نەدەخـەمڵێنرا ، دامەزراندنی دەبووە سۆنگەی بەرەنگاربوونەوەی روسەکان لە ئاسیا . [٧٦:١٩٧] .

لەو ماوەیـەدا دوو رووداوی گرنـگ روویـاندا ئینگلیزەکانیـان هوشـیارکردەوە و وای لێکردن هۆکارەکانی گواستنەوەیان لەگەڵ هیند بە پێداویستیەك بزانن ، ئەویش شـەڕی کریـم و شۆڕشی سیپۆی Sepoy بوو لە هیند لە ساڵی ١٨٥٧، هاوکـات وای لـە ئینگلیزەکـان کـرد هەست بەوە بکەن کە پێویستە ئیمپڕاتۆریەکەیان زێتر بەهێزبکەن بەرامبـەر روسـەکان . لەگـەڵ ئەوەش، هەرچەندە سەرمایەدارە ئینگلیزەکـان زۆر بەووریاییـەوە پرۆژەکانیـان دەخسـتە روو ، حکومەت پشتگیری نەدەکردن . پالمرستون کـەوتبووە ژێـر کاریگـەری نـاپلیۆنی سـێیەم ، کـە لەبەرئەوەی (شام)ی بەناوچەی نفوزی فەرەنگـەکان دەزانـی ، نەیدەویسـت هێڵی ئاسـنی پیـادا تێپەڕ ببێت . [١٧٧:١٦٤-١٦٥] . دوای ئەوە جیسنی بـەزۆر شـێوازی تـر ویسـتی سـەرنجی حکومەتەکەی بۆ ئەم پرۆژەیە ڕاکێشی ، تا ڕازی بێت پشتگیریان بکات . رایگەیاند کە ئەگـەر ئەم پرۆژەیە ئەنجام بدرێ ئەوا لۆکـەی (الس ایلنـد) لـە دەڤـەری موسـڵ لەسـەر دەسـتی راسـام Rassam* بەلەزی بلاّودەبێتەوە ، ئەمـە سەربـاری بڕێکـی زۆر لـەگـەنـم و جـۆو بـەرهـەمی تر ، کە بۆ پیشەسازی و بازرگانی بایەخێکی زۆریان هەبوو. [٢٧٧:٢١٥] .

لەشەستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا بایەخ بە هۆکارەکـانی پـەیوەندی و گواسـتنەوە زێـتر بوو . لە حوزەیرانی ١٨٦١ ئەو هێڵە تەلەگرافەی بەغدا و ئەستانەی بەیەکدەگەیاند ئـەنجامدرا . لە ساڵی ١٨٦٤ هێڵکی تر لەبەغداوە بەرەو خانەقین کرایەوە . [١١٥:٩٧] . ئامانج لەو هێڵانە بەیەکەوە گرێدانی دەڤەرەکانی رۆژهەلاّتی ناڤین بوو ، هێڵی تەلەگراف کـە لـە ئەسـتانەوە بـەرەو بەغدا دەچوو دەبوایە بە کوردستان تێپەڕێت ، واتە ئامەد (دیاربـەکر) و ئـەوجا موسـڵ و دواتـر بەغدا . هەروەها لەبەغداوە بەرەو خانەقین ، پاشان کرماشان و هەمەدان و دواتـر بـەرەو تـاران . ئەمە ئەوە دەردەخات کە هیـچ هۆکارێکی گواستنەوە لە رۆژهەلاّتی ناڤین بەئەنجام نەدەگەیشت ، ئەگەر بەسەر خاکی کوردستان تێپەر نەبوایە !

---

* هەمان راسام بوو کە ئینگلیزەکان بەکاریان هێنا بۆ فریودانی یەزدانشێر .

ئەم کاودانە نێو دەوڵەتیەی هاتە ئارا ، ئینگلیزەکانی ناچارکرد ئـاوڕ لـە پڕۆژەی هێڵی ئاسنی فورات بدەنەوە . لە ساڵی ١٨٧٠ پەرلەمانی ئینگلیزی بایەخێکی مەزنی بەم پڕۆژەیە دا ، بۆ ئەم کارەش لیژنەیەکی هەڵبژێردراویان تەرخان کرد . [٧٢:١٣١] . لە راستیدا ئەگـەر ئـەو پڕۆژەیە لەو کاتەدا ئەنجام بدرایە ، ئەو دەڤەرەی دەبوژاندەوە ، بایـەخی پێشووی دەگـەڕاندەوە کە دوای کرانەوەی کەناڵی سوێس لە دەستی دابوو ، چونکە لەگەڵ کرانەوەی کـەناڵی سـوێس ، ئامەد و موسڵ و حەلەب زۆر لە ئادگارەکانی خۆیان لە دەستدا ، بەو پێیەی رێگای ووشکانی بـاکور بـوون بـەرەو رۆژهـەڵات [٤٥:١٨٠]. سـەرمایەدارە ئینگلیزەکـان گـەرەکیان بـوو بەهەرجۆرێك بێت ئەم پڕۆژەیە ئەنجام بدەن . پاساودانیشیان لەهەموو قۆناغەکاندا هەریـەك بـوو ، ئەگـەرچـی شێـوازی داڕشتنـەکـەی گـۆڕانـی بـەسەردا دەهـات . ئـەوان تـەنیا دەوڵـەتی عوسمانیان بە دەروازەیـەك نـەدەزانی بۆ هاتنـە نـاوەوەی کوردسـتان ، بـەڵکو وولاتـی فارسـیش دەروازەیەکی دیکەی رۆژهەلاتی کوردستان بوو .

ئـەو پڕۆژانـە ئەگـەرچی سیمایەکی ئابووریـان هـەبوو ، وەڵـی لـە ئامـانجی سیاسـی و ستراتیژی وەدوور نەبوون . بۆیە هەرچەندە لەلایەن سـەرمایەدارەکانەوە دەخرانـەروو ، دەبـووە جێگای مشت و مڕو ململانێی دەوڵەتەکان و ئەوان خۆیـان تێهـەڵدەقورتاند. بـۆ وێنـە کـاتێك رۆیتەر لەساڵی ١٨٧١ هەندێك جیاوکی لە ئـێران وەدەسـت هێنـا ، کـە پـڕۆژەی دامـەزراندنی هێڵی شەمەندەفەریشی تیابوو ، ئێران ناچاربوو لەبن جەختی روسەکان ئەم جیاوکە رەتبکاتەوە . تەنانەت حکومەتی بەریتاینا خۆشی بـەم جیاوکـە رازی نـەبوو . واتکـین Watkin بەڕێوەبـەری کۆمپانیـای باشوری رۆژهـەڵاتی ئینگلیزی لـە ١٤ مـارتی ١٨٧١ نامەیـەکی بـۆ شـالیاری هەندەرانی بەریتانی لورد کرانڤیل Lord Cranville نارد ، تیایدا داوای روونکردنـەوەی کـرد دەربارەی پرۆژەی دامەزراندنی هێڵی ئاسنی ئێران ، بەو پێیـەی ئـامرازێك بـوو بۆ پارێزگـاری کردنی بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا لە هیند . هەروەها پرسـیاری کـرد کـە ئایـا ئەگـەر پڕۆژەکـە قبووڵ کرا ، بەریتانیا ئامادەیە خۆی تێهەڵقورتێنی و پشتگیری بکا ؟ کرانڤیل بەکورتی وەرامی دایەوە کەوا پێویستە لەم بارەیەوە رای خۆی لەگەڵ شالیاری کاروباری هیندستان بگۆڕێتەوە . هاوکـات گوێـی بـۆ بـالوێزی بـەریتانی لـەتاران رادێـرێ ! [٩٢:٢١٧-٢١٨]. دەربـارەی جیاوکەکەی رۆیتـەریش کرانڤیـل گوتـی : "لـە کـاتێکدا حکومـەتی بـەریتانیا بەخۆشـحاڵیەوە هـەواڵی ئـەو هـەنگاوە پۆزەتیڤانـەی رۆیتـەر دەژنـەوێ ، دەربـارەی راکێشانی هێڵـی ئاسـنی و

وەبەرهێنانی کەرەستەی سروشتی لە ئێران ، وەڵی بەشێوەیەکی ڕەسمی خۆی لە پارێزگاری کردن و پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەم کۆمپانیایە هەڵناقورتێنی لەم جیاوکەدا" [٩٢: ٢٢١] .

دوای نوشوستی هێنانی پرۆژەی هێڵی ئاسنی فورات، کامیرون Commander L. Cameron لەساڵی ١٨٨٠ پرۆژەی هێڵی ئاسنی هیندستان - دەریای سپی ناڤینی پێشکەش کرد . بەگوێرەی ئەم پرۆژەیە هێڵی شەمەندەفەرەکە لە کەنارەکانی تەرابلوس لە شام دەستی پێدەکردو بەرەو باکوری ڕۆژهەڵات تا حەلەب و دوای ئەویش روها و مێردین ، پاشان رووەو باشوری ڕۆژهەڵات لەگەڵ کەناری ڕۆژئاوای دیجلە دەڕۆیشت تا دەگەیشتە موسڵ ، لەوێوە بۆ بەغدا و پاشان بۆ کوت ، لێرەوە بەرەو ڕۆژهەڵات وەردەچەرخایەوە تا مەندەلی و پاشان بەرەو ئەهواز دەچوو [١٧٧: ٢٤٥] . بەم جۆرە تا ساڵانی ١٨٨٠ بە پلەی یەکەم سەرمایەدارە بەریتانیەکان بایەخیان بە پرۆژەکانی هێڵی ئاسنی دەدا لە کوردستان و سەرجەم ڕۆژهەڵاتی ناڤین. دوای ئەوە بەرژەوەندی فەڕەنگەکانیش سەریان دەرهێنا و بایەخیان بەم بوارە دا . ئەم بایەخدانەش ئینگلیزەکانی ترساند و بە گەفێکی ڕاستەوخۆیانزانی بۆ سەر بەرژەوەندیەکانیان . چونکە کەناڵی (سوێس)یش لەدەست فەڕەنگەکان بوو ، لەگەڵ ئەو پرۆژەی هێڵی ئاسنە ، واتای دەست بەسەرداگرتنی ڕێگای هیندستان بوو ، بۆیە بەهەموو شێوەیەك هەوڵیاندا پلانی فەڕەنگەکان چرووك بکەنەوە . [٢٤١: ٢١-٢٢] . هەر ساڵێك دوای ئەوەش ئەڵەمانەکان هاتنە گۆڕەپانی ئەم ململانێیەوە . بۆ ئەم مەبەستەش چەند کەسێکیان هاتنە دەوڵەتی عوسمانی و بەنهێنی لەگەڵ لێپرسراوان کۆبونەوە . تورکەکان خۆشیان ئارەزوویان دەکرد دەستی ئەڵەمانەکان بۆ ئەو دەڤەرە رابکێشن ، ئەوان سەرنجی ئەڵەمانەکانیان بۆ پرۆژەی هێڵی ئاسنی لەو ناوچەیەدا ڕاکێشا . دوای ئەوەی ئەوانە گەڕانەوە وولاتەکەیان پەیوەندیان بە دکتۆر ستراوسپورگ کرد و پرۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدایان خستە بەرگوێی . ئەویش بەنهێنی پەیوەندی بەخاوەن بانك و سەرمایەدارە ئەڵەمانەکان کرد و پێشنیاری ئەم پرۆژەیەی بۆ کردن . وەڵی ئەوان بەساردیەوە بەرەو پیلی چوون ، چونکە جیاوکەکە (زەوی)دانی لەگەڵ نەبوو، هەروەها پارێزگاری پێویست بۆ کار و کرێکارەکان نەبوو ، لەپاڵ ئەمەشدا بازاڕەکانی روسیایان بە لەبارتر و باشتر دەزانی . [١٢٥: ٩٦] . ئەمە بووە سۆنگەی ئەوەی ئەم هەوڵە سەرنەگرێ . بۆیە تا ساڵی ١٨٨٧ پرۆژەی هێڵی ئاسنی لەبەردەستی ئینگلیز و فەڕەنگەکاندا مایەوە . وەڵی دوای ئەوە ئەڵەمانەکان جیاوکی دامەزراندنی هێڵی ئاسنی سکتور و ئەزمیریان وەدەست هێنا ، کە درێژیەکەی (٩١کم) بوو . [٩٧: ١٥٢] . هەمان ڕێکەوتن مافی ئەوەی پێ بەخشین ڕێگای

ئەستانە و ئەزمیر بۆ ماوەی ٩٩ ساڵ بەکاربهێنن ، بۆ ئەم مەبەستەش کۆمپانیای ئـەناتۆلیا کـە بـۆ وەبەرهێنانی ئەم پڕۆژەیە دامەزرابوو ، کۆمپانیای هێڵی ئاسنی بەغدای دامـەزراند . ئـەو هێڵـەی واچاوەڕوان دەکرا بەدرێژایی ئەناتۆلیا بڕواو ئـەوروپا بەکـەنداوی فـارس ببەسـتێتەوە . درێـژی هێڵی ئەو پڕۆژە نوێیە ٤٥٠٠کم بوو ، هێڵە سەرەکیـەکەی درێژی ٢٧٠٠کم بوو، لقەکانیشی ١٨٠٠کم . [٩٩:١٧٩] . بەم جۆرە ئەو هێڵە هەموو موڵکەکانی دەوڵـەتی عوسمـانی دەبـڕی و دەڤەرەکانی بەیـەکتر دەبەستەوە ، لە سنوورەکانی نەمسا و مەجەر لە باشوری ڕۆژهەلاتی ئـەوروپا ، تا کەنارەکانی کەنداوی فارس و باشوری ڕۆژئاوای ئاسـیا ، هـەروەها ئەستانەشـی دەبـڕی کـە دڵی ژیانی بازرگانی بوو لە نێوان دەریای ڕەش و کەنارەکانی دەریای سپی ناڤین ، کە شـوێنێك بوو لە گرنگترین شوێنە جەنگیەکان لە جیهان . ئەو هێڵە بە سوریا و میسۆپۆتامیا و کوردستان و ئەناتۆلیادا ڕەتدەبوو ، لەگەڵ نیـمچە دورگەی سینا کە دەکەوتە کەنارەکانی کەناڵی سـوێس ، بەم جۆرە بەشێکی زۆر لە وولاتە عەرەبەکانیشـی دەگرتـەوە . [٦٦:١٩٧] . ئینگلیزەکـان لـەم پێنگاوانـەی ئەڵەمانـەکان سـەنگرینەوەو بەشێوەیەکی پڕەنسیپی دژی وەستان . بۆیـە کـاتێك دکتۆر ستراوسپۆرگ لە دەوڵەتی عوسمانی خەریکی هەوڵدان بوو بـۆ وەدیـهێنانی ئـەم جیاوکـە ، ئینگلیزەکان پڕوپاگەندەیان دەکرد کە ئەو کابرایە کەسێکی قەللۆشەو لـە بـەرژەوەندی تورکیـا و بازرگانی بەشێوەیەکی گشتیدا نییە ئەم کارە گەورەیە بدرێتە ئەم جۆرە کەسە ! [٩٦:١٢٥] . وەلێ وەك ئامـاژەی پێکـرا ، تورکـەکان بـۆ بەرابـەری کردنـی ئینگلیزەکـان و روسـە کۆنـە دوژمنەکانیان ، خۆیان دەستی ئەڵەمانەکانیان بۆ ئەو دەڤەرە ڕادەکێشا . بۆ ئەم مەبەسـتە سـوڵتان عەبدولحەمید نێردەیەکی بەسەرۆکایەتی ڕاوێژکارەکەی خۆی (عەلی نـەزمی) نـاردە بـەرلین . لـە ڕواڵەتدا وایان خستەڕوو کاری ئـەو نێردەیـە ئەوەیـە مـەدالیای (نیشـانی ئیمتیـاز – Nishan Imtiaz) ببەخشێتە ئیمپڕاتۆری ئەڵەمانی ، وەلێ لەبنەوە دەیانویسـت سـەرمایەدارە ئەڵەمانـەکان ڕازی بکەن کۆمپانیایـەك دابمەزرێنن بۆ ڕاکێشانی هێڵی ئاسنی بەغدا . پێیان ڕاگـەیاندن ئەگـەر کۆمپانیاکە ئەڵەمانی بێت سوڵتان ئامادەیە بەدرێژایی هێڵەکە زەوی باشـیان پێبەخشـێت ، کـە لە سکوتاریاوە دەستی پێدەکرد تا دەگەیشتە بـەغدا . [٩٧:١٢٥] . بـەم جـۆرە لـە ١٦ مـارتی ١٨٨٩ کۆمپانیای عوسمـانی بـۆ هێڵـی ئاسـنی ئـەناتۆلیا دامـەزرا Ottoman Company Of Anatolian Rail Way ، کە یـەکەم کۆمپانیـای ئەڵـەمانی بـوو مـافی جێبـەجێکردنی پـڕۆژەی هێڵی ئاسنی لە دەوڵەتی عوسمانی پێدرا [١٥٤:٩٧] . ئەڵەمانەکان بەهەمان لەگوین لـە ئـێرانیش لە کاردابوون بۆ وەدیهێنانی بەرژەوەندیەکانیان . ئەو بارە تایبەتیەی لەو ماوەیـەدا ئـێران پێیـدا

تێدەپەڕی ، ڕێگای بۆ هاتنە ناوەوەی بەرژەوەندی ئەڵەمانەکان سووك و ئاسانکرد .
ئێرانیەکانیش وەکو عوسمانیەکان گیرۆدەی دەستی ململانێی روس و ئینگلیزەکان بوون، ئەوانیش چاویان بڕیبووە هێزێکی تر بێتە گۆڕەپانەکەو گۆڕانێك، ئەگەر کەمیش بێت بەسەر باری سیاسیان دابهێنێت . بۆیە سەرهەڵدان و ڕچەگرتنەکەی ئەڵەمانیا بۆ ڕۆژهەڵات بۆ ئەوانیش هەلێکی لەبارو گونجاو بوو ، ئەوانیش شوێن پێی تورکە دوژمنەکانیان هەڵگرت .
سەرۆك شالیارانی ئێران (ئەتابك ئەعزەم) لە ساڵی ۱۸۸۹ پێشنیاری بەرلینی کرد ئەگەر قەرزێك بدەنە ئێران ، ئەوا ئێران جیاوکی ڕاکێشانی هێڵی ئاسنیان دەداتێ لە تارانەوە تا سنوورەکانی دەوڵەتی عوسمانی [٩٤: ٤٤] . کە بەشێکی زۆری ئەو هێڵە لەسەر خاکی کوردستان دەبوو ، چونکە ئەڵەمانەکان گەرەکیان بوو ڕۆچنەیەك بۆ خۆیان لەسەر کەنداوی فارس بدۆزنەوە ، هەروەها دەریای سپی بە کەنداوی فارس و لەم سەریشەوە بە دەریای قەزوێن ببەستنەوە ، کە ئەمەش واتای دەست بەسەرداگرتنێکی تەواوی خاکی کوردستان بوو ، هاوکات کۆنتڕۆڵکردنی هەموو ڕۆژهەڵاتی ناڤین بوو ! ئەڵەمانەکان وەك رودلف کلن (١٨٦٤-١٩٢٢) ، کە یەکەم کەس بوو سنووری ئەوسای ئیمپڕاتۆریای ئەڵەمانی دیاریکردووە ، پێی وابوو "سنووری ئیمپڕاتۆریای ئەڵەمانی لە ڕۆژئاواوە پێویستە لەسەر بەندەری دەنکرکی فەڕەنگسی لەسەر کەناڵی ئینگلیزی دەست پێبکات و بگاتە شاری (ڕێگای) پایتەختی کۆماری لاتڤیا لەسەر دەریای باڵتیك لە ڕۆژهەڵات و بەندەری هامبۆرگی ئەڵەمانی لە باکورەوە ، لە باشووریش تا شاری بەغدا" [٥٦: ٢١-٢٢] . بەم چەشنە کوردستان دەکەوتە چوارچێوەی ئەو ئیمپڕاتۆریا مەزنەی لە مەژی ئەڵەمانەکاندا بوو . بۆ هێنانە دی ئەو خەونانەیان ، سەرباری کەنداوی فارس ، دەبوو شوێن پێی خۆیان لە بۆسفۆریش بکەنەوە ، بۆ ئەم مەبەستەش چەند پێنگاوێکیان هەڵێنا ، کە بووە سۆنگەی بەرزبونەوەی ململانێ لەسەر ڕۆژهەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی – کە دەکاتە کوردستان – لەنێو دەوڵەتە ئەوروپاییەکاندا . بۆیە روسەکان کەوتنە منجە منج و ناڕەزایی دەربڕین . ڕایانگەیاند کە ڕاکێشانی هێڵی ئاسنی لە ئەناتۆلیاوە بۆ سوریا لەگەڵ خواستەکانی ئەواندا ناگونجێت کە گەرەکیان بوو لە ڕێگای کوردستانەوە بگەنە ئەسکەندەروونە ، ئەو ڕێگایەی وایدەکرد کالای روسی بەدرێژایی ساڵ بگاتە ئاوە گەرمەکان .
[٦٣: ١٠٨] . لەبەر ئەم هۆیانە ، واتە لەبەر هۆی سیاسی و ئابووری و ستراتیژی ، روسەکان هەرلەسەرەتاوە دژی هێڵی ئاسنی بەرلین -بەغدا بوون و بەرهەڵستیان کرد . ڕاکێشانی هێڵەکە بۆ دەڤەرەکانی قەوقاز ، هەروەها گەیشتنی هێڵەکە بەدەڤەری خانەقین ، بوارێکی تری بۆ

ڕکابەری بازرگانی روسی دەکردەوە لە ئێران و ئەفغانستان . لەهەمان کاتدا سوود وەرگرتن لەسامانی پەترۆلی باشوری کوردستان ، کاریگەری هەبوو لەسەر ئەو سامانەی روسەکان لەو دەڤەرە دەستیان دەکەوت . وەلێ لەگەڵ ئەوەش هۆی راستەقینەی بەرهەڵستی روسەکان بۆ ئەم هێڵە سیاسی و ستراتیژی بوو . [١٨٢:١٤٠] . ئەم هەولانەی ئەڵمانەکان وای لە باڵوێزی روسیا لە تاران کرد پەیوەندی بە حکومەتی شاوە بکات و بەڵێنی ئەوەی لێوەرگرێ کە بۆماوەی پێنج ساڵ هەرێی هیچ جیاوکێك نەداتە کەس، واتە لە ساڵی ١٨٨٩ بەدواوە . هەر لەهەمان ساڵدا بانکی روسیان لە تاران کردەوە . رۆژنامەکانیشیان پەیتا پەیتا ئاماژەیان بۆ پرۆژەی ئەو هێڵە ئاسنە دەکرد کە روسەکان نیازیان وابوو لە تارانەوە تا سەر کەنداوی فارس رایبکێشن ، وەلێ حکومەتی روس خۆی هانی ئەم جۆرە پرۆژانەی نەدەدا . [٥٨:١٢١] . ئەوەی وای لە روسەکان دەکرد زێتر لە پرۆژەی هێڵی شەمەندەفەری ئەڵمانەکان بسەنگرێنەوە ، وای بۆ دەچوون ئەو هێڵە ئاسنینەی کوردستان و سنوورەکانی قەوقاز ، یارمەتی تورکەکان دەدات بەلەزی هێزەکانیان بگوازنەوە ئەو دەڤەرانە . تەنانەت روسەکان سۆنگەی سەرکەوتنی خۆیان لەشەڕی ١٨٧٧ بۆ ئەوە دەگەڕاندەوە کە تورکەکان نەیانتوانی تیپەکانی پێنج و شەشی بەغدا و دیمەشق بگوازنەوە دەڤەرەکانی شەڕ ، هەرچەندە هەوڵیاندا لە ڕێگای رۆیشتنی خێراوە بگەنە ئەو ئامانجەیان ، وەلێ ئەو هێزانە نەیانتوانی رۆڵێکی کاریگەر ببینن و نەیەڵن شاری کارس بکەوێتە دەست روسەکانەوە . [٢٤١:١٢٠-١٢١] .

هەرچی ئینگلیزەکان بوون ، وەك ئاماژەی پێکرا ، لە ناخەوە دژی ئەو پرۆژەیە بوون و ئامانجی ئەڵمانەکانیان لەلا روون بوو ، لەگەڵ ئەوەش لەم پێواژۆکەدا بەرهەڵستی خۆیان بەئاشکرا دەرنەدەبڕی ، بەڵکو پێنگاو بەپێنگاو زێرەڤانیان دەکرد . خاترجەم بوون لەوەی جێبەجێکردنی پرۆژەیەکی وا زل پێویستی بە کاتێکی زۆر هەیە ، بۆیە لە جیاتی رووترش کردن و خۆگیف کردنەوە ، جێ پێی خۆیان لەو دەڤەرانەدا پتەودەکرد کەوەکو پشتێنەیەك وابوو بۆ ئەو شوێنانەی ئەڵمانەکان چالاکیەکانی خۆیان تیا ئەنجام دەدا . ئەوان لەو کاتەدا زێدەبوونی نفوزی روسەکانیان بە مەترسیدارتر دادەنا ، چونکە روسەکان وەکو سەنگ و دەوڵەت هاوسێی کوردستان و ئەو دەڤەرانە بوون کە بەرژەوەندی راستەقینەی ئینگلیزەکانی تیادابوو ، بۆیە کاتێك روسەکان لە ساڵی ١٨٨٩ بانکی روسیایان لە تاران کردەوە ، ئینگلیزەکان بەسەرمایەی ئینگلیزی بانکی شاهانەیان لەتاران دامەزراند . [٩٤:٤٤] . هاوکات کە باسی پرۆژەی هێڵی ئاسنی روسەکان دەکرا لە تارانەوە تا خانەقین لە کوردستان ، کرزن

حکومەتی لەندەنی لە مەترسی ئەو پرۆژەیە ئاگادارکردەوە ، بەو پێیەی هەڕەشەی لە بازرگانی بەریتانیا دەکرد لەو دەڤەرەدا ، ئەمە سەرباری ئەوەی نفوزی روسەکانی دەگەیاندە سەر کەنداوی فارس . [٥٩:١٢١] .

لەگەڵ گرنگیدان بە پرۆژەی هێڵی ئاسنی ، گرنگیدان بە پەترۆڵی کوردستان لە زێدەبووندا بوو . بۆیە ئەڵەمانەکان هەوڵیاندا لەگەڵ پرۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدا ، جیاوکی پەترۆڵی کوردستان وەدەست بێنن ، بەم چەشنە لە رێگای بانکی ئەڵەمانیەوە، لە ساڵی ١٨٩٠ توانیان جیاوکی پەترۆل وەدەست بێنن ، لەگەڵ مافی کانزاکاری لە ٢٠کم لەم بەرو ئەوبەر بەدرێژایی هێڵە ئاسنەکە . [٥٩:٢٣١] . وەڵێ لەسۆنگەی ئەوەی بەپێی فەرمانێکی سوڵتانی دەڤەرە پەترۆلیەکانی کوردستان خرابوونە سەر خەزێنەی تایبەتی سوڵتان ، تەنگژەو ئەژواری بۆ ئەنجامدانی ئەم جیاوکە دەهاتە چێکرن ، لەگەڵ ئەوەش دەتوانین ئەمە بە لێدانی زەنگی بایەخدان بە پەترۆلی کوردستان لەقەڵەم بدەین ، کە دواتر کاریگەری زۆری لەسەر ئایندەی کورد و کوردستان هەبوو، بۆیە هەندێك لە مێژوونووسان ساڵی (١٨٩٠)یان ، واتە ئەو ساڵەی جیاوکی پەترۆلی تیا وەرگیرا بە سەرەتایەك دادەنێن لە مێژووی جیاوکەکانی پەترۆل لە کوردستان، ئەگەر چی هیچ پێنگاوێکی کرداریش لەم بارەیەوە نەنرا بۆ سوود وەرگرتن لە پەترۆلەکە[٥٢:١٩٠]. ئەم جیاوکە مەترسیەکی راستەوخۆی خستە سەر بەرژەوەندی ئینگلیزەکان بۆیە ئەمجارەیان بەئاشکرا بەرهەڵستیان کرد ! لە کۆتایی کانونی یەکەمی ١٨٩٢ باڵوێزی بەریتانیا لە ئەستانە کلافورد SIR CLARFORD رایگەیاند: کە باشتر وایە هیچ پێنگاوێگ بۆ بڕیاری دیماهی جیاوکی هێڵی ئاسنی بەغدا نەنرێت، تا رای حکومەتی بەریتانیاش لەم بارەیەوە وەرنەگیرێ. گەفی ئەوەی کرد کە دانی ئەم جیاوکە راستەوخۆ دەبێتە سۆنگەی وروژاندنی رای گشتی بەریتانی لە لەندەن دژی تورکیا. لە ٦ کانونی دووەمی ١٨٩٣ هەواڵی ئەو گەفەی باڵوێزی بەریتانیا گەیشتە بەرلین و دەست بەجێ هەرایەکی توندی گوراند. باڵوێزی بەریتانیان لە بەرلین گاز کرد، پێیان راگەیاند کە ئەو ناڕەزاییەی کلارفورد داویە بە سولتان عەبدولحەمید کارێکە هیچ هاورێیەتیەکی ئەڵەمانەکانی رەچاو نەکردووە. هەروەها پێیان راگەیاند داوای بەریتانیەکان بۆ رەتکردنەوەی ئەم جیاوکە سوکایەتی کردنە بە خودی تەزاری ئەڵەمانیا ! [٤١ ٢:٣٤-٣٦]. ئەڵەمانەکان لە پاڵ ئەوەی خەریکی ئەم دمگۆیە دیپلۆماتیکیە

بوون، کەمتەرخەمیان نەدەکردو بە گورجی کارەکانی خۆیان ئەنجام دەدا. لە ساڵی ١٨٩٣ کاری ڕاکێشانی هێڵی ئاسنی ئەنقەرەیان تەواو کرد. لە کوردستان دەست بەکارکرا بۆ گەیاندنی هێڵەکە لە ڕێگای سیواس و ئامەدەوە بۆ بەغدا. وەلێ ڕوسەکان بە توندی بەگژ ئەم کارەدا چوونەوە، بەو بیانگەی هێڵەکە نزیك سنوورەکانی قەوقازە. [١٣٩:١٥٧]. ئەم ئاڵۆزییە وایکرد ئەڵمانەکان واز لە بیرۆکەی گەیاندنی هێڵەکە بۆ ئامەد بهێنن، ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بێت، هەر بۆیە کاری کۆمپانیاکە بۆ دوو ساڵان وەستا. [١٨٨:٦٣]. دوای ئەو مشتومڕە ئینگلیزەکان نەیانویست هەڵوێستیان لەگەڵ ئەڵمانەکان گرژتر بێت، لە بری ئەوە کەوتنە کار بۆ ئەوەی نفوزی خۆیان لەو ناوچانە زێتر بکەن کە هێڵەکەی تیادا دیماهی دەهات، واتە لە بەسرە. بۆیە بازرگانی بەسرەیان خستە بن کۆنترۆڵی خۆیان، لە ساڵی ١٨٩٥ ئەو کاڵا بەریتانیانەی دەهاتنە بەسرە، ٣٥ جۆر بوو، هەمووی بایی ١/٣٩٩/٤٦٥ پاوەنی ئیستەرلینی بوو. [٢٢٨:٤٥]. هەروەها دەست پێشخەری بەریتانیەکان لە(کوێت)یش، کە دەکەوێتە سەر کەنداو، بەردەوام لە زێدەبوون دابوو، هەموو توانایەکیان خستبووەگەڕ بۆ وروژاندنی میری کوێت.[١١٩:١٩٧]. لەکاتێکدا لەو دەڤەرە جێی پێی خۆیان دەچەسپاند، لە سنوورەکانی باکوری کوردستان لە هەموو ئەو چاکسازیانە پەژیوان دەبوونەوە کە بڕیار بوو بە گوێرەی بەندەکانی پەیماننامەی بەرلین جێبەجێ بکرێن. بگرە کاتێکیش لە کوردستان ئاژاوە پەیدابوو، تورکەکان قەڵاچۆکردنی ئەرمەنەکانیان دەست پێکرد. ئینگلیزەکان هەڵوێستێکی یەکلایی کەرەوەیان نەبوو، سەیر لەوەدایە لە کاتێکدا ئینگلیزەکان داوای هێوربوونەوەیان لە ئەرمەنەکان دەکرد، تورکەکان زۆر بە ڕێکخراوی بە لێدانی کەڕەنای دەستیان بە کوشتنی ئەرمەنەکان کردو بە هەمان شێوەش دیماهیان پێ هێنا*. نەك ئینگلیزەکان، بگرە ئەڵمان و

---

* یەکێك لە گەڕیدە ئینگلیزەکان بەشێوەیەکی زۆر نزیك لە ڕووداوەکان باسی کوشتاری ئەرمەنەکان لە ئەرزەڕۆم دەگێڕێتەوەو دەڵێ: بەر لەوەی کوشتارەکە دەست پێ بکات ئافرەتی تورك بە تورەگەی خاڵیەوە خۆیان دەئاخنیە ناو شار بۆ تاڵانکردنی گەڕەکە ئەرمەنەکان، بە لێدانی کەڕەنای دەستکرا بە کوشتاری ئەرمەنەکان، دوای چوار پێنج کاتژمێر، هەمدیس بە لێدانی کەڕەنای دیماهی بە کوشتارەکە هێنرا [٣٤٦:١٥٧].

تورکەکانیش واتێدەگەیشتن روسەکان دەستیان لە هاندان و وروژاندنی ئەرمەنەکان دا هەبوو، لەو کاتەدا لەیەك نزیك بوونەوەی تورك و ئەڵمانەکانیش لەسەر گۆڕەپانی نێو دەوڵەتیدا، وای لە ئەڵمانەکان دەکرد بایەخ بە پاراستن و سەلامەتی دەولەتی عوسمانی بدەن. بۆ سوود وەرگرتن لە توانا ئابووریە گەورەکەی، ئەمەش لە رێگای جیاوکی هێڵی ئاسنی بەغدا، بۆیە لایەنگری هەڵوێستی ئەرمەنەکان نەبوون. [١١٣:١٣٧]. کەواتە دەتوانین بڵێین کوشتاری ئەرمەن کەم یا زۆر پەیوەندی بە هێڵی ئاسنی بەغداوە هەبوو. چونکە ئەرمەنەکان ئەو ڕەگەزە بوون کە لە دەڤەرە سنووریەکانی روسیا دەژیان و دەتوانرا لەکاتی پێویست سوودیان لێ وەربگیرێ. بۆیە وەك نووسەرە ئەڵمانەکان بانگەشەیان بۆ دەکرد، دەبوایە ئەو دەڤەرانە لە ئەرمەنەکان چۆڵ بکرێت و لە میسۆپۆتامیا پەرتەوازە بکرێن، تا لەلایەك بە کشتوکاڵەوە خەریك بن لەلایەکی تر لە پڕۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدا کاریان پێ بکەن. لەهەمان کاتدا ئەرمەنستان لە نفوزی روسیا پاك بکەنەوە. [١١٣:٢٧٤]. لە پێناو لابردنی ئەو مەترسیەش دەستیان کرد بە هاندانی تورکەکان بۆ قەڵاچۆکردنی ئەرمەنەکان . تورکەکانیش ئەو هەلەیان قۆستەوە و نیازەکانی خۆیان هێنایەدی ، کە ئەمە کاریگەریەکی گەورەی لەسەر کورد و مێژووی کورد هەبوو ، چونکە بەشێك لە کارەکان بە سوارەی حەمیدی ئەنجامدرا ، کە لەپاڵ عەرەب و چەرکەس و نەتەوەکانی تر ، کوردیش رۆڵی خۆی تیا دەگێرا . بۆیە بەهەمان چەشن دەتوانین بڵێین ، دامەزراندنی سوارەی حەمیدی ، لەپاڵ گۆڕانە سیاسی و ئابوریەکانی تر ، تا رادەیەك پەیوەندیی بە پڕۆژەی هێڵی ئاسنی بەرلین - بەغداشەوە هەیە .

وەك ئاماژەی پێکرا ، لە ساڵی ١٨٩٨ ئیمپراتۆری ئەڵمانی سەردانی دووەمی بۆ دەوڵەتی عوسمانی کرد. رایگەیاند کە ئەڵمانیا لەپشت سوڵتان و هەموو موسڵمانانە . هەر ئەم سەردانە رێگای خۆشکرد بۆ وەدەست هێنانی جیاوکی هێڵی ئاسنی بەغدا ، کە هێڵەکە چەند دەڤەرێکی ئەناتۆلیای دەبڕی و پاشان دەگەیشتە موسڵ و دواتریش بۆ بەغدا ، لقێکشی لێدەبوەوە دەریای سپی بەکەنداوی فارس دەبەستەوە [٧٦:١٥٠]. سەیر لەوەدایە ئەمجارەیان ئینگلیزەکان خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی و بەگەرمی پێشوازی پڕۆژەکەیان کرد ! سالزبوری رایگەیاند کە بەریتانیا پێشوازی لەم جیاوکانە دەکات ، چونکە دەبێتە ئەگەری ئەوەی ئەڵمانیا لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی ئەواندا لەکەنداو لەیەك ریز بوەستێ . لەم بارەیەوە

ڕۆژنامەی تایمز نووسی : "مادامەکونێ پرۆژەی هێڵی ئاسنی نەکەوتە دەست بەریتانیا بۆ ئێمە واباشترە لەدەست ئەڵمانەکاندا بێت ، نەك دەوڵەتێکی تر". تەنیا نمایندەی شالیارگەی هەندەران رووی راستەقینەی هەڵوێستی بەریتانیای دەربڕی کاتێك گوتی : "بەریتانیا مکوڕە لەسەر ئەوەی پارێزگاری باری ئێستا بکا لە کەنداوی فارس" [١٤:١٥٧]. هۆی راستەقینەی ئەم دوو روویی و هەڵوێست لاوازیەی بەریتانیا ئەوەبوو لەو کاتەدا لە باشوری ئەفەریکا خەریکی شەڕی بۆیر* بوون و نەیاندەویست بەرەیەکی تریش لە رۆژهەلات بکەنەوە.

ئەگەر سەیری شوێن و رێگای ئەو هێڵە ئاسنینانە بکەین، بۆمان روون دەبێتەوە هۆکاری سەرەکی ئەو ململانێیە، سامان و شوێنی ستراتیژی کوردستان بووە، واتە لە بەغداوە بۆ بەسرە، ئامانج تیایدا تەنیا ئەوەبوو کەرەستەی خاوی کوردستان لە رێگای کەنداوەوە بنێردرێتە دەرەوە، بەتایبەتیش پەترۆڵەکەی. یاخود لەوێوە هێز بۆ ناوەوەی کوردستان بێنن، کە وەك لە باسەکانی تر ئاماژەی پێکرا بنکەیەکی لەباربوو بۆ دەست بەسەرداگرتنی هەموو رۆژهەلاتی ناڤین. یەکێك لە مەبەستەکانی تری ئەو هێلانە بەهێزکردنی دەسەلاتە ناوەندیەکان بوو، ئەمەش واتای لێدان و بێ هێزکردنی بزاڤە رزگاریخوازیەکەی کوردی دەگەیاند. ئەگەرچی لەلایەکی ترەوە، لە رووی رۆشنبیری و شارستانیەوە دەبووە سۆنگەی پێشوەبردنی کوردستان. ئەمە جگە لە مەبەستە ئابوریە سەرەکیەکەی کە کێڵگە پەترۆلیەکانی کوردستان بوو. لەبەر ئەم هۆکارانە بوو، کوردستان ببووە چەقی تۆڕی ئەو هێڵەی کە ببووە جێی ململانێی دیپلۆماتیکی و ئابووری نێو دەوڵەتی. لە رێگای کوردستانەوە هەموو دەروازە دەریاییەکانی رۆژهەلاتی ناڤین بە یەکتر دەبەسترانەوە. هەموو لایەنەکانی ململانێیەکەش هەوڵیاندەدا ئەم رووەی هێڵەکان ڤەشێرن و بە پڕۆژەیەکی ئابووری ئاسایی بخەنە بەرچاو. بۆیە لە سەرەتای دانوستانەکانی

---

*دوای ئەوەی ئینگلیزەکان نەیانتوانی بنە هاوپەیمانی ئەڵمانەکان، هەوڵیاندا لە سێ رێگاوە لە بەرژەوەندی ئەڵمانەکان بدەن. لەلایەك رێگا نەدەن پڕۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدا تەواوبکەن، لەلایەکی تر هەردوو کۆماری بۆیر لە باشوری ئەفەریکا لەناوبەرن، هاوکات رێگا نەدەن کەشتیگەلی دەریاییان پەرەپێبدەن، بۆ هێنانەدی مەبەستی دووەمیان بلاویانکردەوە کەوا پەیوەندیەکی ترسناك لە نێوان بۆیر و ئەڵمانەکاندا هەیە. ئەمەشیان کردە بیانگەیەك بۆ لێدان و لەناوبردنی هەردوو کۆماری بۆیر و لەساڵی ١٨٩٩ ئەم ئاواتەیان هێنایە دی. [٢١٧:٣٤٣-٣٤٤].

١٨٩٨-١٨٩٩ دكتۆر ڤون سیمون لەوە نیگەران بوو، و ناڕەزایی دەربڕی کە باڵوێزی ئەڵمانی دەیویست ئەم پڕۆژەیە بە سەرکەوتنێکی دیپلۆماتیکی و بازرگانی لە قەڵەم بدات. بەهەمان چەشن هاوکارەکانیشی لە هەوڵەکانی حکومەتی ئەڵمانیا دڵگران بوون، کە گەرەکیان بوو حسێوی زێتر بۆ لایەنی ستراتیژی پڕۆژەکە بکرێت. نەك لایەنە ئابووریەکەی، ئەگەرچی لە ئەڵمانیا و لە ئەوروپاش بیروباوەڕێکی وا هەبوو، کەوا نووسینگەی هەندەرانی ئیمپریالیزمی پڕۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدای بەڕێوە دەبرد [٣٤٠:١٢٠-١٢١]. هەرچی دەربارەی هەڵوێستی فەڕەنگەکان بوو، وەك حکومەت پشتگیری ئەو پڕۆژەیانَ نەدەکرد، وەڵێ سەرمایەدارەکان مگێزیان لێبوو بەشداری بکەن. کەچی حکومەتی ئینگلیزی هاتبووە سەر ئەو رایەی پێویستە بەشداری لەو پڕۆژەیە بکا. عوسمانیەکان لە نیاز و ئامانجی ئینگلیزەکان دەترسان. وای بۆ دەچوون گەرەکیانە لە رووی ووشکانیەوە میسر بە هیندستان ببەستنەوە، بە دووریان نەدەزانی ئینگلیزەکان دەست بەسەر هەموو ئەو دەڤەرانەدا بگرن کە دەکەوێتە نێوان ئەم دوو شوێنەوە. لە لایەکی تر ئەوان خۆشیان گەرەکیان بوو، وەك ئاماژەی پێکرا، ئەڵمانەکان بێننە نێو ئەو ململانێیەوە. تا بیانکەن بە کۆسپێك و ڕێگا لەبەردەم چاوتێبڕینی ئینگلیزەکان لەم دەڤەرەدا بگرن. [١٨٢:١٣٧-١٣٨]. ئینگلیزەکانیش لەوە دەترسان ئەڵمانەکان دەست بەسەر ئەو دەڤەرەدا بگرن. بە تایبەتیش تا دەهات پڕۆژەی هێڵی ئاسنی بەرلین-بەغدا شێوازێکی رەسمی بەخۆوە دەگرت، بۆیە دەبینین لەو ماوەیە بەدواوە بەرهەڵستی بەرامبەر پڕۆژەکە دەنوێنن. بەرایی دەیانگوت نابێت لە بەسرەوە زێتر بچێت، پاشان گوتیان نابێ لە بەغدا هەورازتر بچێت. لەراستیدا بەریتانیەکان ئەو هێڵەیان "بەسەرە نیزەیەك دەزانی ئاراستەی هیندی بەریتانی کرابێت" [٢١٧:٣٤٩]. بەتایبەتیش دوای سەردانەکەی دووەمی ئیمپراتۆری ئەڵمانی بۆ دەوڵەتی عوسمانی، لێژنەیەکی ئەڵمانی هاتە ئەو دەڤەرە بۆ ئەوەی لەو ڕێگاو بانانە بکۆڵێتەوە کە هێڵەکەی پیادا تێدەپەڕێ و راپۆرتیان لە بارەیەوە بنووسێ. هاوکات لەگەڵ ئەوەدا یەکێك لە پاپۆرە جەنگیەکانی ئەڵمان لە کەنداو سەری دەرهێنا. کە ئەمە وایکرد بەریتانیەکان زێتر گومان لە پڕۆژەکە پەیدا بکەن. بۆیە کاتێك دیپلۆماتەکانی تورك و ئەڵمان کۆدەبونەوە، شالیارگەی بەریتانیاو حکومەتی هیندی بەو پەڕی بایەخەوە زێرەڤانیان دەکردن [١٨٨:٦٣]. تا دەهاتیش سیاسەتی بەریتانیەکان بەرامبەر عوسمانیەکان توندوتیژتر دەبوو، وەڵێ هەڵوێستی روسەکان کارەکەی ئاڵۆزتر کردبوو، لە تشرینی یەکەمی ١٨٩٩ شالیاری هەندەرانی

عوسمانیەکان بە باڵوێزی بەریتانیا لە ئەستانەی ڕاگەیاند، ڕوسەکان هەوڵدەدەن لە کەنارەکانی ڕۆژهەلاتی کەنداوی فارس، کە بەشێکی لوڕستانی کوردستان دەگرێتەوە، لەنگەرگرێك وەدەست بێنن، وەکو خاڵێکی کۆتایی بۆ هێڵی ئاسنی ڕوسی! هەر لەو کاتەش کەشتیەکی جەنگی ڕوسی بەناوی (گیلاکی) هاتە کەنداو و لە بەندەری کوێت ئۆقرەی گرت، کە باڵوێزی ڕوسی لە بەغدای تیابوو لەگەڵ شێخی کوێت کەوتە گفتوگۆ. [١٢١:٦٠]. ئەم هەڵوێستەی ڕوسەکان وایکرد ئینگلیزەکان هەرچەندە ئەڵەمانیایان بە مەترسیەکی تازە گوراو دەزانی، چاوێکی تر بە هەڵوێستی ڕوسەکان بخشێننەوە.

کەواتە لەم پێواژۆکەدا لەدوو لاوە گەف لە بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا دەکرا لە ڕۆژهەلاتی ناڤین. لەلایەك ڕوس و لەلایەکی تر ئەڵەمانەکان. ئەم بارە وایکرد کرزن ووتارێکی تژی کەف و کوڵیداو تیایدا پرسی: "ئایا ئێمە ئامادەین دەست بەرداری سەروەرێتیمان بین لە کەنداوی فارس، یاخود سەروەرێتیمان لە ئۆقیانوسی هیندی لەگەڵ خەڵکی تر دابەش بکەین؟ ئایا ئێمە ئامادەین هێڵی ئاسن بە دۆڵی فوراتدا تێپەڕێت؟ یاخود پڕۆژەی لەم چەشنە کە ئەستەنگە بۆ بەریتانیەکان؟ ئایا بەغدا دەبێتە شارێکی نوێ بۆ ڕوسەکان لە باشور؟ ئایا ئێمە ڕازی دەبین بنکەیەکی دەریایی بێگانە چەند ڕۆژێك لە کراچیەوە دوور بێت؟" [١٣٦:١٥٧]. ئینگلیزەکان بۆ ئەوەی ئەو مەترسیانە دوور بخەنەوە، هەوڵیاندا لە ئەڵەمانەکان بچنە پێش. بۆ ئەم مەبەستەش شالیاری هەندەرانی بەریتانیا بە باڵوێزی ئەڵەمانیای لە لەندەن ڕاگەیاند کە : "ئەوان بە چاوێکی نا دۆستانە سەیری پڕۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدایان نەکردووە، وەڵێ ئەگەر جێبەجێ کردنی ئەو پڕۆژەیە پێویستی بە پاڵپشتی و هەوڵی خێرخوازانەی ئەوان هەبێت، دەبێ چاوەڕوانی ئەوە بن پشکێکیان لەم پڕۆژەیە دەست کەوێ! کە یەکسان بێت لەگەڵ ئەوپشکەی بەر دەوڵەتانی تر کەوتووە" [٩٧:١٦٦]. ئینگلیزەکان بۆ کەمکردنەوەی مەترسی ڕوسەکان دوو ڕێگایان گرتەبەر، یەکیان ڕێکەوتن بوو لەگەڵ میری کوێت، و ئەوەی تریان ڕێکەوتن بوو لەگەڵ عوسمانی و ئەڵەمانەکان. سەرباری ئەوەی بەهۆی ئەو ڕێکەوتنانەوە کۆنترۆڵی دەروازەی کەنداویان کرد، بەم لەیەکگەیشتنە سێ قۆڵیە دابینکردنێکی نێودەوڵەتیشیان وەدەستهێنا [١٧٧:٢٥٤]. بەرامبەر ئەو هەوڵانەی ئینگلیز، ڕوسەکانیش چالاکانە کەوتنە کار بۆ پاراستنی سنوورەکانیان لە مەترسی هێڵی ئاسنی بەغدا، زینوڤیێڤ باڵوێزی ڕوسەکان نارەزاییەکی دا بە عوسمانیەکان، تێپەڕبوونی هێڵی ئاسنی بە ناوچەکانی باکوری ئەرمەنستان بە گەفێك دەژمارد لە سەلامەتی ڕوسیا. [١١٨:٢٤١]. دوای ئەوە نزیك

بوونەوەیەك لەنێوان روس و عوسمانیەكانیش سەری هەڵدا، دواتر گەیشتنە رێكەوتننامەیـەك كـە بەرێكەوتننامـەی نزمایـەكانی دەریـای رەش (**حوض البحر الاسود**) ناسـرا. لـەم بارەیـەوە شالیارگەی هەندەرانی عوسمانی لە١٩٠٠/٣/٣١ نووسـراوێكی دا بـە بـاڵوێزی روسـیا، تیـایدا هەرێی بە روسەكان دا كە جیاوكی هێڵی ئاسن لەلایەكانی دەریای رەش ناداتە هیچ دەوڵـەتێكی ئەوروپی، لەو دەڤەرانـەی دەكـەونە باكوری رۆژهەڵاتی ئەو هێڵەی لە نێوان ئەرگـەلی، ئەنقـەرە، قەیسەری، سیواس، خارپوت، وان، درێژ دەبێتەوە. ئەو هێڵە یا بەخۆی دایدەمـەزرێنێ، یـاخود جیاوكەكەی دەداتە كۆمپانیا روسەكان. [١٦١:٤٥-٢٦]. لەهـەمان كـاتدا روسـەكان توانیـان مافی تەنیا بوون لە جیاوكی هێڵی ئاسنی لە دەڤەرەكانی دەریـای رەش بـەرەو ئـێران وەربگـرن. لەدەقی جیاوكەكە هاتبوو كە ئەم كارە جگە لە روسەكان نـاشێ كـەسـی تـر ئـەنجامـی بـدا. تـەنانـەت توركەكان خۆشـیان، ئەگـەر روسـەكان نـەیانتوانی ئـەنجامی بـدەن. [٢٤١:٥٥]. لـە راستیدا ئەم پڕۆژانە زێتر كارێكی تیوری و دیپلۆماتیكی و سیاسی بوون، چونكە روسـەكان لـە سۆنگەی نالەباری بـاری ئابووریـەوە نـەیاندەتوانی ئـەم جـۆرە كارانـە جێبـەجێ بكـەن. ئامـانجی سەرەكیشیان لەمەدا ئەوەبوو كوردستان لە نفوزی ئەڵەمانەكان وەدوور گـرن. لەلایـەكی تریـش كۆسپ و تەگەرە بخەنە بەردەم پـڕۆژەی هێڵـی ئاسـنی بـەغدا. ئەڵەمانـەكانیش بەهـەمان لـەگوێن گەرەكیان بوو دەستی روسەكان لەم دەڤەرە دوورخەنەوە، بۆیە كاریان بۆ ئەوە دەكرد لەلای تـر ئەژواریان بۆ چێ بكەن. لە ساڵی ١٩٠١ هـەوڵیاندا لـە رۆژهـەڵاتی دوور، لەسـەر دەڤـەرەكانی مەنشوریـاو كۆریـا، روسەكان لەگەڵ ژاپۆن تووشی شەڕ بكەن! [١٢٤:١٠٠]. ئـەو سیاسـەتەی ئەڵەمانەكان لەو پێواژۆكەدا لەگەڵ سیاسەتی ئینگلیزەكان رێك و كۆك بوو. فەڕەنگەكانیش كە روسەكانیان بە دوژمنی ئەڵەمانەكان دەزانـی بـەردەوام لێیـان نزیـك دەبوونـەوە. ئـەوانیش دژی پڕۆژەی دامەزراندنی هێڵی ئاسنی بەغدا بـوون، بۆیـە كـاتێك لـە ٥ی مـارتی ١٩٠٢ جیـاوكی كۆتایی دامەزراندنی هێڵەكـە لـە نێـوان ئەڵـەمانیا و توركـەكان مۆركـرا، ئـەندامێكی پەرلـەمانی فەڕەنگسی بە راشكاوی هێرشی بردەسەر ئەم پڕۆژەیەو ئەوەی دركاند كەوا ئەو پڕۆژەیـە گـەف لە پلەو پایەی فەڕەنگەكان دەكات لە رۆژهەڵاتی ناڤین، هەروەها گەفیش لەخاترجەمی روسـەكان دەكات لەناوچەی قەوقاز [٢٤١:٩٧]. هەرچی ئەڵەمانەكان بوون، بە خۆشـحاڵیـەوە پێشـوازی ئـەو پێنگاوەیـان كـرد، لەبـەر ئـەوەی ئامـەدو خـارپوت و هـەندێك لەناوچـەكانی تـری لێ هەڵاوێردرابوو، پێیان وابـوو بەرهەڵستی روسـەكان نـاوروژێنێ، لەگـەڵ ئـەوەش دەیـانزانی لـە سۆنگەی گەیشتنی بە كەنداو ئینگلیزو فەڕەنگەكان بەرهەڵستی زێتری دەكەن [٢٧٢:٦١]. لـە

راستیدا کارکردن بۆ وەدەستهێنانی ئەم جیاوکە بە شێوەیەکی ئێجگار نهێنی ئەنجام دەدرا. بۆیە کاتێك هەواڵی وەرگیرانی راگەیەنرا ئەوروپای دوچاری سەرسامیەك کرد، لەو کاتـەوە پـڕۆژەی هێڵی ئاسنی بووە جێ چاوی هێزە جیهانیەکان بەشێوەیەکی سەرنج راکێشتر. دەبوایە لە سالی ١٩٠٣ دەست بەکاربکرێت بۆ ئـەنجامدانی پـڕۆژەی هێڵـی ئاسـنی بـەغدا. [٣٣٢:١٠٧]. کـە دەبووە سۆنگەی ئەوەی ئەڵەمانەکان خودان پەیڤ بن لە کوردستان و هەموو رۆژهـەڵاتی نـاڤین، چونکە کاتێك لایەنی سیاسی و ستراتیژیان مسۆگەر دەکرد، کلیلی ئابووری ئەو ناوچەیەشیان دەکەوتە دەسـت، کـە ئەمـە مەترسـی بـۆ خـڕ لایەنـە رکابـەرەکان هـەبوو لـەو دەڤەرەدا. بۆیـە ئەڵەمانـەکان لـەو کاتـەدا دەیانویسـت وا نیشـانبدەن، کـە ئـەو پڕۆژەیـە تـەنیا پڕۆژەیـەکی ئابووریـیەو هیچی تر. لە ساڵی ١٩٠٣ دکتۆر رۆهبراخ رایگەیاند "پلان و ئامانجەکانی ئەوانەی ئەو پڕۆژەیە جێبەجێ دەکەن لەدۆزی دیپلۆماتیکی و رامیارییەوە دوورە". هەروەها رایگـەیاند "هەرچەندە لـەو پڕۆژەیـە سـەرمایەی ئەڵـەمانی وەکـاردەخرێ، وەڵێ چ لەلایـەنی حکومـەت، چ لەلایەنی بەشداربووان، هیچ هـەوڵێك لـە ئـارادا نیـیە بـۆ هیـچ جـۆرە رێکـەوتنێکی سیاسـی" [٣٤٠: ١٢٠-١٢١]. بەم چەشـنە پاسـاودانیان بـۆ پڕۆژەکـە دەهێنایـەوەو رووی راستەقینەی ئامانجە سیاسی و ستراتیژی و دوورەکانیان دەشاردەوە. سەرباری ئەوەش ململانێکـە تـا دەهـات رووتر دەچوو قووڵتر دەبوەوە! تەنگژەکە بە تەنیا لەنێوان حکومەتەکان نەمایـەوە، بـەڵکو کەوتـە نێـو سـەرمایەدارانی ئـەو دەوڵەتانـەش، بـە تایبـەتی دوای ئـەوەی ئەڵەمانـەکان هـەوڵیاندا کەشتیەوانیش لە هەردوو رووباری دیجلە و فورات بـۆ خۆیـان مسۆگەر بکـەن، بـۆ ئـەوەی لـە پەرای پڕۆژەی هێڵە ئاسنیەکەی بەکاربێنن. کە ئەمەش واتای قەڵلۆش بوونـی کۆمپانیـای لینچـی دەگەیاند، کە کۆمپانیایەکی ئینگلیزی بوو، جیاوکی کەشتیەوانی لەم دوو رووبارە، واتە دیجلـە و فوراتـدا هـەبوو. بۆیـە بـە تونـدی نارەزاییـان دەربـڕی، ئینگلیزەکـان هـانی کۆمپانیـای (مەکەنزی)یان دا، کە کۆمپانیایەکی تری بەریتانی بوو بۆ ئـەوەی هاریکـاری کۆمپانیـای لینـچ بکات بۆ دەست بەسەرداگرتنی کۆمپانیـای حـەمیدی، کـە کۆمپانیـەکی کەشـتیەوانی دەوڵـەتی عوسمانی بوو، بەرلەوەی بکەوێتە دەست ئەڵەمانەکان. [٢١٦:١٩٥]. ئـەوەی زێـتر تەنگژەکـەی ئاڵۆز کرد، ئەوەبوو ئەڵەمانەکان رۆژ بەرۆژ دەستکەوتی زێتریان وەدەست دەهێنا، ئەمە لە لایەك دەبووە زێـتربوونی نفوزی ئەڵەمانـەکان، لەلایـەکی تـر پـەردەی لەسـەر مەبەستە شـاراوەکانیان هەڵدەدایەوە، کە لە پەنای پڕۆژەی هێڵەکەدا، گەرەکیان بـوو وەدەسـتبێنن کـە لـەپاڵ مەبەسـتە سیاسی و ستراتیژیەکان سامانی کوردستان بوو. دکتـۆر رۆهـەر لـەو کتێبـەی بـەناوی رێگـای

بەغدا دابنابوو، دەربارەی پەترۆلی کوردستان نوسیبووی : "خۆم سەردانی سەرچاوە پەترۆلیەکانی کەرکوکم کرد، هەروەها سەردانی سەرچاوەکانی تریشم کرد لە دەوروبەری بابەگورگور. لە هەردوو دەڤەرەکەدا ئەو دیاردەیەم بینی کە شایەنی بایەخ پێدانە، پێویستە ئێمە بایەخێکی گرنگ بەو کاودانە بدەین کە وایکردوە هێڵی ئاسن بە نزیك ئەو دەڤەرە پەترۆلیەدا بچێ! ئەوەی من لێی دەترسم ئەوەیە ئاڵتوونی بێگانەو ئەوانەی بە دوای شوێنەواردا دەگەڕێن، سەرکەوتن لە مافی لە پێشەوەبوون وەدەست بێنن لە پەترۆلی کوردستان، بەرلەوەی ئێمە (ئەڵمانەکان) دەست پێشخەریەکی کاریگەر ئەنجام بدەین [٣٢٨: ٩١-٩٢]. ئەوەی ئەڵمانەکانی زێتر ترساند، روسەکان داوای جیاوکی هێڵی ئاسنیان کرد لە (وان)ەوە تا بەغدا، وەك شالیاری هەندەرانی عوسمانی لە تەموزی ١٩٠٣ بە ئەڵمانەکانی راگەیاند. [٢٤١: ١١٣]. ئینگلیزەکان ئەگەرچی تا ئەو کاتەش روسەکانیان بە یەکەمین رکابەری خۆیان دادەنا، وەڵێ لە ئەنجامی ئەم پرۆژەیە، ئەڵمانەکانیان بە ترسناکترزانی! لەو یاداشتنامەیەی کە یەکێك لە لێپرسراوە ئینگلیزەکان لە ٢٥ کانونی دووەمی ١٩٠٥، پێشکەش بە لێژنەی بەرگری لە ئیمپراتۆریای کرد The Committee Of Imperial Defence نوسیبووی: "ئێمە رووبەرووی پرۆژەیەك بووینەتەوە، ئەگەر لە سایەی ئەڵمانەکان جێبەجێ بکرێت، زیانێکی گەورە بە بازرگانیمان دەگەیەنێ، لە ئەنجامدا کاریگەری سیاسیمان لە باشوری فارس و دۆلی دیجلە و فورات تێکدەشکێنی. ئێمە سۆنگەی بنەڕەتیمان هەیە رێگای ئەوە نەدەین هێڵەکە لە بەغداوە بگاتە کەنداو. [٩٧: ١٧٨]. بۆیە لەم پێواژۆکە بەدواوە ئینگلیزەکان هەوڵدەدەن ئەژواریەکانیان لەگەڵ روسەکان چارەسەربکەن. سەرباری ئەو هەموو تەنگژە ئابووری و سیاسی و ستراتیژیەی لە نێوانیاندا هەبوو. رۆژنامەی تایمزی لەندەنی لەم بارەیەوە ووتارێکی بڵاوکردەوە، کە تیایدا هاتبوو: "هەڵکشانی روسەکان بەرەو باشوری کوردستان و گەف کردنیان لە بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا، بە رێگای ئاشت بوونەوە و رێکەوتن نەبێت بەهیچ لەگوێنێك چارەسەر ناکرێت" [١٢١: ٦٦-٦٧]. ئینگلیزەکان داخیان بۆ ئەوە دەخوارد کەوا چۆن هەلی کارکردن لەم جۆرە پرۆژانەیان لە دەست داوە. یەکێك لە پسپۆڕەکانیان بە راشکاویەوە گوتی : "گەمژەیی سیاسەتوانانی ئێمە بوو دوچاری ئەو تەنگژە ناخۆشە بووین، ئەو گەمژەییەی جسنی بەهەموو بلیمەتی خۆی نەیتوانی بەسەریدا زاڵ بێ و شکستی هێنا. [١٧٧: ٢٤٦]. لە پاڵ ئینگلیزەکان ئەڵمانەکانیش هەوڵیاندا لە روسەکان نزیك ببنەوە، روسەکانیش دوای ئەوەی لە شەڕەکەیان لەگەڵ ژاپۆن دۆڕاندیان، هەمان ئارەزووی

ئەڵمانەکانیان هەبوو، بۆیە پێشنیاریان کرد کە بەرهەڵستی پڕۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدا ناکەن، ئەگەر ئەڵمانەکان هەرێیان پێ بدەن کەوا یارمەتیان دەدەن لە دەست بەسەرداگرتنی گەرووەکان، وەڵێ لەبەر ئەوەی ئەڵمانەکان خاترجەم بوون روسەکان ناتوانن هیچ ئەستەنگێك بخەنە بەردەم پڕۆژەکەیان، پێشنیارەکەیان رەتکردەوە. [١٨٢:١٤١]. کەچی دوای ئەوە کاتێك ئینگلیزەکان هاوپەیمانەتیان لەگەڵ ژاپۆن نوێکردەوە، ئەڵمانەکان خۆیان پێشنیاری رێکەوتنیان کرد لەگەڵ روسەکان. [٢٩٧:١٦٢]. داوایان کرد ئەگەر بازرگانی ئەڵمانەکان ئازاد بێ و یارمەتیان بدەن هێڵی ئاسن لە تارانەوە رابکێشن بۆ خانەقین لە کوردستان، ئەو کاتە ئەوان ئامادەن یارمەتی ئێران بدەن و پشتی بگرن لە دامەزراندنی هێڵی ئاسن لە شارەکان و کردنەوەی رێگای تازە [٣٢٣:٥٦٩]. وەڵێ روسەکان لە نزیك بوونەوەی ئەڵمانەکان دوو دڵ بوون. لە تشرینی یەکەمی ١٩٠٦ شالیارگەی هەندەرانی روسیا بە هاوکوفی خۆی لە ئەڵمانیای راگەیاند : "ئەوان هیچ بەرهەڵستیەکی پڕۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدا ناکەن، وەڵێ ئەستەنگە لەگەڵ ئەڵمانەکان بگەنە هیچ رێکەوتننامەیەك، ئەگەر لە ئێران و لە کوردستان خاترجەمیان نەکەن". هەروەها لەو یاداشتنامەیە، کە واژۆی شالیاری هەندەرانی روسی لەسەر بوو، هاتبوو : "روسیا ئارەزووی هەیە داوا لە ئێران بکات بەبێ رەزامەندی ئەوان هیچ پڕۆژەیەکی هێڵی ئاسنی لەسەر خاکی خۆیدا دانەمەزرێنێ" [٢٤١:١٢٣]. هاوکات لەگەڵ ئەمە ئەڵمانەکان گەرەکیان بوو ئەژواریەکانیان لەگەڵ ئینگلیزەکانیش چارەسەربکەن. لە تشرینی دووەمی ١٩٠٧ ئیمپراتۆری ئەڵمانی سەردانێکی بەریتانیای کرد. شالیاری بەرگری بەریتانی پێی راگەیاند کە: "لە توانادا هەیە بەریتانیەکان بەرهەڵستی ئەو پڕۆژەیە نەکەن، ئەگەر مافی دامەزراندنی ئەو پارچەیان بدرێتێ کە دەکەوێتە نێوان بەغدا و کەنداوی فارس". هەرچەندە ئیمپراتۆر رەزامەندی خۆی بۆ ئەم داوایەی ئینگلیزەکان دەربڕی، کەچی ئینگلیزەکان ئەوەیان خواست کەوا روس و فەرەنگەکانیش بەشداری دانوستانەکانیان بکەن، بەرلەوەی بگەنە هیچ رێکەوتنێکی دیماهی. ئیمپراتۆر پێی وابوو ئەمە سەرباری ئەوەی دانوستانەکە دوچاری نوشوستی دەکات، ناکۆکیەکانیش قووڵتر دەکاتەوە. [٩٧:١٩٧].

لەوکاتەدا لە نێو دەزگا سیاسیەکانی ئەوروپا بڕوا وابوو بواری فراوان خوازی و تەشەنەکردنی ئەڵمانیا لە دەوڵەتی عوسمانی و بەشێوەیەکی تایبەتی لە ئەناتۆلیا و عێراقە ! [٢١٧:٣٦٠]. ئەناتۆلیا دیارە مەبەستی لە باشوری رۆژهەڵاتی ئەناتۆلیایە کە دەکاتە باکوری

کوردستان، بەهەمان چەشن باشوری کوردستانیش دەگرێتەوە. لەگەڵ میسۆپۆتامیا بە پلەیەکی دواتر، بەم جۆرە لە روانگەی هێڵەکانی ئاسنەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە مەبەستی سەرەکی ئەڵەمان لەم پرۆژەیە، بە پلەی یەکەم کۆنترۆڵکردنی کوردستان بوو !

لە ساڵی ١٩٠٨ کاتێك لە پەرلەمانی عوسمانی باسی دامەزراندنی هێلێك کرا، کە لە باکوری کوردستانەوە، بە موسڵ دا بەرەو کەرکوك بڕوات. چیستەر، کە ئەدمیراڵێکی ئەمەریکی بوو، بەلەزی خۆی گەیاندە ئەستانە. دوای دانوستانێك کە ساڵێکی خایاند، جیاوکێکی وەدەست هێنا کە دامەزراندنی بەندەرو هێلی ئاسنی بەخۆوە گرتبوو. [٢٣٧:٣٧-٣٨]. ئەوەی پەیوەندی بە پرۆژەی هێڵە ئاسنەکەوە هەیە، ئەوا هەمووی لەسەر خاکی کوردستان بوو. خاڵێك لە خارپوتەوە، لەڕێگای ئەرغەنی و ئامەدو بەدلیسەوە دەگەیشتە دەریاچەی وان. هێلێکی تر لە یورمورتالیك تا هێڵی یەکەم. هێڵەکەی تریش لەوێوە دەستی پێدەکرد لەڕێگای موسڵ و کەرکوك بەرەو سلێمانی و سنوورەکانی ئێران دەڕۆیشت. [٣١٤:١٨٠]. شایانی ئاماژە پێکردنە ئەو دەوڵەتانەی دەیانویست هێڵەکان رابکێشن، بالاّ دەست دەبوون لە هەموو ئەو دەڤەرانەی هێڵەکەی پیادا رەتدەبوو. [٣٣٢:١١٠]. وەڵێ ئەو گۆڕانانەی دوای کودەتاکەی ١٩٠٨ روویاندا، کۆسپیان خستە بەردەم ئەو جیاوکەو هەموو جیاوکەکان بە شێوەیەکی گشتی، بۆیە تورکەکان دوای ئەوە کەوتنە پەلپ گرتن لە پرۆژەی هێڵی شەمەندەفەری بەغدا، بە بیانگەی ئەوەی لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا تەواو نەبووە. کەچی نەیانتوانی ئەو (١٠٠) هەزار لیرەیە بدەنەوە کە ئەڵەمانەکان لە پرۆژەکە خەرجیان کردبوو، بۆیە ئەڵەمانەکان گوێیان نەدایە تورکەکان و بەردەوام بوون لەسەر کارەکانی خۆیان. [٣٢٨:٧٧-٧٨]. ئەمە وایکرد ئینگلیزەکان مەترسیەکانی خۆیان راشکاوانەتر دەربڕن، داوایان کرد پرۆژەکە بەنێو دەوڵەتی بکرێ ئەڵەمانەکان رازی نەبوون، ئەمە خەریك بوو تەنگژەیەکی نێو دەوڵەتی بگورێنێ. تورکەکان بۆ ئەوەی بارەکە هێور بکەنەوە وایان بەباشزانی بەشی باشوری هێڵەکە، واتە لە بەغداوە بۆ کەنداو خۆیان ئەنجامی بدەن. ئینگلیزەکان بەمە رازی بوون، چونکە سەرکەوتنێکی گەورەبوو بۆ ئەوان، ئەوەی دەگەیاند کە ئەو پرۆژەیە هەرگیز تەواو نابێ و جێبەجێ ناکرێت. کەچی ئەڵەمانەکان مکوڕ بوون لەسەر ئەوەی خۆیان ئەو بەشەش ئەنجام بدەن. هەرچەندە دواتر هەڵوێستیان بەرەو نەرمی چوو. لە٢٦ تەموزی ١٩١٠ بە شالیاری هەندەرانی تورکیا رەفعەت پاشایان راگەیاند، کەوا حکومەتەکەیان بەبێ گفتوگۆو دانوستان ناتوانێ دەست بەرداری مافەکانی خۆی بێت. [٢٤١:٨٣-٨٤].

روسەکانیش لەم گاڤەدا گەرەکیان بوو لە ئەڵمانەکان نزیك بنەوە، ئەگەرچی هەر لەسەرەتاوە، وەك ئاماژەی پێکرا بەرهەڵستی ئەو پرۆژەیان دەکرد، نەك بە تەنیا لەبەر ئەوەی هێڵەکان بە باکوری کوردستاندا رەتدەبوون و مەترسیان لەسەر سنوورەکانیدا هەبوو، بەڵکو هێڵەکانی باشوری رۆژهەڵاتیش، کە لە تارانەوە دەهاتە خانەقین لە کوردستان و پاشان بەرەو شارە پیرۆزەکانی عێراق (نەجەف و کەربەلا) دەچوو. دەبووە سۆنگەی ئەوەی شالاوی حاجیانی ئێرانی بکەوێتە سەر ئەو رێگایە، کە ئەمەش ئابووری ئێرانی لاواز دەکرد [٣٢٣:٥٦٨-٥٦٩]. هاوکات زیانی بە بازرگانی روسەکانیش دەگەیاند. لەگەڵ ئەمەشدا لە کۆنفرانسی شالیارگەی هەندەران کە لە ٢٨ی تشرینی یەکەمی ١٩١٠ لەژێر سەرۆکایەتی سازانۆف گرێدرا. تیایدا باسی دۆزی ئێران کرا، شالیاری هەندەران سازانۆف بە هاریکارەکانی خۆی گوت کەوا نامە گۆڕینەوە لە نێوان ئەوان و ئەڵمانەکان ئەنجامدرا. ئەوان- روسەکان- بەڵێنیان داوە بەرهەڵستی پرۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدا نەکەن، هەروەها ئەڵمانەکانیش هێڵی ئاسنی بەغدا بە هێڵی ئاسنی ئێران نەبەستنەوە ئەگەر روسیا رەزامەندی لەسەر نیشان نەدا، لە پاڵ ئەمەدا ئەڵمانەکان رابگەیەنن کە هیچ بەرژەوەندیەکی سیاسی و سەربازیان لە ئێراندا نیە. [٣٢٣:٥٧٠]. دوای ئەوە بەپێی چەند مەرجێك هەردوو دەوڵەت لە ٤ تشرینی دووەمی ١٩١٠ گەیشتنە رێکەوتننامەیەك، سەرباری ئەو خالانەی ئاماژەی پێکرا، لەسەر ئەوە رێکەوتن ئەڵمانیا پرۆژەی ئەو هێڵە ئەنجام بدا کە لە تارانەوە بەرەو خانەقین دەچوو، لەوێشەوە بەهێڵی ئاسنی بەغدای ببەستێتەوە. بارتەقای ئەوەش ئەڵمانەکان دان بە بەرژەوەندیەکانی روسدا بنێن لەئێران و هەوڵی ئەوە نەدەن جیاوکی دامەزراندنی هێڵی ئاسنی لەناوچەکانی نفوزی ئەواندا وەرگرن [٩٤:٥٢]. ئەو کارەی ئەڵمانەکان بۆ ئەوە بوو روسەکان لە ئینگلیزەکان دابڕن، ئەگەرچی دوای هەڵقولانی پەترۆل لە(مسجد سلێمان) ئینگلیزەکان رازی بوون دەستی ئەڵمانەکان لە کوردستان بەرهەڵدا بکەن، بەرامبەر ئەوەی ئەوانیش دەستی ئینگلیزەکان لە باشوری بەغداو کەنداو بەرهەڵدا بکەن ! [١٧:٢٧٥].

رژدبوونەوەی ململانێیەکان وایدەکرد گۆڕانی بەلەز بەسەر پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکاندا بێت، لەیەکترازان دوورکەوتنەوە، هاوکات بۆ یەکتر هاتن و نزیك بوونەوە، بە بەردەوامی و بەلەزی روویاندەدا. لە شوباتی ١٩١٣، ئەندازیارێکی روسی بەناوی م.پادگۆرسکی جیاوکی هێڵی ئاسنی لە ئێران وەدەست هێنا، کە راکێشانی هێڵی ئاسنی لە جلفا تا تەورێزی تیابوو، هێڵەکە تا (وورمێ)ش دەهات، ماوەی جیاوکەکە ٧٢ ساڵ بوو، هاوکات مافی کانزاکاری و گەڕان بەدوای پەترۆلی تیابوو بە ٩٦کیلۆمەتر لەم بەرو ئەو بەری

هێڵەگەو بەدرێژایی پڕۆژەکە. [٣٢٣:٦٤٩]. هەر لە هەمان ساڵدا عوسمانی و ئینگلیزەکانیش دەستیان بە دانوستان کرد، لە ٢٩ تەموزی ١٩١٣ لە کۆنگرەی لەندەن ڕێکەوتننامەیەکیان گرێدا، ئەوەی پەیوەندی بە پڕۆژەی هێڵی ئاسنی بەغداوە هەبوو لەو ڕێکەوتننامەیە، حکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانی ئازاد بوو لە ڕاکێشانی هێڵی ئاسنی لە بەغداوە بۆ بەسرا، یاخود بۆ هەر لایەکی تر لەو دەڤەرەدا، هەردوولایان لەسەر ئەو تەگبیرانە ڕێکەوتن کە پێویست بوو بگیرێتەبەر، بۆ پاراستنی هێڵەکان و شوێنی وەستانی شەمەندەفەرەکان. یا هەر دامودەزگایەکی تر کە پەیوەندی بەم بابەتەوە هەبوو. [٤١:١٤٨]. دوای ئەوە فەڕەنگەکانیش بۆ ئەوەی جیاوکی هێڵی ئاسنی لە سامسونەوە بۆ سیواس و لەوێشەوە بۆ ئامەد وەرگرن، کەوتنە خۆ نزیك کردنەوە لە ئەڵەمانەکان، هاوکات ئارەزووی خۆیان نیشاندا بۆ ڕاکێشانی هێڵێکی تر لە ئامەدەوە بۆ ئەرزنجان ERSINGJAN. [٢٤١:١٠٧]. وەك ئاشکرایە ئەم ناوچانە بەناوچەی نفوزی روسەکان دەژمێردران، وەڵێ لەبەر ئەوەی فەڕەنگەکان هاوپەیمانی خۆیان بوون، واتە هی روسەکان، بۆیە روسەکان ئامادەبوون دەست بەرداری جیاوکی هێڵی ئاسنی بن لەم ناوچانەدا بۆ فەڕەنگەکان. لە١٤ شوباتی ١٩١٤ کارسازە ئەڵەمان و فەڕەنگەکان گەیشتنە ڕێکەوتننامەیەك، کورتەکەی ئەوەبوو، فەڕەنگەکان جیاوکی ڕاکێشانی هێڵە ئاسنەکانی کوردستان وەربگرن، تا دەگاتە سنوری ئەرمەنستان، بارتەقای ئەمەش فەڕەنگەکان دان بە نفوزی ئەڵەمانەکان بنێن لەو شوێنانەی هێڵی ئاسنی بەغدای پیادا ڕەتدەبوو. [١٨٢:٢٧٣]. ئەم پێنگاوە نەك بە تەنیا سەرمایەدارە فەڕەنگەکان، بەڵکو حکومەتەکەشیانی ڕازی کرد، چونکە دوای ئەو ڕێکەوتننامەیە فەڕەنگەکان سیاسەتێکی هەندەرانی سەربەخۆیان گرتەبەر لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین، دوور لە سیاسەتی روسەکان. [٢٤١:١١٢-١١٣]. هەر لە هەمان ساڵدا ئینگلیزەکانیش لەگەڵ ئەڵەمانەکان دەستیان بە دانوستان کرد. لە ئەنجامدا ئەوانیش گەیشتنە ڕێکەوتننامەیەك، بەگوێرەی ئەو ڕێکەوتننامەیە وازیان لەو بیرۆکەیە هێنا بەندەرێکیان لەسەر کەنداو هەبێت، بارتەقای ئەوەش ئینگلیزەکان هەرێ یان دا چیتر کۆسپ نەخەنە بەردەم پڕۆژەی ڕاکێشانی هێڵی ئاسنی بەغدا. هەروەها دانیان بە نفوزی ئەڵەمانەکان نا لە ئەناتۆلیا و باکوری سوریاو باکوری میسۆپۆتامیا، کە دەکاتە کوردستان! بەو پێیەی ئەڵەمانەکانیش دان بەو بارەدا بنێن کە لە باشوری میسۆپۆتامیاو کەنداوی فارس لە ئارادابوو [١٣٥:١٤٣]. ئەو ڕێکەوتننامانە ئەگەرچی لە سوودی هەموولایەکدا بوو، کەچی ئەو ئارامیەی لە ئەنجامیدا دەهاتە ئارا، بە پلەی یەکەم پەرای بەرژەوەندیەکانی ئەڵەمانیای دەکردو سوودی ئەوانی تیابوو. بەرژەوەندیەکانی لە کوردستان و ڕۆژهەڵات زێتر دەچەسپا. پەیوەندیەکانیشیان لەگەڵ عوسمانیەکاندا سەقامگیرتر دەبوو. هەر بۆیە کاتێك دەوڵەتی عوسمانی لە تشرینی دووەمی ١٩١٤ چووە ناو شەڕەوە، کۆی

وەبەرهێنانی بێگانە جگە لە قەرزەکانی گەیشتە ٦٣,٤٤٤,٠٠٠ جونەیهی ئیستەرلینی، کە پشکی پڕۆژەی هێڵی ئاسنی تیایدا ٣٩,١٦٣,٠٠٠ بوو. [١٥٦:١٠٦]. بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێ، هێڵی ئاسنی بەرلین - بەغدا، سەرباری بایەخە سیاسی و ستراتیژیەکەی، بایەخێکی ئابوری گەورەی هەبوو. شایەنی ئاماژە پێکردنە هەر لە سەرەتای شەڕدا ئەڵەمانەکان کەوتنە خۆ بۆ ئەنجامدانی ئەو هێڵانەی کوردستانیان بە میسۆپۆتامیاوە دەبەستەوە، ئەو پارچانەیان تەواوکرد کە دەکەوتە نێوان بەغدا و بەسرەوە. تەنانەت ژمارەیەکی زۆر کرێکاری کوردیشیان بۆ ئەم کارە بەکرێ گرت، ئەندازیارە ئەڵەمانەکان پێیان وابوو کرێکارە کوردەکان باشترین و ئیشکەرترین کرێکارن. [٣٥:٩-١٠].

بەم چەشنە پڕۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدا بوو بە کێشەیەکی دیپلۆماتیکی نێو دەوڵەتیی، شالیارگەی هەندەرانی زۆر وولاتانی خەریك کرد، بوو بە کارێك خاوەن بانکەکان بایەخی پێ بدەن. [١٧٨:٥٠]. ئەڵەمانەکان کردیانە داردەستێك بۆ ئەوەی سیاسەتی جیهانگیریەکانی پێ بهێننە دی. وەك پرینس لیکۆنۆفسکی، باڵوێزی پێشووی ئەڵەمانیا لە لەندەن نووسیبووی : "ئەو پڕۆژەیە یەکێك بوو لەو هەڵە دیپلۆماتیکیانەی کاریگەریەکی گەورەی لە دایسانی جەنگ هەبوو" [١٣٩:٣٤٠]. لە هەمان کاتدا کاریگەریەکی گەورەی لەسەر کورد و کوردستان هەبوو. یەکێکیش بوو لەو ئەگەرانەی وایکرد زۆربەی شەڕەکانی بەرەی رۆژهەلات لەسەر خاکی کوردستان روودات. تەنانەت ترسناکی و کاریگەری ئەو پڕۆژەیە هێندە گەورە بوو. هەندێك لە نووسەران بە "تارمایی سەدەی بیستەمیان ناو دەبرد" [٨٩:١٣١].

## باسی سێیەم: کورد و شوێنی کوردستان

## لە ڕێکەوتننامە و هاوپەیمانیەتیە نێو دەوڵەتیی و ناوچەییەکاندا

قووڵبوونەوەی ململانێی نێــو دەوڵــەتی لــە ڕۆژهــەڵاتی نــاڤین بەگشــتی و کوردســتان بەتایبــەتی، لەگــەڵ خۆتــێ هــەڵقورتاندنی زلهێزەکــان لــە هــەموو کــارو بــارێکی ئــەو دەڤــەرەدا، تــا دەهــات کاودانەکــەی زیــتر بــەرەو گــرژی و ئــاڵۆزی دەبــرد. بۆیــە شــەڕ و ئــاژاوەی نێــوان دەوڵەتــە ناوچەییــەکان، وەکو ئێرانی عوسمانیەکان، زنجیرەیەکی نەپساوە بوو، و هــەرگیز بنــەبڕ نــەدەبوو. دوای هەر شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوەیەکیش ڕێکەوتننامەیان مۆر دەکــرد، لەوانــە ڕێکەوتننامــەی ئەماسـیا (١٥٥٥)و نــەورۆز (١٥٩٠) و زەهــاو (١٦٣٩) و ئــەرزەڕۆمی یەکــەم (١٨٢٣) و ئەرزەڕۆمی دووەم (١٨٤٧). جێ پەنجەی زلهێزەکان چــەندە لەشــەڕ و شــۆڕەکان بــەدی دەکــرا، هێندەش لەو ڕێکەوتنامانە دیار بــوو. وەك پــالــمرســتــون بــالــوێــزی بــەریتــانیا لــە پترسبورگ گوتی: "بــە بڕیــارێکی ئارەزوومەندانــە نــەبێت لەلایــەن بــەریتانیای مــەزن و ڕوسیــای تــەزاری، کێشــەی نێــوان ئــێران و تورکیــا هــەرگیز بــە شــێوەیەکی دیمــاهی چارەســەر نــاکرێت" [١٥٧:١٨٩]. دیارە لە هەموو ئەو ڕێکەوتنامانــە دۆزی کــورد بابــەتێکی بنــەڕەتی و ســەرەکی بوو، چونکە زۆربەی ئاژاوەکان پەیوەندیان بە دەڤەرە سنووریەکانی ئەم دوو دەوڵەتــەوە هــەبوو، ئەو دەڤەرانەش لە هەردوو دیوی ئەم دەوڵەتانە، بە درێژایی سنوور، تەنیا بەشێکی کــەمی باشــور نەبێت، ئــەوەی تــر هــەموو خــاکی کوردســتان بــوو لــە نێوانیــان پارڤــە کرابــوو. هــەر لایــەیان هەوڵیدەدا چۆن و بەچ لەگوێنێك ڕەفتار لەگەڵ کوردەکــانی بــن دەســتیان بکــەن. بــۆ وێنــە لــە بەندی یەکەمی پەیماننامەی ئەرزەڕۆمی یەکەم کە لەساڵی ١٨٢٣ لە نێوان ئێرانی و عوسمانیەکان گرێدرا هاتبوو کە هیچ لایــەکیان تێکــەڵ بــە کاروبــاری نــاوەخۆی دەوڵەتەکــەی تــر نــەبێت و دەســت لــە کاروبــاری دامــەزراندنی مــیرە کوردەکــان وەرنــەدا کــە لــە بــەغداوە دادەمــەزران و ئێرانیــەکانیش پێشــوازی لــە مــیرە کوردەکــان نەکــەن. [٥٨:١٨٩]. کاریگــەری ڕوس و ئینگلیزەکــان، فەڕەنگــەکانیش بەرادەیــەکی کــەمتر، گەیشــتبووە ڕادەیــەك زۆر جــاران ئــەوان ڕەشنووسی پەیمانامەکانیان دادەناو کۆنگرەکان لەسەر داوای ئەوان گرێ دەدران. لە کۆنگــرەی ئەرزەڕۆمی دووەم بەریتانیەکان پێشنیارەکانیان پێشکەش کرد، پێشینەش پێیان وابوو کێشــەی سلێمانی لــە بــەرژەوەنــدی عــوسمانیەکــان و کێشــەی خــــوڕەم شەهــر (محمــرە)ش لــە

بەرژەوەندی ئێرانیەکان تەواودەبێ. [٢١٤:١٢٧]. دوای مۆرکردنی ئەو پەیماننامەیە لـە بـەندی هەشتەمیـدا هـاتـبوو: "هەردوو دەوڵـەتی پـەیمان بەسـت هـەریێ ئـەوە دەدەن هـەموو شـێوازێك بگرنە بەر بۆ سزادان و نەهێشتنی نژدی و دزی لەلایەن ئەو نەتەوانەی لەسەر سنوور نیشتەجێن، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە لە شوێنی لەبارو گونجاو سـەربازەکانیان دابنێـن" [١٨٩:٦٥-٦٦]. وەلێ لە سۆنگەی روودانی گۆڕان لە تەرازووی هێزەکان چ نێودەوڵـەتی یـاخود ناوچـەیی، ئـەو رێکەوتننامانە یا جێبەجێ نەدەکران، یاخود بۆ ماوەیەکی کەم کاریان پێدەکرا. بۆیە ناوە نـاوە مشت ومڕ لەسەر کورد.و خاکی کوردسـتان دەگورایـەوە، کـە بـۆ شـاردنەوەی دۆزی کـورد، هەرچەندە دۆزی کورد نەبوو دۆزی دوژمنانی کورد بوو، چونکە ئەوان چاویان بڕیبووە خـاکی کوردستان، بە کێشەی سنووریان ناودەبرد.

لە ئـەنجامی دووبـارە بوونـەوەی ئـەو ئەژواریانـە، لـە سـالی ١٨٦٩ لـە ئەسـتانە چارەسەرکردنێکی کاتی دانرا، کە بریتی بوو لە هێشتنەوەی باری ئێستا وەکو خۆی. بەپێی ئـەم چارەسەرکردنەش دەبوایە ئەو زەویانەی مشت ومڕیان لەسەر بوو وەکو خۆی بهێڵرێتەوە. تا بـە شێوەیەکی دیماهی چارەسـەریان دەکـرا، لـە سایەی ئـەو دەوڵەتـەی زەویەکـەی بەردەکـەوت. [٢٤١:١٤٩]. دوای ئەوەش لە نێوان سالانی ١٨٦٩-١٨٧٥ ئێران ناوە ناوە داوای یـارمـەتی لە هەردوو دەوڵەتی ناوبژیوان دەکرد، لە سالی ١٨٧٤ لە تورك و فارسەکان لیژنەیەك پێکهات، وەلێ کارەکانیان وەستا. چونکە فارسەکان داوایـان کـرد لیژنەکـە بـە گوێـرەی رێکەوتننامـەی ئەرزەرۆم کارەکانی ئەنجامبدا، هەرچی تورکەکان بوو رێکەوتننامەی زەهاویان پەسندتر کرد. لـە سالی ١٨٧٥ دوو ئەندامی رێ پێدراوی روس و بەریتانی لە لیژنەکە زیادەکران، کەچی شـەڕی روسی - تورکی ١٨٧٧ کارەکـانی ئـەم لیژنەیەشـی وەسـتان. [٢٢٥:١٢]. لـەو گاڤـەدا ململانێیەکە رژدتر و گرژتر بوو لەسەر ناوچەی قوتور، کـە دەکەوێتـە نزیـك چاریق و دواتـر بوو بە مەڵبەندی بزاڤی نەتـەوەیی کـوردی لـەبن سـەرکردایەتی سمایل ئاغـای شکاك (سمکۆ). هەریەکە لە دەسەلاتدرانی ئێران و عوسمانی ئەو ناوچەیان بەهی خۆیان دەزانی، سەیر لـەوەدابوو هیچ لایەکیان بە زێدی کوردانیان نەدەزانی! بەگوێرەی رێکەوتننامەی سان سـتیڤانۆ و بـەرلین لە سالی ١٨٧٨، دەبوایە تورکەکان ناوچەی قوتور بۆ ئێرانیەکان چۆڵ بکەن. لە سـالی ١٨٨٠ لیژنـەیەکـی تێکـەلاوی ئـەنگلـو - روسی هێلی سنووریان دیاریکرد، کەچی ئەمەش جێبەجێ نەکرا. [١٨٤:١٢٦]. دوای کۆنگرەی بەرلین، وەك لە باسەکانی تر ئامـاژەی پێکـرا گۆڕانێـك بەسـەر پەیوەندیـە نێـو دەوڵەتیـەکان داهـات. ململانێش لەسـەر ئـەو دەڤـەرە چڕتربـۆوە، ئـەو

کێشـەیەش کـە بـە کێشـەی سـنوور دەناسـرا کەوتـە چـوار چێوەیـەکی فراوانـترەوە، ئـەویش چوارچێوەی هاوپەیمانیەتیە نێو دەوڵەتیـەکان بـوو. چونکـە زۆربـەی مێژوونوسـان لەسـەر ئـەوە ڕێکن ساڵانی ١٨٩٠-١٩١٤ بە پێواژۆکێکی نوێ دابنێن لە پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکان، ئـەو پێواژۆکـەی زلهێزەکـان بـەگوێرەی بەرژەوەندیـەکانیان لـە یـەکتر نزیـك دەبونـەوەو دوور دەکەوتنەوە! ئاکامەکەشی جەنگەماڵوێران کاریەکەی یەکەمی جیهان بوو.

کوردستان لـە سۆنگەی شوێنە ستراتیژیەکەی دەکەوتـە چـەقی ئـەو ڕێکەوتننامـە و هاوپەیمانیەتیانـەی بـە شـێوەیەکی گشتی دەربـارەی ڕۆژهـەڵاتی نـاڤین گـرێ دەدران، لایەنـە ڕکابەرەکان حسێویان بۆ جیۆستراتیژی و سامانە زۆرەکـەی کوردستان دەکـرد، بۆ ئـەوەی بیکەن بە ناوچەی نفوزی خۆیـان، لـەم بـوارەدا ئینگلیزەکـان ڕیـزی پێشـەوەیان گرتبـوو، کـە ئەوکاتە بۆ چارەسەرکردنی کێشـەی بێکـاری و پـەیداکردنی نـان بـۆ برسـیەکانیان، دەگـەڕان زەوی نـوێ وەدەست بێنن. لـە لایەکـی تـر بـازاڕ بـۆ کـاڵاکـانیان بدۆزنـەوە. لـەو گاڤـەدا سیاسـەتوان و سـەرمایەدارانیان پێیـان وابـوو، بـۆ ئـەوەی خۆیـان لـە شـەڕێکی نـاوەخۆ وەدووربگرن، پێویستە ببنە ئیمپریالیزم ! [١١:٢٣٩].

ڕەهێی ئەو هاوپەیمانەتیە نێـو دەوڵەتیانـە، لـە ڕاستیدا لـە پەیماننامـە نێـو دەوڵەتیەکانـەوە دەست پێدەکات، کە هەر لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە سەری هـەڵدا. بـۆ وێنـە لە ساڵی ١٨٨١ ڕوسەکان هاوپەیمانەتیەکان لەگـەڵ ئەڵـەمان و نەمسـاویەکان مۆرکـرد، کـە بـە هاوپەیمانیەتی سێ پەتریك دەناسرێ (**حلف الاباطرة الثلاثة**). بەمەش ڕوسـەکان سنوورەکانی ڕۆژهـەڵاتیان مسـۆگەرکرد، بۆیـە لـە ئاسیا دەستیان ئـاوەڵابوو، چـاڵاکی فـراوان خوازیـان چڕتربـوو، زەوی نـوێ یـان خسـتە سـەر ئیمپراتۆریـا فراوانەکـەیان. ئـەم پەلهاوێشـتنەی ڕوس، ئینگلیزەکانی دوچـاری دڵـە ڕاوکـێیـەك کـرد، نـەك بەتـەنیا لـە هیندسـتان، بـەڵکو لـە وڵاتـە هاوسێکانیشی بە تایبەتی لە ئەفغانستان و ئێران*. لە سـاڵی ١٨٨٤-١٨٨٥ پـەیوەندی نێـوان ڕوس و ئینگلیزەکان دوچاری تەنگژەیەك هات. [١٢٦:١٥٨]. بۆیە لەو کاتـەدا ئینگلیزەکـان هەوڵیاندەدا ئەڵەمانەکان بخزێننە ناو کێشەکانیانەوە لەگەڵ ڕوسەکان. کە ئەمەش بەرز بوونەوەی ڕۆڵی ئەڵەمانەکان نیشاندەدا لەسەر گۆڕەپانی ململانێی نێو دەوڵەتی، کە ڕۆژ بەرۆژ زێتر دەبوو،

---

* کە باسی ئێران دەکرێ، ئەوەی پەیوەندی بە مەترسی ڕوسەکانەوە هەیە، ئـەوا ناوچـەکانی ڕۆژئـاوای ئێرانـە، کـە دەکاتـە ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان. چونکـە لـەوێوە مەترسیان بـۆ سـەر ڕێگـای هیندسـتان چێدەکرد.

تا ئەو رادەیەی لە ساڵی ١٨٩٠ بووە مەترسیەکی گەورە لەسەر رۆژهەڵاتی ناڤین، ئەمەش بە پتەوکردنی پەیوەندیەکانیان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، کە ئینگلیز و فەرەنگەکانی ناچارکرد واز لە پرەنسیپە کۆنەکەیان بهێنن دەربارەی پاراستنی یەکیەتی ئیمپراتۆریای عوسمانی. تەنانەت هەردوو دەوڵەت بەمەبەستی گۆشەگیرکردنی ئەڵەمانیا و پارڤەکردنی دەوڵەتی عوسمانی بەگەرمی کەوتنەکار. [٤٥:١٢٣-١٢٤]. ئەڵەمانەکان نەك بەتەنیا دەوڵەتی عوسمانی، بگرە گەرەکیان بوو ئێرانیش بکەنە کۆلۆنیایەکی گەورە، بە ئامانجی پراکتیزەکردنی ئەو سیاسەتە جیهانگیریەی کە نەخشەیان بۆ کێشابوو. بۆیە بەهێزبوون و مانەوەی دەوڵەتی عوسمانی بەم لەگوینەی بەرژەوەندی ئەوان دەیخواست، خاڵێکی بنەرەتی و گرنگی ئەو سیاسەتە بوو. پرۆژەی هێڵی ئاسنی (بەرلین - بەغدا)ش، لەپاڵ هەموو ئامانجە ئابووری و سیاسی و ستراتیژیەکانیان، بەتوندی پەرای ئەو ئامانجەی دەکرد. ئەنجامی رووبەڕوو بوونەوەی ئەو سیاسەتەی دەوڵەتە زلهێزەکان لە رۆژهەڵاتی ناڤین، واتە سیاسەتی هێشتنەوەو پارڤەکردن، زۆر گەل و نەتەوە بوونە گوری، لەوانەش کورد و ئەرمەن. هەوڵدرا کورد وەکو ئامرازێك بەکاربهێنرێ بۆ بەهێزکردنەوەی بەرەی ناوەخۆی دەوڵەتیی عوسمانی، لەلایەکی تر بیکەن بە ئامرازێك بۆ پەلاماردانی ناحەزەکانیان، بە تایبەتیش روسیا و ئێران. بۆیە لە ساڵی ١٨٩٠ سوڵتان عەبدولحەمید زۆر لە بەگ و سەرۆك هۆزە ناودارەکانی بانگهێشتەی کۆشکی یەڵدزکرد، دەسەڵاتی زۆری پێ بەخشین و بەڵێنی گەورەی پێدان. بێگومان سوڵتان گەلێك مەبەستی لەمەدا هەبوو، دەیویست لەلایەك دژی بزاڤە نەتەوەییەکانی کوردیان بەکاربهێنێ، لەلایەکی تر هەموو هۆزەکانی دەخستە بن زێرەڤانیەکی توندی حکومەت. چونکە ئەوان بەر لە هەموو شتێك گەرەکیان بوو کورد لە ئاسیای ناڤیندا بتوێننەوە. [١٥٦:٤٣-٤٤]. سەرباری ئەم خاڵانە سوڵتان دەیویست کورد لەبن کاریگەری روس و ئینگلیزەکان دووربخاتەوە. چونکە ئەوانیش بەپێی خۆیان هەوڵیاندەدا سوود لە کورد وەربگرن. هەر ساڵێك بەر لە دامەزراندنی سوارەی حەمیدی، وەك لە باسەکانی تر ئاماژەی پێکرا نیکۆلای دووەم، تەزاری روس، ژمارەیەکی زۆر لە سەرۆکە کوردەکانی بانگهێشت کرد و زۆر وادەو هەریێی دڵخۆشکەری پێدان.

هەڵوێستی روسەکان بەرامبەر کورد هەڵوێستێکی دوو روو بوو، لە لایەك بانگهێشتەی کوردیان دەکرد، لە لایەکی تر دژی بزاڤی کورد دەوەستان لە رۆژهەڵاتی کوردستان، چونکە مانەوەی حکومەتی قاجاری بەو بێ هێزیەی تیایدا بوو، هۆکارێك بوو بۆ باڵا دەستی روسەکان لەو ناوچەیە، کە هەر لەکۆنەوە بە ناوچەیەکی نفوزی خۆیان دەزانی. بەم لەگوینە بۆمان

دەردەکەوێ ساڵی ١٨٩٠ کە بە سەرەتایەك دادەنرێ بۆ پێواژۆکێکی نوێ لە پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکان، کاریگەریەکی دیارو بەرچاوی لەسەر کورد و کوردستان هەبوو. هەر ساڵێك دوای ئەمەش ئاژاوە و پەشێوی لە سنوورەکانی ئێران و تورکیا دەستی پێکرد، کە دەکاتە کوردستان. ئەم ئاژاوەیە لە سوودی عوسمانیەکاندا بوو، چونکە سادەترین ئاژاوە بۆ ئەوان بیانگەیەکی لەباربوو تا پەلاماری ئێران بدەن. بۆیە سنوورەکانی ئێرانیان بە سوپای حەمیدی تەنی، سەرۆکەکانی حەمیدیش کەوتنە پڕوپاگەندە کردن لە نێو کوردەکانی رۆژهەڵات. ئەوەی زێتر زەندەقی ئێرانیەکانی برد گەڕاندنەوەی کوڕەکانی شێخ عوبێدوڵلا بوو، کە لە ئەستانە دەست بەسەر بوون. بۆیە ئێران کاتێ لە مەبەستی عوسمانیەکان گەیشت، داوای یارمەتی لە روسیا کرد. [٥٤:١١٩]. عوسمانیەکان سەرباری ئەوەی دەیانویست کورد لە پێناو مەبەستەکانی خۆیان بەکاربێنن، هاوکات لەوەش دەترسان کورد بکەن بە سەرباز! یەکێك لە سەرکردە سەربازیەکانیان لە ئەرزەڕۆم لەم بارەیەوە گوتی : "کورد ئەگەر کران بە سەرباز ئارەزووی جەنگیان نوێ دەبێتەوە، دانی چەك و فێرکردنی تەکتیکی نوێی جەنگی کەم و کوڕیەکانی کورد پڕدەکاتەوە بۆ ئەوەی سەر لەنوێ راپەڕن" [١٤٢:١٧٣]. ئەو هەڵوێستەی عوسمانیەکان، کە بەدەست لە پشتدانی ئەڵمانەکان بوو، فەڕەنگ و روسەکانی لە یەکتر نزیك کردەوە. لە ساڵی ١٨٩١ دۆستایەتیان بەست و دوای سێ ساڵ بوو بە هاوپەیمانیەتی، لەگەڵ ئەوەی جیاوازیەکی زۆر لە نێوان سیستەمی فەرمانڕەوای هەردوولایان هەبوو، فەڕەنگەکان کۆماری و روسەکان فەرمانڕەوایی رەهایان هەبوو. [١٨١:٦٧]. هەرچی ئینگلیزەکان بوون، پشی پشی یان بۆ ئەڵمانەکان دەکرد و هەوڵیاندەدا خۆیان لێ نزیك بکەنەوە، بۆ ئەوەی رکابەری بەرژەوەندیەکانی روسیان پێ بکەن لە رۆژهەڵاتی ناڤین، یاخود بە شێوەیەکی تر بیکەن بە کۆسپێك لەبەردەم نفوزی روسەکان لە ئێران و کوردستان و میسۆپۆتامیا. هەرچەندە لە سۆنگەی پڕۆژەی هێڵی شەمەندەفەری بەغدا زیانیان لێدەکەوت، کەچی هیچ رووێکی ترش و گرژیان نیشان نەدا، چونکە لەم پێواژۆکەدا گەفی راستەوخۆ لەسەر بەرژەوەندیەکانیان لە کوردستان و رۆژهەڵاتی ناڤین بەگشتی لەلایەن روسەکانەوە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا هاتنە ناوەوەی ئەڵمانەکانیشیان هەروا بە ساویلکەییەوە وەرنەگرت، بەڵکو پێنگاو بە پێنگاو زێرەڤانیان کردن، لە رێگای رێکەوتننامە نێو دەوڵەتیی و ناوچەییەکانەوە، دەیانویست پشتێنەیەك لە چواردەورەی ئەو دەڤەرانە چێ بکەن کە ئەڵمانەکان چالاکیان تیا ئەنجامدەدا. کوردستانیش چەقی بازنەی ئەو چالاکیانە بوو. هاوکات ئابلوقە دانێك بوو بۆ بەرژەوەندیە ئابووری و سیاسی و ستراتیژیەکانی خۆیان، کە بەشێوەیەکی سەرەکی پەترۆل و شوێنی ستراتیژی کوردستانی

دەگرتەوە. لە راستیدا ئەو پێنگاوانەی ئینگلیزەکان بە تەنیا بۆ گەمارۆدانی ئەڵەمانەکان نەبوو کە چاوەڕوانی ئەوەیان لێدەکرا لە ئایندەیەکی نزیکدا ببنە مەترسی و گەفێکی زل لەم ناوچەیە، بەڵکو بۆ خڕ ئەو هێزانە بوو کە گەرەکیان بوو زیان بە بەرژەوەندیەکانی ئەوان بگەیەنن.

پێنگاوەکانی ئینگلیز شان بە شانی پرۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدا و چالاکیەکانی تری ئەڵەمانەکان دەچووە پێشەوە و بە شێوەیەکی بنەڕەتی پشتیان بە هێزی دەریاییان بەستبوو، بۆیە هەوڵیاندەدا بە باشی جێ پێی خۆیان لە کەنداو پتەو بکەن، بە تایبەتی دوای ئەوەی بۆیان روون بوەوە کە ئەڵەمانەکان گەرەکیانە وایان لێ بکەن بەهەر جۆرێك بێت حسێوێکیان بۆ بکەن، ئەمەش دوا بەدوای ئەوەبوو کە ئەڵەمانەکان برپاریاندا کەشتیگەلیەکی جەنگی دامەزرێنن. چونکە ئەڵەمانەکان پێ یان وابوو ئەگەر بیانەوێ ئینگلیزەکان حسێوێکیان بۆ بکەن پێویستە کەشتیگەلیەك دامەزرێنن لە توانایدا هەبێ بەرامبەر کەشتیگەلی بەریتانی بوەستێ. ئەو کاتە ئینگلیزەکان ناچار دەبن دانوستانیان لەگەڵدا بکەن و جێگایەکیان لەبن خۆر بۆ بکەنەوە [٢٩:١٤٣]. لەو ترسە بوو ئینگلیزەکان کاریان بۆ ئەوە دەکرد خۆیان لە کەنداو پتەو بکەن، هەرچی لە دەڤەرەکانی تر بوو هەوڵیاندەدا ئاژاوە بۆ عوسمانیەکان بنێنەوە. بەتایبەتی لە سنوورەکانی قەوقازیا، واتە سنوورەکانی باکوری کوردستان. ئارەزووشیان نەدەکرد لەو پێنگاوانەدا تەنیا بن، بۆیە تا بۆیان بلوایە روس و فەڕەنگەکانیشیان تێوە دەگلاند، بۆ وێنە لە ئایاری ١٨٩٥ هەرسێ دەوڵەت، روس و فەڕەنگ و ئینگلیز، یاداشتنامەیەکیان دا بە دەروازەی بالاّی عوسمانی و داوای چەند چاکسازیەکیان کرد لە دەڤەرە ئەرمەن نشینەکان، سەرباری ئەوەی روانگەو بیرو بۆچوونی هەریەکەیان لەگەڵ ئەوانی تر ئایری بوو لە بارەی ئەم دۆزەوە. روسەکان دەیانزانی سەربەخۆ بوونی ئەرمەنەکان لە دەوڵەتیی عوسمانی، ئەرمەنەکانی خۆشی لێ راست دەکاتەوە، بۆیە بەشداری کردنیان لەم یاداشتنامەیە بەشداری کردنێکی رووکەشانە بوو، لە تەموزی هەمان ساڵدا رایانگەیاند کە ئامادەنین لە پێناو چاکسازی لەم دەڤەرانەدا چەك بەکاربێنن. فەڕەنگەکانیش لەسەر هەمان رچەی روسە هاوپەیمانەکانیان دەڕۆیشتن. [٢٦٣:٢٩٩-٣٠٠]. وەلێ ئینگلیزەکان تەنیا ئەوەیان گەرەك بوو بەشداری کردنێك هەبێت لە یاداشتنامەکەدا، کە هەرچیەکی لە پەنا حەشاردرابوایە، لە روخساردا دۆستی و هاریکاری لە نێوان ئەو هێزانەدا نیشان دەدا. ئەوەبوو لە ٢٠ تشرینی دووەمی هەمان ساڵدا عوسمانیەکان روونکردنەوەیەکیان راگەیاند کە باسی چاکسازی دەکرد لە ئەرمەنستان![٢٦٣:٢٩٩-٣٠٠]. کەچی دواتر لە سۆنگەی خۆکێشانەوەی ئەو دەوڵەتانە، یاداشتنامەکە بووە بیانگەیەك بەدەست عوسمانیەکانەوە تا سیاسەتە ترسناکەکەیان لە قەلاّچۆکردنی ئەرمەنەکان پیادەبکەن. چونکە بوونی ئەرمەنەکان لەو دەڤەرەدا هەروەك چۆن

ئەگەر چاكسازیەكان ئەنجام درابوایە، دەبووە گەفێك بۆ روسەكان، بە هەمان لەگوێن ئەرمەنەكانی توركیاش مەترسیان لەسەر یەكپارچەیی دەوڵەتی عوسمانی هەبوو. هۆكارێكی بەهێزیش بوون بۆ ئەوەی روسەكان لەو رێگایەوە دەست لەكاروباری ناوەخۆی عوسمانیەكان وەربدەن. بێگومان ئەمەش لە بەرژەوەندی ئەڵەمانەكاندا نەبوو. كە گەرەكیان بوو دەوڵەتی عوسمانی بەهێزبێت و بەیەكپارچەیی بمێنێتەوە. هاوكات چوونی لقەكانی هێڵی ئاسنی بەغدا لە كوردستانەوە بۆ سنوورەكانی قەوقاز، كە دەڤەرەكانی ئەرمەنستانیشی دەگرتەوە، وای گەرەك بوو ئەو دەڤەرە ئارامی تیا سەقامگیر بێ، بەم جۆرە كەوتنە قەڵاچۆكردنی ئەرمەنەكان. كە ئەمە خۆی لە خۆیدا دەست وەشاندنێك بوو لە بزاڤی نەتەوایەتی كورد، هەوڵدانێك بوو بۆ لادانی بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی كوردی و لادانی لە رێگای راستەقینەی خۆی، كە خەبات كردن بوو بۆ ئازادی و سەربەخۆ بوون. ئەوەی رێگای سەركەوتنی بۆ ئەو پلانەی توركەكان ئاسانتر كرد، داواكردنی ئەرمەنەكان بوو لە كۆنگرەی بەرلین بەو شەش ویلایەتەی كورد بە زێدی رەسەنی باب و باپیرانی خۆیان دەزانی. ئەمە كاریگەریەكی ترسناكی هەبوو، وایكرد كورد بە چاوی گومانەوە سەیری بزاڤی نەتەوەیی ئەرمەنی بكەن، ئەگەر چی چەندین ساڵ بوو لە نێو دەست و دەمی یەكتر دەژیان و زۆر لە گەڕیدەكان باسی برایەتی و تەبایی دەكردن.

هەوڵدانی كورد لەو گاڤەدا بۆ نزیك بوونەوە لە روسەكان، مەترسی گەورەی بۆ سەر ئەڵەمان و ئینگلیزەكان هەبوو، بێگومان دەوڵەتی عوسمانیش لە پاڵ ئەوان. بۆیە لە ساڵی ١٨٩٨ ژمارەیەك لە بەدرخانیەكان گیران، بە گومانی ئەوەی خۆیان بۆ شۆڕشێكی سەرتاسەری تەیار دەكرد، لەنێو ئەوانیش بە پلەیەكی تایبەت عەبدولڕەزاق بەدرخان بە دیاركەوت، كە هەوڵیدەدا پەیوەندی بە روسەكانەوە بكات، چونكە بە پارێزەر و دۆستی كوردیان تێدەگەیشت لە ئایندەدا. [٤٨:١٥٦]. توركەكان بۆ ئەوەی ئەو مەترسیە بنەبڕ بكەن، دەیانویست دوژمنداریەك لە نێوان كورد و روسەكان بگوڕێنن، بە تایبەتی ئەو هۆزانەی لە دەڤەرە سنووریەكان دەژیان. بۆ ئەم مەبەستەش هانیان دەدان سنوورەكانی روسیا ببڕن و لەو دیو، واتە لەناو روسیا ئاژاوە بنێنەوە. روسەكان لە هەمان ساڵدا، ١٨٩٨، دەوڵەتی عوسمانیان لەم بارەیەوە ئاگاداركردەوە. ئەگەرچی توركەكان هەرێ یان پێدان رادەیەك بۆ ئەم جۆرە كارانە دابنێن، وەلێ وەك (زینوڤیف) باڵوێزی روسی لە ئەستانە نووسی : "سوڵتان داوای لە كاربەدەستانی ئەو دەڤەرانە كرد دڵی كوردەكان نەڕەنجێنن!" [٤٥:١٣٦].

وانەبێ كورد تەنیا ئامێرێك بووبن بەدەست لایەنە ركابەرەكان و وەكو تۆپێك بە مگێزی گەمەزانەكان بزوابن، بەڵكو لەپاڵ هەوڵی ئەو لایەنانە كە ئارەزوویان دەكرد چۆنیان گەرەك بێت واكاریان بۆ بكات، خەباتوان و رۆشن هزرانی كورد، رووگەی راستەقینەی بزاڤی

نەتەوەیی خۆیان گوم نەکردبوو، بۆیە دەبینین هەر لەم ساڵەدا یەکەم رۆژنامەی کوردی بە ناوی ((کوردستان)) دەردەچێت، لە پاڵ ئەمەشدا سیاسەتوانانی کورد لە ئەوروپا، بەلاڤۆکیان بلاودەکردەوە و دەیانویست لەو رێگایەوە نەتەوەکەیان هوشیاربکەنەوە. تیایدا باسی ئەوەیان دەکرد چۆن تورکەکان رەنجی ئەوان دەبەن و ستۆکەچیان دەکەن.[١٥٥: ٨٣-٨٤]. دوای ئەمەش لە ساڵی ١٨٩٩ ژمارەیەکی تر لە بەدرخانیەکان گیران، بە تاوانی ئەوەی داوای بلاوبوونەوەی خوێندەواریان دەکرد لە کوردستان ! [٢٤٥: ١٠٢]. ئەوەی جێگای سەرنجە بزاڤی نەتەوەیی کورد، بە گوێرەی سەختی ململانێیەکەو گەورەیی هێز و توانای لایەنە رکابەرەکان، نەدەشیا رۆڵێکی دیار بگێڕێ. یەکەم لەبەرئەوەی کورد قەوارەیەکی سیاسی تایبەت بەخۆی نەبوو، دووەم باری رۆشنبیری کورد لە ئاستێکی نزمدا بوو، سەرباری ئەوەی ژمارەی ئەوانەی رۆشنبیر بوون و خۆیان بە سیاسەتەوە خەریك کردبوو، لە چاو ژمارەی نەتەوەی کورد زۆر کەم بوون. بۆیە لەگەڵ پێلەکانی ململانێیەکە دەلەرینەوە و گەمەیان دەکرد.

ئەو گۆڕانانەی لەسەر تەرازووی هێزە نێو دەوڵەتیەکاندا روویدەدا، وایدەکرد هاوپەیمانیەتیەکان تا سەر نەبن و لە ئاستێکدا سەقامگیر نەبن، بۆ وێنە روسەکان هەرچەندە بەرژەوەندیەکانیان لەگەڵ ئینگلیزەکاندا ناکۆك بوو، ولە ململانێیەکی سەخت دابوون. کەچی فراوان خوازیەکەی ئەڵەمانیا و هەڵزنانیان بەرەو رۆژهەلات بێزاری کردبوون. دەیانزانی هۆکارێکە و دەڤەرەکە بەرەو بارێکی ترسناك دەبات. فەرەنگەکان کەدوای شەڕی یەکیەتی خوازی ئەڵەمانەکان ١٨٧٠-١٨٧١، لە سۆنگەی سیاسەتی ئەڵەمانەکانەوە لاتەریك ببوون، دەیانویست ئەو بێزاریەی روسەکان بقۆزنەوە، بە تایبەتی دوای ئەوەی لە ساڵی ١٨٩٩ جیاوکی پرۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدایان وەدەست هێنابوو. بۆیە هەردوو دەوڵەتی روس و فەرەنگ، لەسەر ئەوە رێکەوتن دەستکاری هاوپەیمانەتیەکەی ساڵی ١٨٩٤ بکەن لە پێناو پاراستنی هاوسەنگی ئەوروپی. هاوکات فەرەنگەکان هەوڵیاندا لە ئینگلیزەکانیش نزیك ببنەوە. [١٢٤: ٩٨]. هەرچی ئینگلیزەکان بوون لەبنەوە تەونی خۆیان دەچنی، وەك لە باسەکەی تر ئاماژەی پێکرا، کاریان بۆ ئەوە دەکرد کلیلی دەریایی ئەو دەڤەرە بگرنە دەست. بۆ ئەم مەبەستە لە ساڵی ١٨٩٩ رێکەوتننامەیەکیان لەگەڵ میری کوێت، موبارەکی کوڕی سەباح گرێدا. بە گوێرەی ئەو رێکەوتننامەیە دەبوایە میری کوێت بەبێ رەزامەندی پێشینەی بەریتانیەکان هیچ نماینەدەیەك، یاخود نوێنەری هیچ دەوڵەت و حکومەتێك، لەکوێت یا لەهەر

شوێنێکی تر لـه چوارچێوەی ئـەو دەڤـەرەدا پێشـوازی نەکـەن. هـەروەها هیـچ پارچەیـەك لـە زەویەکانیان نەبفرۆشن و نەبەکرێ بدەن و نەلەبارتەقای (رهن) دابنێن، یـاخود بەهـەر ئامانجێك بێـت بـۆ وەبـەرهێنان بیـدەن بـەهیچ حکومـەتێك یـاخود هـاوولاتی هیـچ دەسـەلاتێك. [۱۳۱:۱۴۳-۱۴۴]. ئەو ڕێکەوتنە بەدڵی روس و ئەڵمانەکان، تەنانەت فەرەنگەکانیش نەبوو، کە لەو گاڤەدا تارادەیەکی زۆر سیاسەتی هەندەرانی خۆیان بە سیاسەتی روسەکان گرێدابوو، تـا بتوانن بەرپـەچی سیاسـەتی لاتـەریك کردنەکـەی ئەڵمانـەکان بدەنـەوە. روسـەکانیش بەهـەمان چەشن هەوڵیاندەدا جێ پێیەك لە کەنارەکانی رۆژهەلاتی کەنداوی فارس بکەنـەوە. لـە تشرینی یەکەمی ۱۸۹۹ شالیارگەی هەندەرانی عوسمانی، باڵوێزی بەریتانیای لە ئەستانە ئاگادارکردەوە، کە روسەکان لەگەڵ فارسەکان ڕێکەوتوون، بۆ ئـەوەی لەنگـەر گەیـەکیان لەسـەر کـەنارەکانی رۆژهەلاتی کەنداوی فارس بدەنـێ. [۱۲۱:۶۰]. عوسمانیـەکان لـەو هەڵوێسـتەی ئینگلیزەکـان بەرامبەر شێخی کوێت دڵگیربوون. چونکە هیچ بایەخێکیان بە سـەروەریتی دەوڵـەتی عوسمـانی نەدابوو. ئەمە سەرباری ئەوەی ئەڵمانەکان لەپشتەوە هانیـان دەدان! بۆیـە بـاری نێـوان هـەردوو دەوڵەت بەرەو گرژی چوو، تا گەیشتە ئەو رادەیەی خەریك بوو رووبەڕووبوونەوەی سـەربازی رووبدا. وەلێ دواتر عوسمانیەکان ڕێگای دیپلۆماتیکی‌یان گرتەبەر، لـە ٤ ئـابی ۱۸۹۹ سـوڵتان عەبدولحەمید نامەیەکی بۆ باڵوێزی بەریتانی لە ئەستانە نووسی، تیایدا رێزی خـۆی نیشـاندا بـۆ بایەخی کەنداوی فارس بەگوێرەی بەرژەوەندی بەریتانیەکان، وەك ڕێگایەکی بازرگانی لەگـەڵ هیندستان. ئەوەی دەربـڕی کـە ڕێگـا نـادا جگـە لـە بەریتانیـەکان هیـچ دەوڵـەتێکی ئـەورووپی جیـاوکی بازرگـانی لـە کـەنداو دەسـت کـەوێت [۱۱۹:۲۰۳]. لـە راسـتیدا ڕێکـەوتنی بەریتانیەکان لەگەڵ شێخی کوێت پەیوەندیەکی پتەوی بە کوردستانەوە هەبوو! یەکـەمین ئەڵقـە بوو کە ئینگلیزەکان گەرەکیان بوو لە دەوری چالاکی ئەڵمانـەکانی چـێ بکـەن، کـە زۆربـەی کوردستـانی دەگرتـەوە. راستە کـەنداوی فـارس ڕێگـای بازرگـانی ئینگلیزەکـانی دەخسـتە مەترسیەوە، وەلێ ئەو پێداگرتنەی بەریتانیەکان بە درێژایی مێژووی نوێ، لەسەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم، دەربارەی بایـەخی هیندسـتان بـە گوێـرەی بەرژەوەندیـەکانی ئـەوان، زێدەڕۆیی و زلکردنێکی تیایە. وەك پەردە دادانێك بووە بەرووی نیازە راستەقینەکانی ئینگلـیز لە رۆژهەلاتی ناڤین بەگشتی کوردستان بە تایبەتی. واتە ئەگەر ئینگلیزەکان لەرووی دەریاییـەوە چـوار دەوری بازنـە گەورەکـەی رۆژهـەلاتی ناڤینیـان کۆنـترۆل کردبـێ، ئـەوا لـە ڕێگـای کوردستانەوە دەشیان چـەقی بازنەکـەش لـەرووی ووشکانیەوە کۆنـترۆل بکـەن. بـەم لەگوینـە بایەخی کوردستان بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئینگلیز لە رۆژهەلاتی ناڤین هەرگیز لە بایـەخی

هیندستان کەمتر نەبوو ! هەر لەو سۆنگەیەش بوو لە ساڵی ١٨٩٩ ماوەیەك ململانێ لەسەر دەروازەی دەریایی کوردستان بوو لە باشور، چ لە رۆژئاوا کە دەیکردە کوێت، چ لە رۆژهەڵاتەوە کە دەیکردە کوردستان، لە ناوچەی لوڕەکان، کە بەشێکی گەورە و گرنگی کوردستانن*. ئەڵمان و روس و ئینگلیزەکان بەهەموو توانایەك هەوڵیاندەدا جێ پێی خۆیان لەو دەڤەرەدا بکەنەوە و پتەوی بکەن. تورکەکان بە پاڵپشتی ئەڵمانەکان لەسەر ئەم دەڤەرەدا لە کێشمەکێشم و ململانێ دابوون، بۆیە دەیانویست سنوورەکانی باکوریان لەگەڵ روسەکان هێوربکەنەوە. بەو نیازەش کەوتنە هەوڵی خۆ نزیك کردنەوە لێیان، روسەکانیش ئەمەیان بەدڵ نەبوو، چونکە لە لایەك دەیانویست بەرژەوەندیەکانیان لە باشور وەدەست بێنن، لە لایەکی تر وابکەن جیاوکی هێڵەکانێ ئاسنی نزیك قەوقاز کە دەیکرد کوردستان لەبن دەستی ئەڵمانەکان دووربکەنەوەو بۆ خۆیان بێت، یاخود ئەگەر هەرنەبێ رێگا لە هەڵزنانی ئەڵمانەکان بگرن بەرەو ئەو دەڤەرە. بۆیە لێژنەیەکیان لە هەردوو دەوڵەت، واتە عوسمانی و روس پێکهێنا، بەو مەبەستەی هەراو شەڕ و ئاژاوەکانی سەر سنوور نەهێڵن، هەرچەندە ئەو لێژنەیە ئەنجامی نەبوو، وەلێ لەسەر ئەوە رێکەوتن ژمارەی هێزەکانیان لەسەر سنوور کەم بکەنەوە. [٤٥:١٣٧]. لەو گاڤەدا تورکەکان گەرەکیان بوو لەگەڵ ئێرانیەکانیش سنوورەکانیان ئارام بێت. چونکە ئەنجامدانی پڕۆژەی هێڵی شەمەندەفەری بەغدا پێویستی بە ئارامی و سەقامگیری بارەکە هەبوو.

ئینگلیزەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم پلانانە نەدەشیان دەستەوەستان دانیشن، بۆیە ئەوانیش هەوڵیاندا سوود لە کورد وەربگرن، عوسمان پاشای بەدرخانیش بۆ مەبەستەکانی ئەوان

---

* لەبەرئەوەی ئەو دەڤەرە دەروازەیەکی دەریایی گرنگی کوردستانە، دوژمنانی کورد هەمیشە هەوڵیانداوە لوڕەکان کە لقێکی گەورەی کوردن، لە کورد دابڕن و بەکوردی نەژمێرن، مەبەستیشیان نەهێشتنی ئەو دەروازە دەریاییە بووە کە بایەخێکی ژیاری و ستراتیژی بۆ کوردستان هەیە. شایانی باسە لوڕەکان دانیشتووی باشوری رۆژهەڵاتی کوردستانن، لوڕستان "بریتیە لەو هەرێمە چیاییەی لە کەوانەی چیای زاگرۆسەوە خۆی دەنوێنێ، سەرەتا لە چیاکانی کرماشان لە باکورەوە هەتا گۆشەی باکوری رۆژهەڵاتی کەنداوی فارس درێژدەبێتەوە. لوڕەکان پێنج هۆزی گەورە پێکدەهێنن، لەوانە بەختیاریەکان. کرزن سنووری ئەو هەرێمەی بەو چەشنە کێشاوە. لوڕستان ئەو پشتێنە چیاییە ناوخۆییە دەگرێتەوە کەلە دەشتی دەم دیجلەو چیاکانی سنووری عێراق و ئێران لە رۆژئاواوە، لە رۆژهەڵاتیشەوە دەگاتە سنووری ئەسفەهان و فارس. لە باکوریشەوە لە ویلایەتی کرماشان و هەمەدانەوە تا دەشتەکانی خوزستان لە باشور درێژدەبێتەوە. روبەری ئەو هەرێمە خۆی لە ١١,٠٠٠ کم٢ دەدا" [٩٠:٦٩].

کەسێکی لەباربوو. عوسمان پاشا لە ساڵی ۱۹۰۰ لە سلانیك چووە لەندەن، لەوێ ڕۆژنامەی ماتین Matin چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ سازکرد، عوسمان پاشا لە چاوپێکەوتنەکەدا ڕایگەیاند کەوا چەند ساڵێکە بەبێ ووچان کۆشش دەکات بۆ ئەوەی کورد و ئەرمەن لە یەکتر نزیك بکاتەوە. تا بەرەنگاری جەور و ستەمی سوڵتان و پیاوانی ببنەوە، هەروەها ئەوەشی ڕاگەیاند کەوا کورد و ئەرمەن بەنهێنی چەکدارکراون و چاوەڕێی فەرمانی ئەو دەکەن. هێرشێکیان لەبەردەستدایە هێندە بەترس و کاریگەرە مێژووی عوسمانیەکان بەخۆیەوەی نەدیوە [۱۵۵:۱٤۱]. بێگومان بڵاوکردنەوەی ئەو جۆرە چاوپێکەوتنانە چاوسوورکردنەوەیەك بوو لە دەوڵەتی عوسمانی، هەردوای ئەو گەف کردنەش، لە ئابی ۱۹۰۱ کەشتیگەلیە جەنگیەکانی بەریتانیا گەیشتنە کوێت، ڕایانگەیاند هەرچەندە بەریتانیا پاراستنی خۆی لەسەر کوێت ڕاناگەیەنێ، وەلێ بەهەموو شێوەیەك بەرگری لە کوێت دەکات دژی هەر دەستدرێژیەك، ئەگەر بگاتە ڕادەی چەك بەکارهێنانیش. [۱۱۹:۲۱۰].

تا ئەو دەمانەش ئینگلیزەکان مەبەستی سەرەکیان ئەوەبوو مەترسی ڕوسەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین نەهێڵن، یاخود کەمی بکەنەوە، هاوکات ڕێگای ئەوەیان لێ بگرن لە ئەڵمانەکان نزیك ببنەوە. کاودانەکەش لەبەرژەوەندی ئەواندابوو. چونکە دوای ئەوەی شەڕەکانیان لە باشوری ئەفەریکا دیماهی هات، هەڵوێست لەبەرژەوەندی ئەواندا شکایەوە. هەر بەهەمان مەبەست، لە ۳۰ کانونی دووەمی ۱۹۰۲ ئینگلیزەکان هاوپەیمانیەتیەکیان لەگەڵ ژاپۆنیەکان گرێدا. ئەم گۆڕانانە کاریگەری زۆریان لەسەر سیاسەتی هەندەرانی بەریتانیەکان هەبوو، چونکە لە ڕۆژهەڵاتی دوور تای تەرازووەکە لە بەرژەوەندی ڕوسەکاندا نەما.[۱۲۱:٦٥-٦٦]. ئەو هاوپەیمانەتیە ژاپۆنی - بەریتانیە، هێندە کاریگەر بوو، تا ئەو ڕادەیەی هەندێك بەسەرەتایەکی نوێی دادەنێن بۆ دیپلۆماتیکی نێو دەوڵەتی! وەکو بەرپەچدانەوەیەکی سیاسەتە جیهانگیریەکەی ئەڵمانەکان. هەروەها سەرەتایەك بوو بۆ سیاسەتی بەخۆوەگرتنی ئەڵمانەکان. لەگەڵ ئەوەش ئەڵمانەکان وای تێ نەگەیشتن، بگرە ئیمپراتۆر و شالیارەکانی پیرۆزبایان لە یەکترکرد، بەو پێیەی شیاون لە تەڵەی ئینگلیزەکان دەربازبن و ڕوس و ئینگلیزیش بۆ هەتا هەتایە ڕقیان لەیەکتربێتەوە. [۱۲٤:۱۰۱]. هەرچی ڕوسەکان بوون لە نیازی ئینگلیزەکان گەیشتن بۆیە هەوڵیاندا خۆیان لە ئەڵمانەکان نزیك بکەنەوە. واتە ئەو پێنگاوەیان نا کە ئینگلیزەکان زەندەقیان لێی چووبوو. لە ئایاری ۱۹۰۳ شالیاری هەندەرانی بەریتانیا ڕاگەیاندنە بەناوبانگەکەی بۆ ڕوس و ئەڵمانەکان ڕاگەیاند و گوتی :

"بەریتانیای مەزن دروست بوونـی هـەر هێزێکی تـر بـە گـەفێکی ترسـناك دەزمێرێ بـۆ سـەر بەرژەوەندیـەکانی خۆی. بۆیە بە هەموو ئـامرازێکی کـە هەیـەتی بـەرگری لـە بەرژەوەندیـەکانی خۆی دەکات" [٧١:١٣١]. ئەوەی مەترسی بەریتانیەکانی زێتر دەکرد لەو گاڤـەدا ئەڵمانـەکان بە گەرمی کەوتبوونە خۆ بۆ دامەزراندنی کەشتیگەلیە جەنگیەکـەیان، خاترجـەم بـوون کـە ئـەو پێنگـاوە سەرئێشـەیان بـۆ چـێ دەکـات. چونکـە ئەگـەر ئـەو پرۆژەیـەی ئەڵـەمان سـەرکەوتنی وەدەسـت هێنابوایـە، ئـەوا تیـوری بـاڵا دەسـتی بـێ هاوتـای هـێزی دەریـایی بەریتانیـەکانی تێکدەشکاند [٣٤٩:٢١٧]. بۆیە لە بەریتانیا نائارامیەك سەبارەت بە سیاسـەتەکانی ئەڵـەمانیا و مەرامەکانی هەست پێدەکرا. [١٠٧:٣٤٤].

لەم پێواژۆکەدا بەریتانیـەکان سـەرداری کـەنداو بـوون بـەبێ هاوشـان. ئـەو ڕێگایـەش پێویستی بە پاراستن هەبوو. نەك تەنیا بۆ دەڤەرە دەریاییەکـە بـەڵکو بـۆ هـەموو ئـەو دەڤەرانـەی دەریای سپی و دەریای سوور و کەنداوی فارسی بەیـەکتر دەبەستەوە [٢٥٣:٣٩–٤٠]. واتـە کوردستان بەشێکی سەرەکی و گرنگی ئەو دەڤەرانەی پێکدەهێنا کە ئەرکی پاراستنی کـەوتبووە ئەستۆی کەشتیگەلی بەریتانی.

سـەرباری ئـەو هەوڵانـە، ئینگلیزەکـان گـەرەکیان بـوو فشـار بخەنـە سـەر ئـێرانی و عوسمانیەکان، تا لە ڕێگای ئەوانەوە دەست لە بەرژەوەندیـەکانی روس و ئەڵەمانـەکان بوەشـێنن. بۆیە دەیانویست بزاڤی کوردی دژی روسەکان ئاڕاستە بکەن، هاوکات پەرە بە نـاکۆکی نێـوان کورد و ئەرمەن بدەن. بەتایبەتی دوای هاوپەیمانیەتی ژاپۆنی – بـەریتانی، پروپاگـەندەی توندیـان دژی روسەکان دەکرد، هەواڵی شکستەکانیان بەرامبەر ژاپۆن لـە سـاڵی ١٩٠٤ بـە فراوانـی لـە کوردستان بڵاودەکردەوە. [٥٣:١٥٦]. هەروەها بۆ زێتر پتەوکردنی جێ پێی خۆیان، سـیخوڕ و چاوساغەکانیان لە کوردستان بە بەردەوامی لەکاردابوون. لەبن چەندین پەردەدا دەهـاتن، وەك بازرگـان و گـەڕیدە و گەشتیار و میسـینێر. ئینگلیزەکـان لـەم بـوارەدا تـەنیا نـەبوون بـەڵکو هێزەکانی تریش بە هەمان چەشن! بۆیە کوردستان بـوو بـە گۆڕەپـانی چاوسـاغی و سیخوڕی. بێگومان ئەمەش کاریگەری خـراوی لەسـەر کـورد و کوردسـتان هـەبوو، زۆرجـاران ئـەژواری گەورەی دەنایەوە. بۆ وێنە لە ٨ مارتی ١٩٠٤ میسینێری ئەمەریکی لابـاری Benjamin B. Labaree و هاوکارەکـەی لـە ناوچـەکانی بـاکوری رۆژهـەڵاتی کوردسـتان بـە دەسـتی هـۆزە کوردەکان کوژران، ئەمەش لە ئەنجامی ئەو چالاکیە فراوانەبوو کە بۆ دیانچیەتی دەیکرد. ئێران نەشـیا بکوژانـی دەسـتگیربکا، ئەمەریکاییـەکان بـە راوێژکـردن لەگـەڵ بەریتانیـەکان

یاداشتنامەیەکی ناڕەزایی یان بۆ حکومەتی ئێران بەرزکردەوە، داوایان لێکرد دەست بەجێ کارێك بکات دژی ئەوانەی پلانیان بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە دانابوو. [٦١:٩٥]. ئەم رووداوە بە جۆرێکی وا گەورەبوو هەردوو دەوڵەت، ئێرانی و عوسمانیەکان هێزیان بەرامبەر یەکتر خرکردەوە. شەڕکردنی ئەم دوو دەوڵەتە لەو کاتەدا لە بەرژەوەندی روسەکاندا نەبوو، چونکە نەیاندەتوانی لەیەك کاتدا لە دوو بەرەدا بجەنگن، واتە بەرەی ژاپۆن و بەرەی رۆژهەڵات، بۆیە چەند ئامۆژگاریەکیان بۆ ئێرانیەکان نارد، تیایدا سیاسەتی خۆیان روونکردەوە، وایان نیشاندا کە سیاسەتی ئەوان بە بەردەوامی ئەوەیە ئەو ئەژواریانە چارەسەربکەن، بەمەرجێك ئینگلیزەکان لووتی تێوە نەژەنن. [١٥٢:٤٥]. ئەگەر ئینگلیزەکان لە ناوەوەی کوردستان وا چالاکانە کاریان دەکرد، ئەوا لە چواردەوری کوردستانیش لە رێگای رێکەوتننامە و هاوپەیمانیەتیەوە بەردەوام بوون لە چنینی ئەو پشتێنەی کە گەرەکیان بوو لە چواردەوری بازنە گەورەکەی کوردستانی چێ بکەن. لە نیسانی ١٩٠٤ رێکەوتننامەیەکیان لەگەڵ فەرەنگەکان مۆرکرد. ئەمەش مەترسی زێدەبوونی نفوزی ئەڵەمانەکانی لە دەریای سپی دوور خستەوە و هەڵوێستی بەریتانی بەهێز کرد. ئەڵەمانەکان لە نیازی شاراوەی ئینگلیزەکان گەیشتن، بۆیە بانگهێشتی روسەکانیان کرد بۆ ئەوەی هاوپەیمانیەتیەکیان لەگەڵ گرێ بدەن. لەمەشدا مەبەستیان ئەوەبوو هاوپەیمانیەتیەك دژی ئینگلیزەکان چێ بکەن. وەڵێ فەرەنگەکان دژی ئەو هاوپەیمانەتیە وەستان. گەفیان لە روسیا کرد ئەگەر ئەو کارە ئەنجام بدا هەموو یارمەتیەکی ئابووری لێدەبڕن. روسیا دۆستایەتی فەرەنگەکانی لەکن پەسندتربوو، بۆیە داوای ئەڵەمانەکانی پشتگوێ خست [٢٩٧:١٦١]. بەم چەشنە ئینگلیزەکان لە رێگای ئەو رێکەوتننامەیان لەگەڵ فەرەنگەکان توانیان دووەم دەروازەی دەریایی ئەو ناوچەیە، کە دەروازەی دەریای سپی ناڤین بوو لە رووی ئەڵەمانەکان دابخەن و بۆ خۆیانی مسۆگەربکەن، ئەمەش وای لێکردن ئازادانەتر و بە باڵادەستی زێتر لە ناوەوەی بازنەکە رەفتاربکەن. بۆیە لەگەڵ ئەمەریکاییەکان فشاری زێتریان خستە سەر ئێران بۆ ئەوەی بکوژانی میسینێر بنیامین لاباری بەدەستەوە بدەن. لەم کاودانەدا، لە ساڵی ١٩٠٥ ئێران ناچاربوو هێزێك بنێرێت بۆ بەدواداچوونی بکوژانی بنیامین کە رایانکردبووە باکوری کوردستان. ئەو هێزانە چوونە ناو سنووری عوسمانیەکان، ئەمە بووە ئەگەری زیاتر بەیەکاچوونی سنووری لە نێوان ئێران و عوسمانیەکان [٦٢:٩٥]. تورکەکان هێرشیان کردو چەند دەڤەرێکی تری رۆژهەڵاتی کوردستانیان بن دەستکرد. کوردەکانی ئەو دەڤەرانە دژی تورکەکان جەنگان، پێ یان وابوو روسەکان ئێران دەپارێزن و ئەوانیشیان لە تورکەکان بە ئەمەکتر دەزانی، ئەو تورکانەی کە هەمیشە باجی نوێیان لەسەر زێدە دەکردن. [١٥٦:٨٥].

کورد بە شێوەیەکی گشتی دژی ڕەفتاری هۆڤیانەی تورکەکان بوون. بۆیە لە ساڵی ١٩٠٥ کاتێك ڕاپەڕینی دەرسیم ڕوویدا، لە لایەن کورد و ئەرمەنەکانەوە پشتگیری کران [٥٧:١٥٥].

ئاژاوە و پەشێویەکانی کوردستان دەستی ئەڵەمانەکانیشی تیابوو، گەرەکیان بوو لەو گاڤەدا باری نائارامی ناوەخۆی ڕوسیا بقۆزنەوە. تا جێ پێی خۆیان پتەوتر بکەن، کە ئەمە ڕوس و ئینگلیزەکانی هەراسان کرد، چونکە پلان و داوەکانی ئەڵەمان بۆ خۆتێ هەڵقورتاندن لە کاروباری کوردستان و هەڵتەکاندنی پلەو پایەی ڕوس و ئینگلیز لەو شوێنە ستراتیژیە، کاریگەریەکی زۆری لەسەر سوڵتان عەبدولحەمید هەبوو. [٦٢:١٥٦]. ئەمە ئەوە ڕووندەکاتەوە، کە هەرچەندە شەڕ و ئارامی لە کوردستان بەدەست کورد نەبووە، کەچی هەمیشە کورد باجەکەی داوە. ئەو ململانێیەی نێوان زلهێزەکان کەخۆی لە شەڕەکانی تورك و فارس دەنواند، کوردیان دوچاری کاودانێکی زۆر سەخت کرد. برسیەتی و قات و قڕی زۆر ناوچەی کوردستانی گرتەوە. تەنانەت لەهەندێك شوێنی کوردستان تورکەکان کچی کوردیان لەجیاتی باج وەردەگرت و لەبری موچە دەیاندا بە فەرمانبەرەکانیان ! [٥١:١٩٣]. لە دەڤەرێکی وەکو هەمەدانیش کۆلێرا بە لەگوینێکی واسەخت بڵاوبووەوە، شارەکەی تووشی مەترسیەکی زۆر گەورە کرد، ڕۆژانە بەسەدان خەڵك گیانیان لەدەست دەدا، دەوڵەمەندەکان بۆ خۆپاراستن لەو پەتایە شاریان جێ دەهێشت و بەرەو دەڤەرە چیاییەکان دەڕۆیشتن. لە گوندی شاڤارین Savarin، کە چوار میل لە باکوری ڕۆژهەلاتی هەمەدان بوو، بارەکە لەهەموو شوێنێك سەختتر بوو. [٨٨:١٥٩].

لە سۆنگەی سەرکەوتنی تەزاریەکان بەسەر شۆڕشی ناوەخۆی ڕوسی ١٩٠٥، ڕوسەکان لەو ململانێیەدا، هەمدیس ڕۆڵیان بەرزتر بۆوە. زێتر لە جاران بایەخیان بە کوردستان دا، گەرەکیان بوو کورد بەلای خۆیاندا ڕابکێشن، تا ڕاپەڕینێك لە باشوری کوردستان و لە دەرسیم بەرپابکەن. لەو ڕێنماییانەی کە لە ١٤ تشرینی یەکەمی ١٩٠٦ بۆ سەرۆکی ئەرکانی گشتی لە قەوقاز نێردراوە، هاتووە: "کە بایەخ بە سوپای حەمیدی و ژمارەیان و شوێنی کۆبونەوەیان بدرێ" [٥٣:١٥٦]. ئەگەرچی ڕوس و ئینگلیزەکان لەو کاتەدا تادەهات زێتر لەیەك نزیك دەبوونەوە، لەگەڵ ئەوەش نەیاندەویست لەگەڵ ئەڵەمانەکان ڕووبەڕوو ببنەوە. وەلێ لەبەرئەوەی ئەڵەمانەکان بەگەرمی کەوتبوونە خۆ بۆ ئەوەی هێڵێکی کەشتیەوانی لە نێوان بەندەرەکانی خۆیان و کەنداوی فارس دابمەزرێنن. هەر لە ساڵی (١٩٠٧)یش بانکی ئەڵەمانی کۆمەڵێك جیاوکی پارە لێدان و هی تریان لە ئێران وەدەست هێنا، ئەمە وایکرد

ڕووبەڕووی بەرهەڵستیەکی توندی ڕوس و ئینگلیزەکان ببنەوە، [٣١٧:١٦٨-١٦٩]، بەتایبەتیش ئینگلیزەکان، بۆیە لە ٥ ئایاری ١٩٠٧ ئاگاداری نامەیەکیان دا بە ئەڵەمانەکان. هەروەها شالیاری هەندەران لە کۆبونەوەیەکی جڤاتی لۆردان (مجلس اللوردات) گوتی: "دامەزراندنی پایەگای دەریایی یاخود بەندەری پتەو لە کەنارەکانی کەنداوی فارس لە لایەن وولاتێکی بێگانەوە، گەفێکی توندە بۆ بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا لەم کەنداوە، بۆیە ئێمە بەهەموو توانایەکمانەوە بەرەنگاری دەبینەوە" [٣١٧:١٦٨-١٦٩]. ئەم هۆکارانە ڕوس و ئینگلیزەکانی زێتر لەیەك نزیك کردەوە. لە مانگی ئابی هەمان ساڵدا ڕێکەوتننامەیەکیان مۆرکرد. لە ڕاستیدا ئەو ڕێکەوتننامەیە بە گوێرەی کوردستان بایەخێکی گەورەی هەبوو، چونکە بەر لەهەموو شتێك دیماهی بە رکابەرایەتی نێوان عوسمانی و ئێرانیەکان هێنا، ئەو ڕکابەرایەتیەی مانەوەی عوسمانیەکانی دابین کردبوو [٣١٣:٧٨]. سەیر لەوەدابوو کە هەرچەندە ئەو ڕێکەوتننامەیە باسی سەربەخۆیی و سەلامەتی ئێرانی دەکرد، کەچی ئێرانیەکان لە مافی بەشداریکردن و ڕاوەگرتن بێ بەش کردبوو، ئەمە سەرباری ئەوەی دەسەڵاتی حکومەتی ئێرانی لە ناوچەی نفوزی هەردوو دەوڵەت کزکردبوو [٣١٤:١٧]. لەم بارەیەوە **ئارثەر** نیکسۆن کە یەکێك بوو لەوانەی بەشداری دانوستانەکانی ئەو ڕێکەوتننامەی کرد، گوتی: ئاشکرابوو سوودی پاراستنی سەربەخۆیی و سەلامەتی ئێران و ئەفغانستان لە بیانگەیك زێتر بوو، تا ئەگەر بیانگەیەکیش بوایە، ئەو بەرپرسیاریێتی یەمانی بۆ دەردەخست، کە دەمانی گەیاندە هیواکانمان. [٢٥٣:٣٧]. بە گوێرەی ئەو ڕێکەوتننامەیە ئێران کرا بە سێ ناوچە، ناوچەی نفوزی ڕوسەکان لەسەرەوە، لە خواریشەوە ناوچەی نفوزی بەریتانیەکان، بەشی ناڤینیش ناوچەیەکی بێلایەن مایەوە. واتا ناوچەیەکی ئازاد بۆ بازرگانی هەردوولا. کەواتە دەتوانین ئەم پارڤە بوونە بە سەرەتایەك بۆ پارڤەکردنی نوێی کوردستان لە قەڵەم بدەین لە سەدەی بیستەمدا. ئینگلیزەکان لە ژێری و ڕوسەکانیش لە ژووری، لەپێناو بەرژەوەندیەکانی خۆیان گەرەکیان بوو هەر چۆنێك بێت دڵی کوردەکان ڕابگرن. لە ناوچەی ناڤینیش لەبەرئەوەی حکومەتی ئێران هێندە بێ هێز ببوو، دەشێین ئێژین ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەو ڕۆژانەدا نیمچە ئازادیەکی بەخۆوە دەبینی.

بایەخی ئەم ڕێکەوتننامەیە لەلایەنی نێو دەوڵەتیی و هاوپەیمانیەتیەوە ئەوەبوو دوا ئەڵقەی ئەو پشتێنەیە بوو کە ئینگلیزەکان بۆ ئابلووقەدانی ئەڵەمانەکان کاریان بۆ دەکرد. دەروازەی دەریای سپی لە ڕۆژئاواوە لەبن دەستی فەڕەنگە هاوپەیمانەکانیان بوو، کەنداوی فارس لەژێری لەبن کۆنترۆلی خۆیاندا بوو، دەمایەوە باڵی باکور و ڕۆژهەڵاتی ئەو بازنەیە، کە دەیکردە ئێران و سنوورەکانی ڕوسیا، ئەویشیان لە ڕێگای ئەو ڕێکەوتننامەیە دابین کرد. بەم لەگوینە دەبینین

لەگەڵ ئابڵوقەدانی ناوچەی چالاکی ئەڵمانەکان، کوردستانیش ئابڵوقـەدرا،تـەنیا رۆچنەیـەکی کـەم مایـەوە لـە ناوچـەی بێلایـەن ئەڵمانـەکان دەشـیان دژەی تیابکـەن و دەسـت لـە بەرژەوەندیەکانی ئینگلیزەکان بوەشێنن لـە هیندستان. ئـەو ناوچـە بێلایەنـەش بەشێکی زۆری رۆژهەڵات و باشوری رۆژهەڵاتی کوردستانی دەگرتەوە. پشکی ئینگلیزەکان لەم رێکەوتننامەیـە لە پشکی روسەکان کەمتر بوو. وەڵێ دەڤەرێکی پەترۆلی و سـتراتیژی گرنگیـان کەوتـە دەسـت. لەگەڵ ئەوەش هەندێك پێیان وابوو ئـەو رێکەوتننامەیـە هیـچ سـوودێکی بـەریتانیای تیانیـە ! چونکە ناوچەی نفوزی روسەکان کرماشان و ئەسفەهان و تـارانی پێتـەختی ئێرانیشـی گرتـەوە، ئەگەر پەترۆڵمان لـێ دەرهاویشتایە، ئەوا زۆربەی سەرچاوەکانی تـری سـامان دەکەوتـە دەڤـەری نفوزی روسەکانەوە. [١٧٢ : ٧٠]. هەربۆیە نوێنەری ئەمەریکاییەکان لـە تـاران دەربـارەی ئـەو رێکەوتننامەیە نووسی : "وورچی روسـی پشـکی شـێری بەریتانیـەکانی وەرگـرت" [٩٥:٧٦]. هەرچەندە پشـکی ئینگلیزەکـان کـەم بـوو، وەڵێ ئـەوان دوو ئامـانجی گرنگیـان پێکـا. لەلایـەك مەترسی روسەکانیان لە کەنداو دوورخستەوە، لە لایەکی‌تر ئابڵوقەی چالاکی ئەڵمانـەکانیاندا. کەچی سەرباری ئەو رێکەوتننامەیەش بەریتانیەکان هێشتا متمانەو باوەڕیان بە روسەکان نـەبوو. ئەمەش لەو راپۆرتەدا دەردەکەوێ کە لـە سـاڵی ١٩٠٨ پێشکەشـی پەرلـەمان کـرا، کـە تیـایدا هاتبوو: "باشتر وایە حکومەتی خاوەن شکۆ ئەوە لە یـاد نـەکا ئەگـەر ئـەم جـۆرە رێکەوتننامەیـە روسەکان لە ناوەڕاست و باشوری ئێران دووربخاتەوە و نەهێڵی لەو رێگایـەوە بگەنـە کـەنداوی فارس، ئەمە بۆ یەك چرکە روسەکان گیرۆ ناکات، بەڵکو پەلەشیان لێدەکـات لـە رێگـای دۆڵـی فـورات و بـەغداوە بـەرەو هـەمان ئامـانج بـڕۆن" [١٧٧:٢٥٦]. ئـەو ترسـەی ئینگلیزەکـان تارادەیەکی زۆر ئەندێشەیی و بێ بناغە بوو، چونکە ئەگەر روسەکان ئـەو رێگایـەیان بگرتایـە، رووبـەڕووی عوسمانیـەکان و بـەرژەوەندی ئەڵمانـەکان دەبوونـەوە. ئەمـەش لـە بـەرژەوەندی ئینگلیزەکان خۆیاندا بوو! بێگومان سیاسەتوانانی ئینگلیز دەبێ حسێوێکیان بـۆ ئـەم لایەنـەش کردبێ!

بـەم جـۆرە شـوێنی کوردسـتانمان لـە پـەیوەندی و هاوپەیمانەتیـە نێـو دەوڵەتیـەکان بـۆ دەردەکەوێ. مینۆرسکی ئەم بایەخەی بە شێوەیەکی زۆر وورد دەست نیشان کـردووە کـاتێك نووسیویە: "کورد نیشتەجێی ئەو ناوچەیەن چـوار دەوری بـاکوری میسـۆپۆتامیای داوە، هیـچ گومانێکیش لـە پێشـوەچوونی ئـابووری و بایـەخی سیاسـی بـاکوری میسـۆپۆتامیادا نیـە، کـە بۆخۆی مەڵبەندی گەلێك دیاردەی کاریگەرە. هەرلایەك هێڵی شەمەنـدەفەر دروسـت بکـات،

ئەو هێڵە هەردەبێ بەوێدا تێپەڕێت. ئەوێ شوێنی پێشبڕکێی بازرگانی ئەوروپایی و شانۆی نەریتی تورك و ناوچەی بزاڤی جیابوونەوە خوازی عەرەب و لە کۆتایشدا هەرێمی بڵاوبوونەوەی ئێمەیە لە باکورەوە. هەموو هەوڵێکیش بۆ چەسپاندنی ئەو دیاردانە دەبێتە هۆی قوتبوونەوەی کێشەی کورد بەهەموو تواناوە. کورد تەنیا دیوارێك لەنێوان باکور و باشوری ناوچەکە پێکناهێنێ، ئەوان بەرەو ڕۆژهەڵات تاقوولایی ئێران و هەموو بانی ئەرمەنستان و تا ناوچەکانی سنووری روسیا دەکێشن. لەبەرچاو گرتنی ئەم دیاردانەو دابینکردنی ژیانێکی ئاسوودە و هێمن بۆ ئەو کوردانە بریتییە لە یەکێك لەگرێ هەرەگەورەکانی دوارۆژ لە ئاسیای نزیکدا" [٤٥:١٢٦].

ڕێکەوتننامەی ١٩٠٧ گۆڕانێکی بەسەر سیاسەتی نێو دەوڵەتیی داهێنا. ئەڵمانەکان لەو ساڵە بەدواوە کەوتنە هەوڵی ئەوەی ئەو پشتێنەیە بشکێنن کە ئینگلیزەکان ئابڵووقەی چالاکیەکانی ئەوانیان پێدابوو، ئەو جموجۆڵەی ئەڵمانەکان دەیاننواند بۆ ئەو مەبەستە، بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ئێرانەوە، روس و ئینگلیزەکانی خستبووە ترس و گومانەوە. ئەڵمانەکان گەرەکیان بوو رقی ئێرانیەکان بەرامبەر ئەو ڕێکەوتننامەیە بقۆزنەوە، کە خودی ڕێکەوتننامەکە خۆشی ئەنجامی زیدەبوونی نفوزی ئەڵمانەکان بوو. چونکە لەو ماوەیەدا دەوڵەتی عوسمانی، کە بە تەواوی کەوتبووە بن کاریگەری ئەڵمانەکانەوە، لە ساڵانی ١٩٠٥-١٩٠٧ توانیبوویان ناوچەیەکی زۆری ڕۆژهەڵاتی کوردستان داگیربکەن. [٢٨:٨٥]. هەربۆیە وەك هرشلاغ دەڵێ: لە دوای ئەو ڕێکەوتننامەیە ئەستەنگ دەبێت سەیری چالاکی و بەرژەوەندی بێگانەکان بکەین لە ئیمپڕاتۆریای عوسمانی، بەبێ ئەوەی باسی مێژووی فارسی هاوسێی بکەین [٧١:١٧٩].

نزیك بوونەوەی روس و ئینگلیز، سەرباری ئەوەی بووە سۆنگەی پارچەبوونی کوردستان و ئێران، زەندەقی عوسمانیەکانیشی برد. لە ٩و١٠ حوزەیرانی ١٩٠٨ کاتێك کۆنگرەی (ریڤال – Rival) لە نێوان ئەدواردی حەوتەم پاشای ئینگلیز و تەزاری روس نیکۆلای دووەم گرێدرا، تورکەکان لەوەترسان ئینگلیزەکان بەرامبەر هەندێك چاوتێبڕینەکانی روس لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین بەرهەڵستی نەنوێنن. [١٣٢:١٤٧]. کە ئەمەش هانی روسەکانی دەدا بۆ ئەوەی دەستدرێژی بکەنە سەرئەوان و ئەو ناوچانە داگیربکەن کە چاویان لێی بوو، زۆربەی ئەو ناوچانەش دەکەوتە باکوری کوردستان.

ئەڵمانەکان بۆ شکاندنی ئەو ئابلووقەیەی ئینگلیزەکان بەسەریاندا سەپاندبوون دوو ڕێگایان گرتەبەر، لەلایەك خۆیان لە ئێران نزیك کردەوە، بۆ ئەو مەبەستەش کۆلیژێکی نوێیان لە ئێران کردەوە و مامۆستای ئەڵمانیش وانەیان تیا دەگوتەوە، بەمەش سەرکەوتنی گەورەیان وەدەست هێنا لە چوونە ناوەوەی ناوچەی نفوزی بەریتانی و ناوچەی بێلایەن. [١٤٥:١٥٧]. لەلایەکی تر هانی عوسمانیەکانیان دا بۆئەوەی پەلاماری ئێران بدەن و ئاژاوە بنێنەوە. بۆیە عوسمانیەکان سەرلەنوێ هێرشەکانیان دەست پێکردەوە. لە کانونی دووەمی ١٩٠٨ گەمارۆی مەهابادیان دا. لە شوباتی هەمان ساڵدا شارەکەیان بن دەستکرد. ئەگەرچی دوای سێ هەفتە چۆڵیان کرد. [١٩٤:٤٥]. ئەمەش وای لە روسەکان کرد وەکو کونسوڵەکەیان لە تەوریز گوتی : "بە پلەی یەکەم نفوز و دەسەڵاتیان لەسەر دانیشتووە کوردەکان بەهێزبکەن، تا بەگوێرەی ئارەزووکانی خۆیان بەکاریان بێنن" [١٥٦:٦٠].

لە تەموزی ١٩٠٨ تورکە لاوەکان کودەتاکەیان بەرپاکرد، کە ئەمە کت و مت بە دڵی ئینگلیزەکان بوو، روسەکانیش مگێزیان لێبوو، کوردیش ئەو کودەتایەیان بە رۆچنەیەك زانی کەتیایدا خۆری ئازادیان بگاتێ. بلەج شێرکۆ گوتەنی : "خەڵکی بەهەموو مانای ووشەوە چاوەڕوانی ئەوەبوون لەسەر دەستی نەوەکانی مەغۆل دەوڵەتێکی دیموکرات و هاوچەرخ دامەزرێ !" [١١:٥٤]. وەڵێ هەر مانگەکانی دوای کودەتاکە دەنگی ناڕەزایی لەنێو کوردان بەرزبووەوە، چونکە تورکە لاوەکان لە چەوساندنەوەو جەور و ستەمی زێتر هیچی تریان بۆ کورد پێنەبوو. بە ماوەیەکی کەم ئەو رۆژنامانە داخران کە لەلایەن کوردەکانەوە دەردەچوو، هاوکات کرداری راگوێزانی کورد بۆ ئێران بەرەو زێدەبوون چوو. بۆیە ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان داوای پارێزگارییان لە روس کرد. تەنانەت عەشیرەت هەبوو بەتەواوی رەگەزنامەی روسیان قبووڵ کرد [١٥٦:٦٩]. لە هەمان کاتدا لە زۆر دەڤەری کوردستان راپەڕین دایسا، وەك دەڤەرەکانی دەرسیم بارزان و ناوچەی سلێمانی. بەم چەشنە باری ناوەخۆی عوسمانیەکان بەشلەژاوی مایەوە، ئیتحادیەکان بۆ ناردنە دەرەوەی ئەژواریەکانیان باری شلەژاوی ئێرانیان بەهەلزانی، کە لە سایەی شۆڕشی دەستوری دوچاری ببوو، لە ساڵی ١٩٠٩ هێزەکانیان سەرلەنوێ ئەو دەڤەرانەیان گرتەوە کە مشت و مڕیان لەسەر بوو. ئۆردووی تورکی لە دەڤەرەکانی قوتور و خوی و سەلماس و مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕ و برادۆست دانرا. هەرچی مەهاباد، ئەوا بە بیانگەی ئەوەی پشتێنەی زەویەکانی سنوورەکەیانە بن دەستیان کرد، لە کرماشانیش توانیان کەمێك بچنە ژوورەوە، وەلێ لە مەریوان و هەورامان سەرکەوتنیان وەدەست نەهێنا [١٨٨:١٢٧]. ئەم هەڵوێستە دوژمنکاریەی عوسمانیەکان

روسەکانی نیگەران کرد، لەوە ترسان ئەو ئاژاوەیە سنوورەکانی ئەوانیش بگرێتەوە. بۆیە تورکەکانیان ئاگادارکردەوە، وەك هەموو جارێك ئەستانە هەرێی ئەوەی پێدان کە رێگا نادات هیچ کردەوەیەکی دوژمنکارانە لەسەر سنووری ئێران دژی روسیا روویدات. هەروەها سوپای تورك خۆی لە کاروباری ناوەخۆی ئێران هەڵنەقورتێنێ! [٣٠٥:٤٥]. وەك ئاماژەی پێکرا ئەڵمانەکان دەستیان لەم رووداوانەدا هەبوو، دیپلۆماتێکی ئەڵمان بەگەرمی کەوتبووە کار بۆ دابڕینی روسەکان لە ئینگلیز. کەچی لەو کاتەدا بێ هێزی روسەکان وایکردبوو نەشێن دەست بەرداری ئینگلیز و فەڕەنگەکان بن. [٢٩٦:٢٣٠]. هاوکات ئەو هێرشانەی تورکەکانیان لە بەرژەوەندی خۆیان نەدەزانی، لە حوزەیرانی ١٩١٠ شالیاری جەنگی روسەکان، نامەیەکی بۆ سەرۆك شالیارانی خۆیان نارد، تیایدا دەیگوت : "داگیرکردنی ناوچەکانی ئێران لە لایەن تورکیاوە و بەهێزبوونی تورکیا لەسەر حسێوی لاوازبوونی ئێران بەدڵی ئێمە نیە، ئەو هەولانەی تورکیاشمان بەدڵ نیە کە دەیدا بۆ کۆکردنەوەی هەموو خێڵە شەڕوانەکان لەبن دەسەلاتی خۆیدا. چونکە لە دیماهیدا دەبێتە سۆنگەی ئەوەی کوردستانی ئێرانیش بکەوێتە بن سایەی عوسمانیەکان ... جا لەجیاتی ئەوەی هەوڵی چەسپاندنی ئاسایش بدەین لەناو خێڵە کوردەکان، باشتر وایە بۆلای خۆمانیان رابکێشین و بە سەدان سوار لە خێڵە کۆچەرەکان پێکبهێنین" [٢٩٥:٤٥]. لە لایەکی تر چەندەی روس و ئینگلیزەکان لە یەکتر نزیك دەبوونەوە، ئەڵمانەکان ئاوری نێوان عوسمانی و ئێرانیەکانیان خۆشتردەکرد. بۆیە لەو گاڤەدا تورکەکان داوایان لە روسیا کرد هێزەکانیان لە ناوچەکانی رۆژهەلاتی کوردستان بکێشنەوە، کە داگیریان کردبوو. ئەڵمانەکان لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان دەستیان لەم کارانەدا هەبوو، رایاندەگەیاند ئەوان هیچ ئامانجێکی سیاسیان لەو دەڤەرە پەشۆکاوەدا نیە، تەنیا گەرەکیانە سیاسەتی دەروازەی والا سەقامگیر بێت، بۆ ئەوەی بازرگانیەکانیان وەهەرمێن کەوێتەوە، کە لە سۆنگەی خراوی رێگاوبان و تاریفەی روسەکان زیانێکی زۆری پێگەیشتبوو. سازانوڤ وەرامی دانەوە کەوا ئەستەنگە روسیا هێزەکانی لە باکوری ئێران بکێشێتەوە، تا ئەڵمانەکان دەست لە پرۆژەی هێڵی ئاسن و گەیاندنە تەلەگرافیەکان هەڵنەگرن لە ناوچەکانی نفوزی ئەوان [١٧٩:١٨١]. هەر لەم ساڵەشدابوو روسەکان کونسوڵخانەیەکیشیان لە موسڵ کردەوە. [١٧٣:٨٩].

لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩١٠ و سەرەتاکانی ١٩١١ ئەڵمان و روسەکان کەوتنە دانوستان بۆ ئەوەی بگەنە رێکەوتنێکی تایبەت بە پرۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدا و رۆژهەلاتی ناڤین. [١٣٤:٢٤١]. ئەنجامی ئەو دانوستانانە لە ١٩ ئابی ١٩١١، لە سان پترسبورگ، رێکەوتننامەی (پۆتسدامیان) مۆرکرد. بە گوێرەی ناوەڕۆکی ئەو رێکەوتننامەیە ئەڵمانیا بە

شێوەیەکی نێواخنی دانی بە ناوچەی نفوزی روسەکان نا، ئەو ناوچەیەی لە رێکەوتننامەی ١٩٠٧ روسی - ئینگلیزی دیارکرابوو، ئەگەرچی وەك لینچوفسکی دەڵێ: "ئەو رێکەوتننامەیە شتێکی وای بە روسەکان نەبەخشی، وەڵێ زۆر شتی تژی بایەخی دا بە ئەڵمانەکان. بۆیە ئەو رێکەتننامەیە بە رازیکردنێکی ئەڵمانەکان دەژمێردرێت لە لایەن روسەکانەوە، ئەمەش بووە ئەگەری دڵەڕاوکێیەك بۆ بەریتانیەکان. [٦٨:١٥٨]. کە بە ووردی زێرەڤانی هەموو پێنگاوەکانی روس و ئەڵمانەکانیان دەکرد. لە ٦ کانونی دووەمی ١٩١١ رۆژنامەکانی لەندەن رەشنوسی رێکەوتننامەکەیان بلاوکردەوە. [٨٨:٢٤١]. لەندەن وای حسێوکرد ئەم رێکەوتننامەیە تیرێکەو ئاڕاستەی دڵی ئیمپراتۆریای بەریتانی کراوە لە هیندستان. [٢٨:١٠١].
ئەو رێکەوتننامەیە تورکەکانیشی تووشی نیگەرانی و سەخڵەتیەك کرد و بەرامبەر دۆستە ئەڵمانەکانیان تێ هەڵچوون. وایان سالوخدان کردن کە هیچ گیانێکی باوەڕ پێکردن و دۆستایەتیان تیا نیە. [٨٨:٢٤١]. هاوکات تورکەکان وەك نارەزایی دەربڕینێك دەستیان کردەوە بە پەلاماردانی دەڤەرەکانی باکوری رۆژهەلاتی کوردستان، کە روسەکان بە ناوچەی نفوزی خۆیان دەزانی. لەو پەلاماردانە زۆر هۆڤیانە لەگەڵ کوردان رەفتاریان کرد. لە ساڵی ١٩١١ نوێنەرێکی روسی لەم بارەیەوە نووسی : "چەکدارەکانی تورك بە شێوەیەکی دڕندانەو بێ بەزەییانە کەوتنە گیانی کورد هەر کەسێکیان دەستکەوت لەناویان برد و فەوتاندیان" [١٢٣:٢٨]. لەگەڵ ئەوەش، روسەکان هەروەك چۆن هاوڕێیەتی ئەڵمانەکانیان پێ خۆش بوو، گەرەکیان نەبوو لەسەر کوردەکان دڵی تورکەکان بڕەنجێنن. بۆیە کاتێك عەبدولڕەزاق بەدرخان چووە کنیان داوای یارمەتی لێکردن، وەك لە راپۆرتی کونسوڵی روس لە (وان) هاتووە، کە لە ٢ نیسانی ١٩١١ نووسیویەتی : "لە یەکەم چاوپێکەوتنم لەگەڵ عەبدولڕەزاق پێم راگەیاند من لە شوێنی خۆم بەهەموو نارەزوویێك گوێی بۆ رادەدێرم، وەڵێ تکام لێکرد دۆستایەتی روسیا و تورکیا لە یاد نەکات" [٦١:١٥٥]. تورکەکان هەربەوە نەوەستان خۆیان کورد بەکاربێنن، بەڵکو بۆ ئەو مەبەستە یارمەتی بەرهەڵستکارە ئێرانیەکانیشیان دا ! بۆ وێنە لە بەهاری ١٩١١ سالار ئەلدەولە لە کوردستان سەری بەرزکردەوە، بە یارمەتی تورکەکان هەوڵیدەدا کوردەکان بۆخۆی رابکێشی، لەناوەڕاستی تەموز خۆی کردە فەرمانڕەوایی هەموو کوردستان، لەگەڵ محەمەد عەلی شای لێخراو کەوتە خۆ تەیارکردن بۆ هێرش بردنە سەر ئێران. وەڵێ کوردەکان زوو هوشیاربوونەوەو لایەنگیریان نەکرد، چونکە بۆیان دەرکەوت کە سەر بە تورکەکانە. [٧٦:١٥٦]. ئەو نزیك بوونەوەی ئەڵمان و روسەکان وای لە ئینگلیزەکان کرد بەلەزی کاربکەن بۆئەوەی لە لایەك ناکۆکیان بخەنە نێوان، لە لایەکی تر خۆیان لە روسەکان نزیك بکەنەوە، باشترین رێگاش بۆئەمە ئەوەبوو شەڕ و هەراکانی کوردسان

نەهێڵن، کە مەترسیەکی زۆریان بۆ روسەکان چێکردبوو، هێورکردنەوەی ئەو ناوچانە هەردوو ئامانجی ئینگلیزەکانی دەپێکا. بۆ ئەو مەبەستەش ئەو لیژنەیەیان خستەوەکار کە بە لیژنەی سنوور دەناسرا، وەك ئاشکراشە ئەو لیژنەیە هەر لە سەرەتاوە لە نوێنەری هەر چواردەوڵەت، روس و ئینگلیز و عوسمانی و ئێرانیەکان پێکدەهات. بەم جۆرە لە ٢١ کانونی یەکەمی ١٩١١ پرۆتۆکۆلی تاران مۆرکرا. کە لە پێنج بەند پێکهاتبوو. بەپێی بەندی یەکەم دەبوایە لیژنەیەك لەهەردوو دەوڵەتی ناکۆك پێکبێت و لە ئەستانە کۆببێتەوە. بە گوێرەی بەندی دووەم، دوای ئەوەی بەڵگەنامەکان دەدرانە هەردوولا، دەبوایە بە دڵسۆزیەوە هێڵی سنوور نیشان بکەن. هەرچی بە گوێرەی بەندی پێنجەم بوو، ئەگەر نەشیابوان خۆیان کێشەکە چارەسەربکەن، دەبوایە بیدەن بە دادگای نێو دەوڵەتیی لە لاهای. [٢٤٣:١٤٩]. سەیر لەوە دایە هاوکات لەگەڵ ئەو لە یەکتر نزیك بوونەوەیە، کوردیش هەوڵیدا یەکیەتیەك بۆ خۆی بگورێنێ. لە مارتی ١٩١٢ ژمارەیەك لە سەرکردەکانی کورد لە ئەستانە کۆبونەوەیەکی گشتیان بۆ هەموو کۆمەڵەو، رێکخراوە سیاسیەکان و کۆمەلایەتیەکان سازکرد. هەموو لەسەر ئەوە رێکەوتن کە پێویستە یەك پارتی کوردی هەبێ و نوێنەری هەموو کورد بێت. هەر لەو کۆبونەوەیەدا ئامانجە سیاسی و بنەڕەتیەکان و چۆنیەتی کرداری یەکگرتنەوەیان دیاریکرد. [١٩٢:١٥٥]. بێگومان ئەمە کاریگەری و مەترسی ئەو لەیەکتر نزیك بوونەوەی ئێران و عوسمانیەکانی پێوە دیارە. لەلایەکی تر ئینگلیزەکان لە هەوڵەکانی خۆیان نەکەوتن بۆ ئاشتکردنەوەی تورك و فارسەکان و چارەسەرکردنی کێشەکانیان. دوای ئەوەی پرۆتۆکۆلی ١٩١١ نەگەیشتە ئەنجام. هەمدیس روس و ئینگلیزەکان وەك ناوبژیوان بەشداریان کردەوەو دانوستانی چوار قۆڵی دەستی پێکردەوە. لە ١٧ تشرینی دووەمی ١٩١٣ گەیشتنە مۆرکردنی پرۆتۆکۆلێك لە ئەستانە. روسەکان پەیتا پەیتا داوایان لە تورکەکان کرد کە رازی بن بۆ گەڕانەوە بۆ کۆنگرەی ئەرزەڕۆمی دووەم، بۆیە تورکەکان لە ٣١ مارتدا یاداشتنامەیەکیان نووسی بۆ نەهێشتنی ناکۆکی لەگەڵ روسەکان و نیاز پاکیان بەرامبەر ئێرانیەکان دەربڕی. [٢٤٧:١٤٩]. لەو گاڤەدا جەنگی باڵکان کە بەپێی پەیماننامەی ئاشتی لە ١٨ تشرینی یەکەمی ١٩١٢ دیماهی پێهاتبوو، ببوە ئەگەری ئەوەی عوسمانیەکان ناوچەیەکی زۆر لە ئیمپراتۆریاکەیان لە دەست بدەن. [١٢٠:٣٣٢]. ئەمە نفوزی ئەڵمانەکانی لە ئەستانە زێتر کرد. بۆیە تورکە لاوەکان لە ساڵی ١٩١٣ توانیان کودەتایەك بەرپا بکەن، هەر لە ئایاری هەمان ساڵدا داوای نێردەیەکی سەربازیان لە ئەڵمانەکان کرد، بۆ ئەوەی هاریکاریان بکەن لە رێکخستنەوەی سوپای تورکی. ئەڵمانەکانیش نێردەیەکیان لە باشترین پسپۆرە جەنگیەکانیان بە سەرۆکایەتی لیمان ڤۆن ساندرس Liman Von Sandrz بۆ ناردن. [٣٤٨:٢٦٣].

ئەگەر ئەو گۆڕانانە بووە سۆنگەی پتەو بوونی نفوزی ئەڵەمانەکان لە ئەستانە، ئەوا پرۆتۆکۆلی (١٩١٣)یش نفوزی بەریتانیەکانی لە کوردستان پتەوترکرد، چونکە ئەم پرۆتۆکۆلە وایکرد سنور لەلایەن لیژنەیەکی نێو دەوڵەتی‌یەوە بچەسپێ، ئەمە سەرباری ئەوەی کۆتایی بە ناکۆکی سنوری، واتە ناکۆکی لە سەر کوردستان هێنا، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت. دیاریکردنی سنوورەکانی باشور بایەخێکی زۆری بۆ بەرژەوەندیەکانی ئینگلیز هەبوو لە میسۆپۆتامیا، چونکە کێشەی سنووری ناوچە پەترۆلیەکانی چارەسەر کرد [٢١٢:٢٧٢]. لە ١٧ کانونی یەکەمی ١٩١٣، قەسری شیرین کە بەشێك بوو لە نزماییانەی جیاوکی پەترۆلی دارسی دەیگرتەوە، لەگەڵ خانەقین کە تایبەت بوو بە کۆمپانیای پەترۆلی ئەنگلۆ-ئێرانی، درا بە عوسمانیەکان، ئەو ڕێکەوتننامەش بە ڕێکەوتننامەی زەویە گوێزراوەکان ناسرا. [٣١٤:٢٠].

هەرچی دەربارەی کوردە، لەو ئاژاوەو ملململانێیەی کە لەسەر خاکی ئەو بوو، وبە کێشەی سنوور باس دەکرا، شێخ مەحمود و هەندێك لە هاوەڵەکانی لە باشوری کوردستان هەوڵیاندا دەنگیان بگەیەننە لیژنەی سنوور، وەڵێ بەگوێرەی گەورەیی دۆزەکە هەوڵەکەی ئەوان زۆر بچووك بوو. [٦٠]. لەبەر ئەوەی هیچ لایەك لەلایەنە رکابەرەکان لەگەڵ کورد راست نەبوون. لە هەمان کاتدا کورد دەزگایەکی سیاسی نەبوو کە داکۆکی لە مافەکانی بکات. بۆیە لە کۆتایی ١٩١٣، کاتێك عوسمانی و ئێرانیەکان خەریکی ڕێکەوتن بوون، روسەکان ئیتر پێویستیان بەو سەرۆکە کوردە بچووکانە نەما. بۆیە پێیان باشتر بوو دەست بەرداری ئەو جۆرە سەرۆکانە بن، کە ناو و شۆرەتیان جێگای گومان بوو. [٥٤٠:٤٦]. شایەنی ئاماژە پێکردنە خەباتی کورد لەو ماوەیەدا پێشکەوتنێکی باشی بەخۆیەوە بینی بوو، راپەڕین زۆربەی ناوچەکانی گرتبۆوە، وەك بەدلیس و بارزان و شێخ مەحمودیش لە دەڤەری سلێمانی خەریکی خۆ سازدان بوو. وەڵێ دایسانی جەنگی جیهانی یەکەم ئەو هەولانەی کپ کردەوە.

# بەشی دووەم

# کوردستان لە ساڵەکانی جەنگی جیهانی یەکەم

## باسی یەکەم : کوردستان وەک

## گۆڕەپانی رووبەڕوو بوونەوە و لەیەکدانی لایەنە شەڕوانەکان.

ماوەیەك بەر لە دەستپێکی جەنگ، کوردستان ببووە مۆڵگەی چاوساغی و سیخوڕیەتی، لایەنە رکابەرەکان بەگەرمی کەوتبوونە خۆو زانیاریان دەربارەی کوردستان خڕ دەکردەوە. هەر لە ژمارەی هۆزەکان و ژمارەی ئەندامەکانیانەوە تا دەگەیشتە خوو نەریت و جۆری چەکەکانیان و شوێنی جوگرافی و جیۆپۆلەتیکی. بۆیە لەیەکەم ساتەکانی شەڕەوە کوردستان بووە گۆڕەپانی راستەقینەو چارەنووس ئامێزی بەرەکانی رۆژهەڵات. وەك لازاریف دەڵێ : "یەکەم تەقەی جەنگی جیهانی یەکەم لە رۆژهەڵاتی نزیکدا، لە رۆژهەڵاتی کوردستان – کوردستانی ئێران – دەستی پێکرد" [٤٦ : ٥٦٢]. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هێزەکانی عوسمانی و ئەڵەمانەکان لەو دەڤەرەدا بەتەنیا گەفیان لە رێگای هیندستان نەدەکرد، کە بەریتانیانیەکان بەرژەوەندیەکانی خۆیان تیادا دەدۆزیەوە، بەڵکو گەفیان لە کێڵگە پەترۆلیەکانی باشوری کوردستان و هێڵی دەریایی پاشایەتیش دەکرد [٣٣٩ : ١١٤]. لەو سۆنگەیەش بوو کاتێك دەوڵەتی عوسمانی چووە شەڕ لە ٥ تشرینی دووەم کردارە سەربازیەکان دەست پێکرد، رۆژنامە ئینگلیزەکان دەستیان کرد بەبڵاو کردنەوەی روونکردنەوەی وا کە تورکیا چی بەسەر دێت و چارەنووسی چی دەبێت. لە ٢٣ هەمان مانگدا رۆژنامەی دێیلی مێیل Daily mail نووسی : تورکەکان بەزەبری شمشێر چوونە خاکی ئەوروپاییەکان، بەزەبری شمشێریش لەناو دەبرێن [١٧٨ : ٥٩].

دەربارەی بایەخی ستراتیژی کوردستان لەم جەنگەدا، لایەنە شەڕوانەکان هەریەکەی لە روانگەی خۆیەوە سەیری دەکردو بەگوێرەی باری سەربازی و جیۆپۆلەتیکی خۆیەوە تێی دەڕوانی. روسەکان کە گەرەکیان بوو بگەنە گەرووەکان، کوردستان بۆ ئەوان، بەتایبەتی دەڤەرەکانی دەوروبەری تەڕابزۆن و ئەرزەڕۆم و وان و بەدلیس، بایەخێکی گەورەی هەبوو، هاوکات کوردستان شوێنێکی سەرەکی بوو بۆ پارێزگاری کردن لە قەوقاز [٩٨ : ١٠]. چونکە

یەکێك لەمەبەستە گرنگەکانی ئەڵەمانەکان بۆ راکێشانی عوسمانیەکان بۆ جەنگ ئەوە بوو لەم بەرەیەدا هێزەکانی روس خەریك بکات و توانای یارمەتیدانی بەرەکانی رۆژئاوایان لاواز بکات. هەر بۆیە لەگەڵ دایسانی جەنگ، هێزەکانی هەردوولا، تورك و روس بەرەو ئەو دەڤەرە رۆیشتن. هێزەکانی روس لە تشرینی دووەمی ١٩١٤ شیان بەرەو وان و ئەرزەرۆم پێشرەوی بکەن، وەلێ هێزەکانی تورك رایانگرتن و بەرەو سەری قامیش گەڕاندیانەوە. پاشان فەرماندەی ئۆردوی سێی عوسمانیەکان (حەسەن عیزەت پاشا) فەرمانی کشانەوەیدا بۆ ئەرزەرۆم و لەوێ هێڵێکی بەرگری دامەزراند. بڕیاریدا بە هەموو توانایەك و هەرچەندەی تێبچێ، پەلاماری دوژمن بدات، ئەوە بوو لە ٧-١٠/٩ شەڕی روباری روس روویداو هێزەکانی روس ناچار بوون بکشێنەوە پشت "کۆپرکۆی". خاڵی گرنگ لێرەدا ئەوەبوو شارو ناحیەکانی ئەو دەڤەرانە کەوتنە بن کۆنتڕۆلی تورکەکان [٦٩٩:٣٣٥].

دوای سەرکەوتنەکانی تورك لە شەڕەکانی دەردەنیل، تورکەکان بەخ و لە خۆبایی ببوون. بۆیە ئەنوەر پاشا ویستی سەرکەوتنێکی گەورەتر لەبەرەی کوردستاندا، کە بەبەرەی قەوقاز ناسرابوو وەدەست بێنێت. چونکە سەرکەوتنێکی وا ڕێگای ئەودیو قەوقازو پاڤالۆژو کریم و بگرە هەتا تورکستانیشی بۆ پاك دەکردنەوە. بۆ هێنانەدی ئەم ستراتیژیەتە تورکەکان دەبوایە خۆیان لەسەر تاپای کوردستان قایم بکەن. بیکەنە گۆڕەپانی جەنگ و کوردیش تووڕی گێژاوی جەنگ بدەن. ئەوە ئاشکرا بوو کە مانەوەی پاشکۆی هێزەکانی تورکیا لەبەرەکانی شەڕدا دژی روسیا لە قەوقازو هەروەها دژی بەریتانیا لە میسۆپۆتامیادا لەسەر ئەو خاڵە وەستا بوو [٥٧٧:٤٦]. بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستەشیان دەبوایە تورکەکان چالاکیەکانیان بەتەنیا لەباکورو باکوری رۆژهەلاتی کوردستان نەهێڵنەوە، بەڵکو دەبوایە هێزەکانیان بە پانتایی هەموو کوردستان بەرەو پێشەوە بڕوات. بۆیە هەردوای دەستپێکی جەنگ، چەند لەشکرێکی تورك رژانە کوردستانەوە، لەسەرەتادا شیان بگەنە وورمێ و دەوروبەری و ئەو روسانەیان دەرکرد کە لەو ناوەدا بوون، شکاکەکانیشیان بۆ لای خۆیان راکێشا، گرتنی وورمێ و چەند دەڤەرێکی تر ڕێگای کارکردنی بۆ تورك و ئەڵەمانەکان لە رۆژهەلاتی کوردستان خۆشترکرد [٥٨:٣٥]. دوای ئەمەش لە چەند قۆڵێکەوە دەستیان بە هێرش کرد، وەکو قۆڵەکانی خانەقین و هەورامان و رواندز، بۆ ئەم مەبەستەش جگە لە هێزی سەربازی کە ژمارەیان ئێجگار کەم بوو، ژمارەیەکی زۆر هێزی عەشایری کوردیان لەگەڵدا بوو، هێزی سەفەریەیان پێکهێنابوو، کە لەبن

سەرکردایەتی هەندێك لە ئەفسەران و ئەندام و پەرلەمان و کەسانی تردا بوون. هێزی سەفەریەی یەکەم و دووەم لە هەورامانەوە تا تەوریز، هەر دوولای سنوور، بە تایبەتی وولاتی موکریان تالآن و وێران کرد و زۆر کەسیان کوشت.. دوو هێزی سەفەریەی تریش لە نێوان خانەقین و کرند ناوچەی لاهیجیانیان دوچاری زەرەر و زیانێکی زۆر کرد، جگە لەمانە دوو هێزی سەفەریەی تر لە ناوچەی بەدلیس و وانەوە روویان کردە ئێران و لە ناوچەکانی دیلمان چەند جولانەوەیەکی بێسوودیان ئەنجامدا [٤٠:٢٤٧] ئەمە لە کاتێکدا لێپرسراوانی عوسمانی دەچوونە مەهاباد و دێهاتەکانی موکری، رایاندەگەیاند کەوا بۆ ئەوە چوونە سوپای روس لە ئێران وە دەرنێن و داوای کۆمەك و یارمەتیشیان لە خەڵك دەکرد [٣٢٦:٢٧٣].

لە سەرەتای جەنگدا خەڵك بە نەشئەی غەزاوە گەرم ببوون، بۆیە ئەو هێرشە چڕ و سەختانەی تورکەکان دەیانکرد سەرکردایەتی گشتی روسەکانی لە بەدلیس ناچارکرد بڕیاری کشانەوەی هێزەکانیان بدەن لە کوردستان و ئازربایجان، بە تایبەتی دوای ئەوەی لە رواندزەوە عومەر حەقی هێرشی بۆ کردن، ئەو هێزانە بە نیازی سووك کردنی باری هێزەکانی تورك لە قەوقاز، لە کانونی یەکەمی ١٩١٤ بەرەو مەراغە رۆیشتن. دوای گرتنی وورمێ دەرگای تەوریزیشیان بۆ کرایەوە. ئەحمەد شەمخاڵ بەسەرکردایەتی هێزی عەشایری کوردەوە لە ٨کانونی دووەمی ١٩١٥ چووە ناو تەوریزەوە [٩٤:٧٩:٨٠]، ئەو سەرکەوتنە سەرەتاییانە وایکرد تورکەکان، خۆیان بە هێزێك تێ بگەن کە دەشێ تای تەرازووی هێزەکان بگۆڕێ، هیچ شتێك لەوە زێتر نیگەرانی نەدەکردن کە پێیان بگوترێ لە سەرکەوتنەکانیان قەرزباری ئەڵەمانەکانن. وەك هنری مورگنتا و باڵوێزی ئەمەریکایی لە ئەستانە نووسیویەتی، ئەنوەر پاشا پێی گوتم: "راستە ئەڵەمانەکان هەندێك ئەفسەریان بۆ ناردووین و بڕێك پارەیان بە قەرز پێداوین وەڵێ سەیرکە ئێمە چیمان کرد، کەشتیگەلی ئینگلیزەکانمان بە زاند کە ئەڵەمانەکان نەدەشیان تێکی بشکێنن، هیچ نەتەوەیەکی تر نەدەشیا ئەو کارە ئەنجام بدا، ئێمە هێزێکی گەورەمان لە بەرەی قەوقازداناوە، بەمەش هێزێکی زۆری روسەکانمان خەریك کردووە، کە دەشیان لەبەرەی رۆژئاوا بەکاریان بێنن. ئینگلیزەکانمان ناچار کردووە هێزێکی زۆر لە میسر و میسۆپۆتامیا بهێڵێتەوە، بەم چەشنە هاوپەیمانەکانمان لە فەرەنسا لاواز کردووە! [٢٧٤:٢٢]، ئەم لووت بەرزیەی تورکەکان زۆری نەخایاند، لە شەڕی سەری قامیش دوچاری گەورەترین شکست بوون، لە نیوەی دووەمی کانونی دووەمی١٩١٥ روسەکان هێرشی پێچەوانەیان

کردەوە و کورد و تورکیان لە تەوریز کرد، لە ٣١ کانونی دووەمدا تەوریزیان گرت و بەرەو دیلمان کەوتنەرێ، بەمەش مەترسی لەسەر باکۆ و ئازربایجان نەما. هەر لەم کاتەشدا هێزەکانی بەریتانی لە خوارووی رۆژئاوای ئێراندا، لە شوێنی سەرچاوە پەترۆلیەکان سەریان دەرهێنا و بەرەو خوزستان هەڵزنان [٤٦:٥٩٩] و رووەو کوردستان هاتن. روسەکان دوای ئەوەی یارمەتیان بۆ هات و هێزەکانیان رێکخستەوە، کەوتنەوە هێرش بردن و ناوچەیەکی زۆری رۆژهەلاتی کوردستانیان داگیرکرد. عوسمانیەکان دوای ئەوەی بۆ ماوەی دوو مانگ مەهابادیان گرتبوو ڕوسەکان شیان بچنە ناو شار و دەریانپەڕێنن، هێزەکانی عوسمانی بەرەو بەرەی باشوری رۆژهەلات بۆ گردی (داش مەجید) و چیای (بووك و زاوا) رۆیشتن،بەم جۆرە شارکەتەوە دەست روسەکان و کەوتنە رەشەکوژی ئەو خەڵکانەی لە شاردا مابوونەوە، بە قەبلاندنی هەندێك لە ئاگادارانی ئەو کاتە ژمارەی کوژراوان لە ناو شاردا گەیشتە سێ هەزار کەس [٣١٨:٤٤] سەرکەوتنی روسەکان هەر لە رۆژهەلاتی کوردستان نەوەستا، بەڵکو هەموو باکوری کوردستانی گرتەوە، لە هێڵی هەمەدان و کرماشان و وورمێ، تا دەگاتە دەڤەرەکانی تەڕابزون و ئەرزنجان و موش و وان، توانیان پێشڕەوی بکەن. بەم شێوەیە خەونەکانی ئەنوەر پاشاتوایەوە، کە گەرەکی بوو سەرکەوتنێکی بەلەز لە قەوقازەوە وە دەست بێنێت. وەڵێ سەرباری ئەمەش بەڕای ئەڵەمانەکان ئەو جولانەوەیە ئامانجی خۆی پێکا، بەوەی کە هێزێکی زۆری لە تیپە گرنگەکانی روس خەریك کرد [١٥٨:٩٢].

کوردەکان کە وولاتەکەیان بووە گۆڕەپانی جەنگ ، بە تەنیا لە دەست هێرشی روسەکان نەیاندەنالاند، کەبەوپەڕی هۆڤیەتیەوە رەفتاریان لەگەڵ دەکردن بگرە تورکەکانیش لەوان کەمتریان پێ نەدەکردن دوای ئەوەی بەرامبەر روسەکان خۆیان نەگرت و ناچاری پاشەکشێ بوون. رەشبگیر کەوتنە گیانی خەڵکی بێ تاوانی کوردستان و داخی شکانەکەی خۆیان بەوان هەڵڕشت. عەبدولعەزیز یا موڵکی لەم بارەیەوە نووسیویەتی : "سوپای تورك کە ناچار بوو بەشکاوی ئەرزەڕۆم جێ بهێڵی، هەڵیپێچایە سەر کوردەکان و بەخاو خێزانەوە رایگوێزانەوە ئەناتۆلیا". وەك لەیەکێك لە بەڵگەنامە رەسمیەکاندا هاتووە : "دەبێ خەڵکی ناوچە پڕدانیشتوانە کوردنشینەکان راگوێزرێن و لە وولاتی خۆیان دوور بخرێنەوەو لەو ناوچانەدا نیشتەجێ بکرێن کە تورك نشینن، بەمەرجێك رێژەیان لە ٥٪ سەرجەم خەڵکانی تورکی ناوچەکان زێتر نەبێت، منالّ و لاوان لەگەڵ خۆیان بەرن و نابێ تێکەلاوی یەکتربن.

هەموو جۆرە پەیوەندی و تێکەڵاویەکیش دەبێ بپچڕێ. جگە لە تورکیش نابێ بەهیچ زمانێکی تر باخێون. دەبێ داب و نەریت و رەوشتی خۆیان بگۆڕن، دەبێ بەکۆمەڵ و بەتەواوی، بەزۆردارەکی بکرێن بەتورک !" [٢٨:١٠٠]. هەرچەندە لەم پێواژۆکەدا کورد بەژمارەیەکی زۆر شان بەشانی هێزەکانی تورك دەجەنگین، وەلێ بە بیانگەی دوور خستنەوەیان لە گۆڕەپانی شەڕ، کەوتنە راگوێزانیان. وەك لەیەکێك لە دۆسیەی راگوێزراوەکاندا هاتووە : "ژمارەی ئەو کوردانەی بۆ وولاتی تورك راگوێزراونەتەوە گەیشتە ٧٠٠ هەزار کورد، "جگە لەمە هەندێك لەدۆسیەکان ئەوە دەردەخەن، سەرو شوێنی ئەو کوردانەی بەزۆر راگوێزراون گومەو دیارنیە وەلێ بلەج شێرکۆ گوتەنی "لای ئێمەی کورد نادیار نیە، چونکە بەشێکی هەرە زۆری ئەو خەڵکە راگوێزراوە بەدەم سەرماو سۆڵەی رێگاوە زستان کوشتی، هەندێکی تر بەر لەوەی بگەنە شوێنی دیاریکراوی خۆیان تورکەکان کوشتیان" [١١:٦٠]. جێگای سەرنجە کەوا سەرباری ئەوەی ئەم هەموو کوردە بێ تاوانە لەنێو بران، کەچی کەسێکی مرۆڤ دۆست دەربارەی نەنووسیون. باڵوێزی ئەمەریکایی لە ئەستانە هنری مورگنتاو بەدرێژی باس لە پرۆسێسی راگوێزانی ئەرمەنەکان دەکات. بە ووردی وێنەی ئەو کارەساتە گەورەو دڵتەزێنە دەکێشێ، ئەگەر بهاتایە یەکێك کارەساتی راگوێزانی کوردەکانی بنووسیایە، دڵنیام تراژیدیایەکی مەزنی لێ دەردەچوو. جەمال پاشا کاتێك باس لە کوشتاری ئەرمەنەکان دەکات، راستەقینەیەکی درکاندووە، نووسیویەتی : "گریمان ٦٠٠ هەزار ئەرمەن لەرێگادا لە برسان و ماندوێتی مردوون، وەلێ هیچ کامێك لە ئێوە دەزانێ لە ویلایەتەکانی تەڕابزۆن و وان و بەدلیس و ئەرزەڕۆم چەند کوردو تورك کوژران ؟ من لێرەدا بڕیار دەدەم کە ژمارەی کوردو تورکەکان گەلێك لە ملوێن و نیوێك زێتر بوو" [١٥٤:٣٢٤]. ئاشکرایە جەمال پاشا ناوی تورکی هەر بۆ خوێی چێشت تێکردووە، ئەگینا ژمارەی تورك لەو دەڤەرانەدا ئێجگار کەمە. بۆیە زۆربەی هەرە زۆری ئەو کوژراوانە کورد بوون !

تورکەکان لەپاڵ ئەو پلانە نەگریسانەی لە دەڤەرەکانی بن دەسەڵاتی خۆیان بۆ کورد نەخشەیان دەکێشا، لە دەڤەرەکانی رۆژهەڵاتی کوردستانیش درێغیان لە کوشتنی کوردان نەدەکرد. ئەگەرچی سوپای تورك لەسەر ئەستۆی کورد دەژیا، وەك لەیەکێك لەو راپۆرتانەی کە بۆ شالیارگەی ناوەخۆی ئێران بەرز کراوەتەوە، هاتووە : لە شارێکی وەکو "خوی" بە زۆری خۆراکیان لەدانیشتوان دەسەند. لەکاتێکدا ئەوان لە توانایاندا نەبوو بەرگەی باری

سەختی ژیانی خۆیان بگرن [٢٧٤:٣٢٦]. هەرچی حکومەتی ئێران بوو، هیچی لە دەست نەدەهات و رۆڵێکی نەبوو، تەنانەت لایەنە شەڕوانەکان بایەخیان بە بێلایەنیەکەشی نەدەدا ! لەم بروسکەی سازانۆڤ لە ١١ شوباتی ١٩١٥ بەنهێنی بۆ باڵوێزی وولاتەکەی لە تارانی نووسیوە تیایدا هاتووە : "وای بۆ دەچین ئێران بداتە پاڵ ئێمەو بە ئاشکرا شەڕ دژی تورکیا رابگەیەنێ، وەلێ لە سۆنگەی بێ هێزی حکومەتی شا هیچ سوودێکی بۆ ئێمە نابێ، لەلایەکی تر ئەرکی ئەوە دەخاتە ئەستۆی ئێمەو ئینگلیزەکان، کە نەك بەتەنیا یارمەتی چەك و داراییان بدەین، بەڵکو دەبێ یارمەتی سەربازیشیان بدەین، لە ناوچەیەکی واش کە بۆ ئێمە زۆر سەختە، وەکو ناوچەی کرماشان. لەهەمان کاتدا بەشداریکردنی ئێران لەجەنگ مافی ئەوەیان دەداتێ لە ئایندەدا داوای قەرەبوو بکەن. بۆیە ئێمە پێویستیمان لە بێلایەنی ئێران زێتر نیە" [٩٨:٢٣٥]. هۆی ئەم هەڵوێستەش، ئەگەرچی لەلایەك باری لاوازی حکومەتی ئێران نیشانددا، هاوکات ئەوە دەردەخات کە روسەکان لەسەرکەوتنی خۆیان خاترجەم بوون. دوای ئەوەی توانیان دەڤەرێکی فراوان لە باکوری کوردستان داگیر بکەن، لە مارتی ١٩١٥ دەستیان کرد بە چەسپاندنی شوێن پێی خۆیان لە وورمێ، بەم جۆرە گەفیان لەوان و موسڵ کرد. عوسمانیەکان چەند جارێك سنووریان بەزاندو پەلاماری هێزەکانی روسیاندا، وەلێ شکستیان هێناو گێڕاندرانەوە دواوە. شایەنی باسە لەو کاتەدا ئەرمەنەکانیش هاریکاری روسەکانیان دەکرد، لیوایەکی خۆ بەختکەریان بەیەکەوە نابوو بەناوی لیوای تۆڵە، لە ١٥ نیسانی ١٩١٥ ئەو هێزانە توانیان شاری وان بن دەست بکەن [١٦٤:١١٢]. هەر دوای ئەمەش لە پایزدا لەبن پاراستنی روسەکان، دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەنیان لەوان راگەیاند، ئەمە سەرباری ئەوەی پەلاماری پاشکۆی هێزەکانی عوسمانیان دەداو گوندەکانیان ئاورتێ بەردەدا [١٣٩:١١٣]. هەرچی دەربارەی رۆژهەڵاتی کوردستان بوو، ئەوا هەر لە ١٥ ئایاردا، هێزی سوارەی روس دوای پێکدادانێکی کەم لەگەڵ کورد توانیان شاری مەهاباد بگرن. کەسێکی ئەوتۆ لە شارا نەمابوو، کونسوڵخانەی روس لەناو شاردا کە کورد ئاوریان تێبەردا بوو هێشتا کادووی لێ بەرز دەبووەوە. رۆژی ١٨ ئایار روسەکان لەشنۆ نزیك کەوتنەوە، رۆژی ١٩ لە نزیك شنۆ وەستان [٢٦: ٢٨٨-٢٨٩]. روسەکان هەر کە گەیشتنە مەهاباد دەستیان کرد بەرەشە کوژی خەڵك، لە ٢٢ ئایار کوردەکانی شنۆیان بە جۆرێکی وا بێ بەزەییانە لەناو برد، کە ئیتر شنۆ نەیتوانی تا چەندین ساڵی تر بێتەوە سەرخۆ [٢٦: ٢٨٩-٢٩٠]. سەرباری کوشتاری

روسەکان، ئەرمەنەکانیش کە لە پێشەوەی سوپاکانیان بوون، لووت و گوێچکەی کوردانیان دەبڕی و هەتکیان دەکردن. بۆیە کوردی ڕۆژهەڵات بەلێشاو، بە لووت و دەست، یا مەمك بڕاوی، بەمناڵی ساواوە، ئاوارە بوون و خۆیان گەیاندە باشوری کوردستان. لەم لاشەوە سوپای تورکی موسڵمان رووتی کردنەوە! [٦: ٨-٩].

هەرچی دەربارەی هەڵوێستی تورك و ئەڵەمانەکان بوو، بایەخێکی زۆریان بە ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەدا، چونکە لەوێوە ئاسانتر بوو دەست لە بەرژەوەندیە زیندووەکانی روس و ئینگلیز بوەشێنن. بۆیە گەرەکیان بوو ئێران پەلەکێشی ناوجەنگ بکەن. کاتێك لە هەوڵە سیاسیەکانیان لەم بوارەدا شکستیان هێنا، بڕیاریان دا بە کرداری یاخیگەریی سەربازی ئاژاوە بگوڕێنن. بۆ ئەو مەبەستە هێزێکیان بە فەرماندەی یەکێك لە ئەفسەرە دەریاییە تورکەکان بەناوی حوسێن رەئوف بەگ پێکەوەنا، کە نزیکەی فەوجێك دەبوو. هێزەکە لە سەرەتای نیسانی ١٩١٥ لە خانەقین گردبوەوە. پاشان چوونە ناو ئێران و شیان پشتگیری هەندێك لە هۆزە کوردەکان وەدەست بێنن. هەندێکی تریش دژیان وەستان [٢١:١٩٢]. لەلایەکی تریشەوە ئەڵەمانەکان لە چالاکیە سیخوڕیەکانی خۆیان بەردەوام بوون. هەرچەندە لە ئایار تا حوزەیرانی ١٩١٥ هێزی سوارەی ژەنڕاڵ شاربانتە Sarbante، توانی دەست بەسەر مەڵبەندە سەرەکیەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان دا بگرێت، بەو نیازەی وا لەکورد بکات دەست بەرداری بزاڤەکانیان بن دژی روسەکان، لەگەڵ ئەمەش چالاکی تێکدەرانەی هەواڵگری (استخبارات) تورکی – ئەڵەمانی لەو دەڤەرەدا دیماهی نەهات، بەڵکو بە پێچەوانەوە یەکە کوردی و تورکیەکان سەر لەنوێ لە دەڤەرەکانی شنۆو مەهاباد هەوڵی پێشڕەویان دایەوە [٩٥:١٥٦]. لەهەمان کاتدا کاریان بۆ ئەوە دەکرد سوود لەو کەسانە وەربگرن کە بەدوای تەختی شاهەنشاهیەوە وێڵ بوون. (سالار ئەلدەولە) بۆ هێنانەدی ئەو مەبەستەیان کابرایەکی گونجاوو لەبار بوو. بۆیە لەسەرەتای ئەیلولی ١٩١٥، لە ناکاو سالار ئەلدەولە سەری هەڵدایەوە. قاوێکی وا کەوتەوە کەنیازی وایە لەگەڵ ئەوانەی دەوریان دابوو کە زۆربەیان کورد بوون، بگەڕێتەوەو تەختی ئێران وەربگرێتەوە، یەکەم پێواژۆکیشی بن دەستکردنی سنەو مەهاباد بوو. لەم کاتەشدا (شیومان) کە سیخوڕێکی بەناوبانگی ئەڵەمان بوو، لەناوچەی کرماشاندا دەسەڵاتێکی زۆری هەبوو، نزیکەی دوو هەزار سوارەی کۆ کردبوەوەو دەیویست روو بکاتە ناوچەکانی ناوەوەی کوردستان [٥٩٧:٤٦]. بەم لەگوێنە نفوزی ئەڵەمانەکان لە گەرمەی

جەنگدا رۆژ بەرۆژ لـەزێدە بووندا بـوو، بەتایبـەتی لەناوچـەکانی نـاڤین و باشـوری رۆژهـەڵاتی کوردستان. ئەو بزاڤە ئینگلیزو روسە هاوپەیمانەکانی نیگەران کردبوو. بۆیە هـەوڵیاندا رادەیـەك بۆ ئەم پەلهاویشـتنەی ئەڵەمانـەکان دابنێـن. ئەمـەش بەتایبـەتی دوای ئـەوە بـوو کـە ئەڵەمانـەکان ویستیان حکومەتێکی ئەلتەرناتیف بۆ حکومەتی شـا دامـەزرێنن. لـەکۆتایی ١٩١٥، ئینگلـیزو روسەکان بڕیاریاندا هاریکاری سەربازی بکەن لە کوردستان و میسـۆپۆتامیاو ئـێراندا. بـۆ ئـەم مەبەستە روسەکان چەند گۆڕانێکیان لە ڕیزی هێزەکانی خۆیان ئەنجامدا. هێزی باراتۆڤ بوو بە فەیلەقی قەوقازیّ حەوتەم، کە لە ١٣ هەزار پیادەو ٨ هەزار سوارو ٧٠ تۆپ پێکهاتبوو. وەڵـێ دووری مـاوەی نێـوان هـەردوو فـەیلـەق لـە کـاریگـەری ئـەم هێـزەی کـەم کردبوەوە. هێزی فەیلەقی حەوتەم رووەو تـەورێـزو روانـدزو مـوسڵ. هێـزی فەیلەقی یەکـەمیش دەبوایـە رووەو قەزوێن و کرماشان و بەغدا بڕوا [١٠٨:٩٤]. ئـەوە بـوو بەشـێك لـە هێزەکـانی بـاراتۆڤ لـە بەندەری ئەنزەلی کە دەکەوێتە سەر دەریای قەزوێن، بەرەو باشور کەوتە پـەلاماردان، هێزەکـانی کوردو تورکـی پەرتـەوازە کـردو بـەرەو هەمـەدان راوی نـان. لەسـەر داخـوازی ئینگلیزەکـان، ژەنـڕاڵ بـاراتۆڤ هێزەکـانی بـەرەو هێڵـی کرماشـان خانـەقین نـارد. روسـەکان داوایــان لــە ئینگلیزەکان کرد ئەوانیش بەرەو کرماشان هەڵکشێن. تا لەگەڵ هێزەکـانی ئـەوان یـەکبگرن و بەجووتە پەلاماری ئامەد Amed بدەن. وەلـێ لەبـەر ئـەوەی ئینگلیزەکـان دەترسـان روسـەکان بگەنە میسۆپۆتامیا، رازی نـەبوون ئـەم پلانـە ئـەنجام بـدرێ [٦٠٢:٤٦]. سـەرباری ئەمـەش لـە شوباتی ١٩١٦ روسەکان توانیان ئەرزەڕۆم بگرن، دواتر بەچـەند مـانگێك، لـە هـاوینی هـەمان ساڵدا موش و بەدلیسـیان گـرت. کـە ئەمـە ئـەرکی لێدانـی هێزەکـانی تورکـی لـە رۆژهـەڵاتی کوردستان بۆ ئاسـان کـردن [٥٦:٣٥]. چونکـە ئـەرزەڕۆم بنکەیـەکی سـتراتیژی و سیاسـی و ئابووری گەورەو گرنگ بوو. تەنانەت لە باکوری کوردستانیش تورکـەکانی خسـتە کـاودانێکی ناهـەموارەوە. هـەر لـەو گاڤەشـدا هێزەکـانی روسـیا لەناوچـەکانی گۆمـاوی وان و رۆخـەکانی دەریای رەشدا کەوتنە جموجۆڵ [٦١٤:٤٦]. هەرچی ئەو هێزەی لە تەورێزەوە دەهـات، توانـی وورمێ پاشان شنۆو مەهابادیش بن دەست بکات. ئەو هێزانە پڕیان دەدا ناموسی خەڵك و ژن و کچی کوردیان هەتك دەکرد. ئەوەی خۆیشی نەدا بونایە دەست بـۆ چاوترسـاندنی خـەڵکی تـر لەت لەتیان دەکرد [١٣:٤٨]. دوا بەدوای پەلاماری روسـەکان بـە چـەند مـانگێك تورکـەکان توانیان بێنەوە کرماشان و هەمەدان، هەمدیس لایەنگرو پیاوانیان دژی هاوپەیمانـەکان کەوتنـەوە

کارو دەستیان بە پڕوپاگەندە کردن کردەوە. وەلێ ئەوە زۆری نەخایاند، چونکە لەشکری روس جارێکی تر توانی ئەو دەڤەرانە بگرێتەوە [٣٥:٦٠]. سەیر لەوەدایە هەردوو بەرەی شەڕوان تۆڵەی شکستەکانیان لە دانیشتووە کوردەکان دەکردەوە. بەپێی راپۆرتی (کاوریکا) کە یەکێك بوو لە سیاسەتوانانی روس، تورکەکان لەیەك هێرشی کت و پڕدا دوو هەزار کوردیان کوشت. ناوبراو لەم بارەیەوە نووسیویەتی : "تورکەکان سکی پیاوانیان هەڵدەدڕی و مەمکی ئافرەتانیان دەبڕی. تەنانەت بەزەییان بەکچۆڵە ساواکانیش نەدەهاتەوە". وەك **عەبدولعەزیز یاموڵکی ئێژێ : "بەدرێژایی رێگای نێوان کرماشان و خۆرئاوای خانەقین لاشەی جووتیارە کوردەکان کە بەدەستی تورکەکان کوژرابوون، لەم لاو لەولای شەقامەکە فڕێدرابوون" [٢٨:١٠٢]. لەراستیدا ئەگەر هۆڤیەتی روسەکان نەبوایە، کورد دڵیان لە** تورکەکان کرمێ ببوو هەرگیز بۆیان نەدەجەنگین. بگرە زۆر لەسەرکەوتنەکانی روسیش لە سۆنگەی چاوساغی و رۆڵی کوردە دژ بە تورکەکان بوو. بۆ وێنە کاتی روسەکان رواندزو دەورو بەریان گرت، سوودیان لە چاوساغی خەڵکی ئەو دەڤەرە بینی [١٩٢:٤٦] کە بێگومان کورد بوون !

روسەکان لە ١٣ ئایار رواندزیان گرت و وێرانیان کرد، تەنیا خانوەکانی سەرەوە نەبێت کە ئەفسەرە روسەکان تیایدا دادەنیشتن، ئەگینا ئەوەی تر خڕی خاپوور کرا، کە ئەمە کوردی دڵگران کرد. بۆیە لەهەموو لایەك، هەولێر و رانیەو کۆیە، عەشیرەتە کوردەکان بۆ بەرەنگار بوونەوەی سوپای روس پەیوەندیان بە تورکەکانەوە کرد، ئەو کاتە لە چیای کۆڕەك بوون، کە دەڕوانێتە سەرشارۆچکەی رواندز، وەلێ دوای چەند رۆژێك لەبەر ئەوەی سوپای **تورك لە توانایدا نەمابوو نانی ئەم هەموو خەڵکە بدات بێزار بوون و خەڵکێکی زۆر گەڕایەوە ماڵی خۆی [١٦٧: ٢٣٤-٢٣٥]. لە کوشتاری روسەکان بۆ سەر ناوچەی رواندز ٥ هەزار** پیاو ئافرەت و زارۆکی کورد بوونە گوری. زۆربەیان فڕێدرانە خەرەندی رواندزەوە. لە ٢ هەزار خانوبەرەی ناو شار تەنیا ٢٠ ماڵ بەسەلامەتی دەرچوون [٣٥:١٤٧]. ئەمەش وەك ئاماژەی پێکرا ئەفسەرە روسەکانی تیا دادەنیشت.

لەو گاڤەدا، هێزەکانی ژەنراڵ تاوزەند لە کوت ئابلووقە درابوون، باری هاوپەیمانان بەرەو نالەباری دەڕۆیشت. هەرچەندە لە نیسانی ١٩١٦ بەشێك لە هێزەکانی باراتۆف پەلاماری خانەقینیان دا، هەندێك لە پێشڕەوەکانی ئەو هێزە لە دیجلەش نزیك بوونەوە، کەچی

بەریتانیەکان لەگەڵ ئەم بارەی تیایدا بوون رازی نەبوون هاریکاری هێزەکانی روس بکەن [٤٦ : ٦١٤]. هەر لەم مانگەشدا هێزەکانی تاوزەند خۆیان بەدەستەوەدا. کە ئەمە وورەی تورك و ئەڵەمانەکانی بەرزکردەوە. بۆیە خۆیان خڕکردەوەو بڕیاریاندا سەر لەنوێ دەست بە پەلاماردان بکەنەوە. لە ئایاری ١٩١٦ ئەنوەر پاشا نمایندەی فەرماندەی گشتی سوپای تورك و شالیاری جەنگ گەیشتە بەغدا، لەگەڵ نێردەی سەربازی ئەڵەمانی (فولۆسوف Folosov) پلانێکیان دانا، کە بەناوی هەردووکیانەوە (ئەنوەر - لۆسۆف) ناسرا. پلانەکە ئەو خاڵانەی بەخۆوە گرتبوو : ١-فەیلەقی ١٣ تورکی هێرش بەرێت و کرماشان و هەمەدان و قەزوێن بگرێت. ٢- هێزەکانی سلێمانی لەدوو لاوە بەرەو پێشەوە بچن، یا بەرەو سنە پێشڕەوی بکەن بۆ هاریکاری فەیلەقی ١٣، یاخود بەرەو سەقزو بۆکان بڕۆن بۆ هاریکاری هێزەکانی موسڵ. ٣- هێزەکانی موسڵ رواندز بگرن و بەرەو مەهابادو وورمێ و تەورێزو خوی بکشێن. ٤- لەم دەڤەرانەی کە دەیگرن، حکومەتێك دامەزرێنن (نیزامولسەڵتەنە) * کە لایەنگری تورکەکان بوو بکەن بەسەرۆکی ئەم حکومەتە [١٩٢: ١٧-١٨]. هەڵمەتەکە لەمانگی حوزەیراندا لەناوچەکانی خانەقین و قەسری شیرین و کرماشان سەرکەوتنی زۆر بەلەزی وەدەست هێنا. رۆژنامەی "الزوراء" ئەو هەڵمەتەی بە بروسکەی لەپڕەکی "**البرق الخاطف**" سالوخدان کرد. ئەم هێزانە کە چوونە هەمەدان، خەڵکەکەی لەبەر هۆڤیەتی روسەکان بەگەرمی پێشوازیان کردن و پەزیان لەبەر پێی سەربڕین ** [٩٤: ١١٤-١١٥]. هێزەکانی لە رۆژهەلاتی کوردستان مانەوە تا تورکەکان لە کوت شکستیان هێنا، ئەو کاتە خەلیل پاشا، فەرمانده‌ی سوپای شەش، فەرمانی کشانەوەی ئەو هێزانەیدا [٣١:١٩٢].

هەرچی لە دەڤەرەکانی دەوروبەری موسڵ بوو، روسەکان گەیشتبوونە ئامێدی، بەگوێرەی ئەو زانیاریانەی لەکن تورکەکان هەبوو، بەرەی ئامێدی - ئاکرێ نزیکەی ٦٠٠

---

* سەرۆکی بەختیاریەکان بوو.

** تورکەکانیش بێ بەزەییانە کوردیان دەکوشت. لەو سکاڵانامەیەی کە مەجیدخان، سەرۆك عەشیرەتی باجەڵان بۆ حکومەتی شای بەرز کردەوە، باسی ئەوەی دەکرد کە چۆن سوپای عوسمانی گوندەکانیان تاڵان کردووەو حەوت کەسیان لە سێدارە داوە. هەروەها لەهەمان کاتدا ئەوەشی روونده‌کردەوە کە چۆن هەوڵیداوە عەشیرەتەکان خڕبکاتەوە بۆ ئەوەی رێگا لەو رەفتارانەی عوسمانیەکان بگرێ، کەچی دەوڵەتی ئێران نەك هیچ کۆمەکیەکی نەکردووە، بگرە رەزامەندیشی بۆ ئەو کارە دەرنەبڕیوە [٥٩:٣٢٦].

سواری روسی لێ بوو. دوو تۆپ لەرێزانۆك و ٧٠٠ سوار لە بریسیا، کە ٢٠ کم لە رۆژهەڵاتی ریزان بوو، ٧٠٠ سواریش لە سووریٚ بوو، ئەو شوێنەی کە زێی گەورەو رویٚ شینی تیا بەیەکدەگەیشت [٥١:١٩٢]. ئەو هێزانەش وەك هێزەکانی تری روسی لەو دەڤەرەدا هۆڤیەتی بێ وێنەیان ئەنجامدەدا، بەتایبەتی لەناوچەی بارزانیەکان. چونکە کاتێك هێزەکانی روس لە برادۆستەوە بەرەو ئەو دەڤەرە رۆیشتن، خەڵکێکی زۆر خۆیان لە چیاکان ڤەشارت، وەلێ هەندێك لە شێروانیەکان لە گوندەکانی خۆیان مانەوەو پێیان وابوو ئەو هێزانە بەپێی رێکەوتننامەیەك لەگەڵ شێخە کۆچ کردووەکەیان (شێخ عەبدولسەلام) لە تفلیس، بۆ ئەو دەڤەرە هاتوون. بۆیە بەگەرمی چوونە پێشوازیان و ئەوانیش بە گوللە وەرامیان دانەوە [٢٣:١٤٥]. دوای ئەوە روسەکان لە باشوری رۆژهەڵاتی کوردستان، هەمدیس گەڕانەوە، لە تشرینی یەکەمی ١٩١٦ هێزەکانی باراتۆڤ شیان بێجارو سنە بن دەست بکەن. تورکەکان ناچار بوون بەبێ شەڕ بکشێنەوە، لەولاشەوە هێزەکانی ئینگلیز بە فەرماندەیی ژەنراڵ مۆد بەرەو بەغدا هەڵدەزنان [٩٤:١٢١]. هەرچی لەبەرەی قەوقاز بوو، عوسمانیەکان توانیان بەرپەچی هێرشێکی روس بدەنەوە، کە کردبویانە سەر ئامەد (دیاربەکر) و هەروەها توانیان موش و بەدلیسیش بگەڕێننەوە [٨٥:١٧].

تورکەکان سەرباری شکستەکانیان لە بەرەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان، کۆڵیان نەدەداو بەردەوام هێرشی پێچەوانەیان دەکردەوە، لە ٣ کانونی یەکەمی ١٩١٦ هێرشێکی تریان کردەوە سەر هەمەدان، دوای شەڕێکی سەخت لە سوڵتان داغ کە لە نزیك هەمەدانە، روسەکان سەرکەوتنێکی باشیان وەدەست هێنا، بۆیە تورك و ئەڵەمانەکان ناچار بەرەو کرماشان کشانەوە. باراتۆڤ هێزەکانی لە نێوان قەزوێن و هەمەدان پارڤە کرد، پێی وابوو بەم کارەی توانیویەتی ئابڵوقەی بەشێکی گرنگی ئێران بدات [٩٤: ١٠٦-١٠٧]. دوای ئەوە هێزەکانی روس دەستیان بە پەلاماردان کردەوە. لە سەرەتای ١٩١٧ توانیان خانەقین بن دەست بکەنەوە. هەمدیس لاپەڕەیەکی ترس و تۆقاندیان دەست پێکردەوە، کەس بەسەلامەتی لەو شارۆچکەیە دەرباز نەبوو، ئافرەتێك چیە لە دەستدرێژی کازاکەکان رزگاری نەبوو [١٢٩:١٩٧]. بەم چەشنە سوپای روس لە شوباتی ١٩١٧ لە رۆژهەڵاتی کوردستان وورمێ و مەهابادو کرماشان، لە باشوری کوردستانیش خانەقین و پێنجوێن و رواندز، لە باکوریش ئەرزەڕۆم و ئەرزنجان و وان و بەدلیسیان لەبن دەستدابوو [٢٦:٢١٦]. ئەو رەفتارانەی روس وایکرد نەك بەتەنیا تورك و ئەڵەمانە دوژمنەکانیان، بگرە ئینگلیزە هاوپەیمانەکانیشیان هەوڵبدەن سوودی لێ وەربگرن بۆ

ئەوەی نفوزی خۆیان لەو دەڤەرانەدا زیدەبکەن، کە روسەکان ئەو رەفتارانـەیان تیا ئـەنجامدەدا.
لـە سـەرەتای سـالی ۱۹۱۷ سـیخورەکانی ئینگلـیز چالاکانـە لـە رۆژهـەلاتی کوردستان، لـەو شوینانەی کە لەچوارچێوەی بزاڤی هێزەکانی روسدا بوو کەوتبوونـە کـار، سـەریان لـە کـوردە بەگەکان دەداو هـەوڵیاندەدا بـۆ لای خۆیانیـان رابکێشـن، لەوانـە خێڵـی بەدەسـەلاتی کـەلهورِ، یەکێك لە سیخورەکانی روس لەم بارەیەوە نووسیویەتی : "هەر ئەوەندەی شەرِ دیمـاهی بێـت و هێزەکانی روسیا لەو ناوە بکشێنەوە، ئینگلیزەکان سەرکەوتوانەو بەلەزی دەسـەلاتی خۆیـان لـە کوردسـتان بـلاو دەکەنـەوەو دەیچەسـپێنن، تـا بیکـەن بـەدیوارێك بەرامبـەر میسـۆپۆتامیا کـە داگیریان کردووە" [٤٦: ٦٥٣-٦٥٤]. لەپاڵ ئەمەش ئینگلیزەکـان لـەباری نـاوەخۆی روسـیا دەترسان کە لەو گاڤەدا لەهەڵچووندابوو. ئەوە بوو شـۆرِش بـەرپا بـوو، وەلـێ حکومـەتی نـوێ بریاریدالەشـەرِ بـەردەوام بێـت. هاوکـات سـوپای روس لـە باشـوری میسـۆپۆتامیا سـەرکەوتن لەدوای سەرکەوتنیان وەدەست دەهێناو بەرەو بەغدا هەڵدەزنان. لەبەر ئەوەی ژمارەی روسـەکان زۆر بـوو، ئینگلیزەکـان لـەوە دەترسـان هـەوڵێکی دلێرانـە بـدەن و پێشـرِەوی بکـەن، ئەگـەر سەرکەوتبوونایە، ئەو کاتە دەگەیشتنە موسڵ و سامەرِاو بەغدا، وەلێ بەر لەمانگی نیسـان ئـاوو هەوا رێگای نـەدەدا ئەمـە بێتـە دی. ئینگلیزەکـان بـەووردی زێـرەڤانـی ئـەو هـەوالانـەیـان دەکـرد، ژەنـرِال مـۆد لــە پـەیوەندیەکی بـەردەوام دابـوو لەگـەڵ ژەنـرِال بـاراتۆڤ [۱۲۸: ۳۷۱]. سەرکەوتنەکانی ژەنرِاڵ مۆد وای لە شالیارگەی جەنگی بـەریتانی کـرد لـە ۲۸ شـوباتی ۱۹۱۷ "سیرولیەم رۆبەرتسـن"ی سەرپشـك کـرد کـەوا سیاسـەتی حکومەتەکـەی رابگەیەنێ، ئـەویش فراوانکردنـی نفوزی بەریتانیـەکان بـوو لەویلایـەتی بـەغداو وەبـەرهێنانی سەرکەوتنەکانی مۆد بوو تا ئەو پەرِی، بەمەرجێك توانای گواستنەوە لەبەرچاو بگرێ و پاراستنی هێزەکەشی دابین بکا، ئامۆژگاری ئەوەیان کـرد کـەوا جوڵانـەوەی هاوبـەش لەگـەڵ روسـەکان ئەنجام بدا. هەروەها پێشنیاری ئەوەشیان کرد هەموو جۆرە پێشوەچوونێك دوا بخـا، تـا دەزانـێ روسەکان چیان لەتوانادا هەیە. بە (مۆد)یشیان راگەیاند کە حـەز ناکـەن روسـەکان بـەر لـەوان بگەنە بـەغدا [۱۲۸: ۳۹۱]. پلانـی هاریکاریکردنەکـەی ئینگلیزەکـان لەگـەڵ روسـەکان بـەم چەشنە بوو، ژەنرِاڵ مۆد هەڵسێ بەشەرِ کردن لەگەڵ پاشماوەکانی سـوپای فەیلـەقی ۱۸ لەبـەری دیجلە، هەرچی روسەکان بوون ئەوا فەیلەقی ۱۳ دەربکـەن و لـە قـەوقازەوە بـەرەو موسـڵ بێـن [۸۳: ۲٦۳]. ئەوە بوو روسەکان هـەوڵیاندا زیـتر بێنـە پێشـەوە، لەناوەرِاستی نیسـانی ۱۹۱۷ ژەنرِال باڤلوڤ جێگای ژەنرِاڵ باراتۆڤی گرتەوە، هێزەکەی دەگەیشتە ۲۰ هەزار تفـەنگ و ۲۰ تۆپ. بەشی زۆری هێزەکەی لەنێوان خانەقین و قزلربات دامەزرابوو، دوای پەلاماردان لەشەوی

٨/٧ لەشوێنی مەیدان لەکەناری رۆژهەڵاتی سیروان پەڕینەوە بە ئامانجی ئەوەی بگەنە باوەنور، هەروەها هێزی دووەم لەتەنیشت گەز، لە ٩ ئایار قەڵای شێروانەیان بن دەستکرد. روسەکان داوایان لە ژەنراڵ مۆد کرد هاریکاریان بکات و لەدەلی عەباس و بەنداوی رۆخانە "عظیم" بەگژ تورکەکان دا بچێتەوە، تا تورکەکان ناچار بن بەرەو باشور بکشێنەوەو روسەکان بەرەو کفری پێشڕەوی بکەن. کەچی ژەنراڵ مۆد هیچ کاریگەریەکی نەنواند، ئەمە یارمەتی تورکەکانی دا پەلاماری ئەو ناوچانە بدەن و بیگرنەوە. روسەکانیان لە روباری سیروان ئاودیو کردەوە [١٩٢: ٣٢-٣٣]. بەڵێ دواتر سەرۆکی ئەرکانی سوپای ئیمپراتۆری ژەنراڵ مۆدی ئاگادار کردەوە کە روسەکان بەرەو موسڵ نایەن و بەرپرسیاریەتی روسەکان تەنیا لە هێڵی رواندز - سلێمانی - قزلربات دەبێت. کەچی مۆد سەرسام بوو، کاتێك لەشەوی ٨/٧ ئایار نامەیەکی لە ژەنراڵ راداتز Radatz پێگەیشت، تیایدا ئاگاداری کردەوە کەوا بارەگای سوپای روسی بڕیاری داوە لە رۆژئاواوە بکشێ بۆ گرتنی کفری و هێزەکانی دەست دەکات بە پەڕینەوە لە رووباری سیروان [٨٣: ٢٦٤]. هاوکات عوسمانی و ئەڵەمانەکانیش، سەرباری ئەو شکستە یەك لەدوای یەکەی دوچاری هاتن، بەهەموو لەگوینێك هەوڵی وەدەرنانی روسەکانیان دەدا، لە ئەنجامی ئەم ژێرکەوتنانە عوسمانیەکان هەستیان بەلاوازی هێزەکانیان کرد لەناوچەی سلێمانی. بۆیە لە ٢٣ حوزەیراندا دەستیان کرد بە پتەوکردنەوەی هێزەکانیان، تیپی (٤٦)یان رەوانەی موسڵ کرد، بەشێکیش لە هێزەکانیان گەیشتە هەولێر بۆ ئەوەی رێگای کۆیە بگرن. فەرماندەی سوپای ١٣ فەرمانی بەهێزەکانیدا هێرش بەرن و پێنجوێن بگرن. لە هێڵی قزلجە - شێخ مارین - باهی لەلای دەستە چەپ و لەدەستەراستیش لەناوچەی بێستان قەلا هێرشیان کرد. ئەو هێزە سەرکەوتنێکی بێ وێنەی وەدەست هێنا. هاوکات هێرشیان کردە سەر پێنجوێن و گرتیانەوە. روسەکانیان ناچار کرد بەرەو سنە بکشێنەوە، دوای ئەوەی زیانێکی زۆریان پێ گەیاندن [٨٣:٢٦٨]. هەمدیس تورکەکان ناچار کران لە ٣٠ حوزەیران پێنجوێن چۆڵ بکەنەوە، کەچی دواتر خۆیان خڕ کردەوەو لە ٣ تەموز گرتیانەوە [١٩٢: ٤٠]. بۆیە روسەکان دووبارە ناچاری پاشەکشێ بوون. ئەو هەموو کشانەوەی هێزەکانی تورك و روس و گەڕانەوەیان بووە سۆنگەی وێرانکردنی هەموو دەڤەرە سنووریەکان. کە ئەمە رێگای بۆ ئینگلیزەکان خۆشکرد کرداره سەربازیەکانیان ئاسانتر لەم ناوچەیە ئەنجام بدەن. ئەوە بوو هەر لەو کاتەدا لەسەر داوای مستەفا پاشای باجەلان، یەکێك لە ئەفسەرە سیاسیەکانیان لە خانەقین دانا [١٨٨: ١٦٢]. ئەو ئەفسەرەش مێژۆر سۆن بوو، کە دواتر بووە دوژمنی سەرسەختی شێخ مەحمودو بزاڤی نەتەوەیی کورد.

ئەنجامی ئەو هەموو کردارە سەربازیانە، نەك بەتەنیا دەڤەرەکانی کوردستان وێران بوو، بەڵکو خەڵکەکەش قڕیان تێکەوت. لەو راپۆرتەی کە پرسی کۆکس Percy Cox لە ٧ کانونی یەکەمی ١٩١٧ بۆ شالیارگەی هەندەرانی هیندی ناردووە، زۆر بەروونی باری ئەو کاتەی باشوری کوردستان، لە دەڤەرەکانی خانەقین و دەوروبەری وەدەردەخا. تیایدا نووسیویەتی : "لەلایەن عەشیرەتەکانی جاف و باجەلان و شەرفیبانی و تاڵەبانی و پیاوانی قزلڕباتەوە ئاگادار کراینەوە، هەموویان ئەوەیان رادەگەیاند رەوشت و رەفتاری روسەکان نارەزاییەکی زۆری ناوەتەوە، ئەوان گەرەکیانە ئەو شارۆچکەیە - خانەقین - لە خەڵك چۆڵ بکەن. بۆیە خەڵکەکە بەترسەوە رادەکەنە ئەو شوێنانەی لەبن دەستی تورکەکانە". کۆکس هەوڵدەدا ئەو بارە پەشۆکاوە لەچەند خاڵێکدا روون بکاتەوە، لەخاڵی دووەمیدا دەڵێ : "ئەم شارۆچکەیە لەمەڕو ماڵات خاڵی کراوە. هەموو کێلگەکانی دەوروبەری خانەقین یا تێکدران، یا بێ بارتەقا بران، هەرچەندە خەڵك ناشێن خۆراك بۆ خۆیان دابین بکەن، روسەکان بەردەوام داوای خواردن دەکەن. ئەفسەرەکان ماڵ بەماڵ بەدوای خۆراکدا دەگەڕێن و خەڵك ناچار دەکەن میوانداریان بکات، تەنانەت بێوەژن و دایکی هەتیوانیش لەمە رزگاریان نەبووە" [٢٨٦: ١٠٣-١٠٥]. وەك لە راپۆرتی یەکێك لە ئەمەریکاییەکان هاتووە لەناوچەی کفری لە ٢٣١ گوند ١٠٦ گوند خاپوور کران، بەشێکیشیان بەهۆی نەمانی ئاودێریەوە چۆڵکران [٩٤:١٧١]. ئەم بارە بووە ئەگەری بڵاو بوونەوەی چەندین دەردو پەتای ترسناك، لە ئابی ١٩١٧ کۆلێرا هەموو دەڤەری هەمەدانی گرتەوە. ژمارەی مردووان تەنیا لەو شارەدا رۆژانە دەگەیشتە نزیکەی ٢٠٠ کەس. تەرمەکان کەوتبوون و نەنێژرابوون، بۆیە هەمەدان بەشاری برسیەتی ناونرابوو [٩٤:١٨٠]. سەرباری ئەم نالەباریە کاتێکیش لەلایەن روسەکانەوە پەلامار دەدران، دەبوایە بەپای پەتی و سکی برسی رابکەن و ئەو ناوە جێ بهێڵن. لەکاتی پەلاماردرانی خانەقین ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەت و پیرو منداڵ لە سیروان پەڕینەوەو پەنایان بردە بەر ناوچەکانی کفری، لەلایەکی تر هۆڤیەتی سوپای روس وایکرد خەڵك بەرەنگاریان بێتەوە. زۆر شەڕ لەنێوان کوردو کازاکە خوری لەبەرەکان روویدا. تەنانەت زۆر جاران شەڕە شمشێری تاکەکەسی (مبارزە) روویدەدا [٢٥٦:٥٣].

سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەرو دواتریش کشانەوەی هێزەکانی روس لەجەنگ، ماڵوێرانیەکی گەورەی بۆ کورد تیابوو، چونکە وەك ئاشکرا بوو روس و ئینگلیز هەر

لەسەرەتای جەنگەوە بەرپرسیاریەتی رۆژهەڵاتی تورکیایان لەنێو خۆیاندا پارڤە کردبوو، بەر پرسیاریەتی کوردستان و ئەرمەنستان کەوتبووە ئەستۆی روسەکانەوە. لەدوای سەرکەوتنی روسەکان بەرپرسیاریەتی هەموو دەڤەرەکە کەوتە ئەستۆی ئینگلیز.

فەرماندەی ئینگلیزەکان لە بەغدا بۆ ئەوەی رێگای خۆ چەسپاندنی تورك و ئەڵەمانەکان لە قەوقاز بگرێ، تا لەوێوە هێرش نەکەنە سەر هیندستان [٣١٧: ٤٢-٤٣]. دەبوایە بەهەر شێوەیەك بێت ئەو بۆشاییە پڕ بکەنەوە کە لە سۆنگەی چوونە دەرەوەی روسەکان لەجەنگ پەیدا ببوو. وەك پرسیْ کۆکس لەو لێکۆڵینەوەیەی دەربارەی عێراق لە ٧ شوباتی ١٩٢٩ پێشکەشی کرد، گوتی : "لەسەرمان بوو بەلەزی رەفتار بکەین. هەندێك لەو بەڵگەنامانەی لەکاتی جەنگ وەدەستمان کەوتبوو، ئاماژەیان بۆ ئەوە دەکرد کە ئەڵەمانەکان فەرمانیاندا بوو بە مارشاڵ ڤۆن گۆلتز، سەرکردەی سوپای شەشەمی تورك، وەك رێگا خۆشکردنێك بۆ هیند پێویستە روس و ئینگلیزەکان لەئێران وەدەرنێن" [٢٢٨: ٢٤]. لەهەمان کاتدا، ئەگەرچی روسەکان لەجەنگ دەرچوو بوون، وەلێ هێزەکانیان هێشتا لەو دەڤەرەدا مابوو. رێگای خانەقین و دەریای قەزوێن لەبەردەستی ئەواندا بوو، هەرچەندە بەگوێرەی ئاگر بەستی نێوان ئەڵەمان و روسەکان، دەبوایە روس و تورك لەو ناوچەیەدا بکشێنەوە، وەلێ پێ نەدەچوو ئەڵەمانەکان بەوە رازی بن، لەو کاتەشدا ١١ هەزار ئەڵەمان لە تورکستانی روس دەست بەسەر بوون، نیوەی ئەو ژمارەیەش بەنهێنی هەبوون، وا دەبینرا کە رێکخستنیان ئاسان بێت بۆ ئەوەی پەلاماری ئەفغانستان بدەن، کە خەڵکەکە تەنیا پێویستیان بە هاندانێکی کەم بوو بۆ ئەوەی دژی هیندستان بەکاری دوژمنکارانە هەڵسن [١٢٩: ١٨٤]. لە ئەنجامی ئەو مەترسیانەو ئەو گۆڕانانەی هاتە ئارا، بەریتانیا ناچار بوو دوو هێز بنێرێتە ئێران و کوردستان، یەکیان لە بەغداوە بەرەو باکۆ بە فەرماندەیی دەنستەرڤیل، هێزەکەی تریش بە فەرماندەیی ژەنڕاڵ میلسن، ئامانجی ئەو سوپایەش پتەو کردنی ئەو پشتێنەیە بوو کە لە رۆژهەلاتی ئێران درا بوو. ئەرکی دەنستەرڤیل سەرباری ئەمە ئەوە بوو کەوا رێگا نەدا پەترۆلی باکۆ بکەوێتە بن دەستی تورك و ئەڵەمانەکان، هەرچی سوپای میلسن بوو، ئەرکی بەرپرسیاریەتی دابینکردنی گواستنەوە بوو لە دەریای قەزوێن [١٧٢: ١٠٣]. هەڵمەتەکەی دەنستەرڤیل بەلەزی بەڕێکرا. بەرایێ بڕیار وابوو نێردەکە لە ١٥٠ ئەفسەرو ٣٠٠ ئەفسەری پۆل پێکبێت. وەلێ دەنستەرڤیل لە ١٠ کانونی دووەمی ١٩١٨ هەڵمەتەکەی دەست پێکرد بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی گرد بوونەوەی هێزەکانی

بکات. ۱۲ ئەفسەرو ژمارەیەك لە ئەفسەری پۆل و هەزار کەسی لەتەك خۆیدا برد، لەگەڵ بڕێکی زۆر لەپارەی زیوی ئێرانی و لیرەی زێڕی ئینگلیزی. نێردەکە بەرێگای بەغدا – کرماشان گەیشتە هەمەدان، دواتریش قەزوێن، بەسواری ٤١ لۆری بارهەڵگر، ئەم کارەشیان بۆ بەلشەفیکەکان بەوە پاساودان کرد، کەوا باری قەوقاز دەرگای بۆ تورك و ئەڵەمانەکان والاّ هێشتۆتەوە. وەلێ بەلشەفیکەکان رێگایان نەدا زێتر بڕۆن و ناچار لە ٢٥ شوبات گەڕانەوە هەمەدان [٩٤: ١٤٩-١٥٠]. بەریتانیەکان لەپێناو ئەو هەڵمەتەدا بایەخێکی زۆریان بەرێگاو بانەکاندا، بۆیە کاتێك سەندرسن پاشا، پزیشکی تایبەتی فەیسەڵ، لەگەڵ شا فەیسەڵ چووە ئێران، باسی ئەو رێگاو بانانە دەکا کە تەنیا دەستێکیان پیا هێنرابوەوە [١٨٣:١٧٢].

سەرباری ئەو هەڵمەتە ئینگلیزو فەڕەنگەکان هەوڵیاندا هێزێك لە ئاسوری و ئەرمەنیەکانی ناوچەی وورمێ بەیەکەوە بنێن بۆ پڕ کردنەوەی ئەو بۆشاییەی هاتبووە ئارا. بۆ ئەوەی ئەو هێزەشیان دڕتر بکەن، دەبوایە ئاوری رق و کینە لەنێوان نەتەوەکانی ئەو دەڤەرە خۆشتر بکەن ! لەم رووەوە شالیاری ئەمەریکی لە تاران (کالدوین) حکومەتەکەی ئاگادار کردەوە کەوا هێزێك لە ئەرمەنی و ئاسوریەکان بە فەرماندەیی ئەفسەری بەریتانی و فەڕەنگسی پێکهاتووە، ژمارەیان لەنێوان ٥-٧ هەزار کەسدایە [٩٤: ١٢١-١٢٢]. تەنانەت هەندێك پێیان وایە ئەمەریکایی و هاوپەیمانەکانیش یارمەتی دامەزراندنی هێزی ئەرمەنی و ئاسوریەکانیان داوە. بۆیە لە ١٩ کانونی دووەمی ١٩١٨ ئێران نارەزایی نامەیەکی دا بە کۆمیساری وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو دەوڵەتە هاوپەیمانەکان. دژی پێشێل کردنی سەروەرێتی خاکی ئێران، لە سۆنگەی بوونی ئەو هێزانەی کە ئەفسەری بەریتانی و فەڕەنگسی لەوورمێ رێکیان خستبوو، هاوپەیمانان و وولاتە یەکگرتووەکانیش یارمەتیان دەدان. شالیاری ئەمەریکی بەلەزی وەرامی دایەوە کە ئەوان هیچ زانیاریەکیان لەم بارەیەوە نیە، دوژمنەکانیان گەرەکیانە ئاوری دوژمنداریان بۆ دایسێنن [٩٥:١١٧].

وەك بەرپەرچدانەوەیەکی ئەو هەولانە، لە شوباتی ١٩١٨ تورکەکان هێرشیان بردو توانیان خۆیان بگەیەننە دەڤەرەکانی خوارووی دەریاچەی وورمێ و لە باکوریشدا بەرەو پێشەوە چوون بۆ ئەرزەرۆم و ئەلکسەندەر پۆل، دواتر ئەرزنجان و تەرابزۆن و زۆر مەڵبەندی گرنگی تریان بن دەستکرد [٢٥٥: ٢٠-٢١]. ئەم بارە دژوارەی لە رۆژهەلاتی کوردستان هاتە ئارا، وەك ئەنجامێکی ئەو ململانێیە سەختە، ئاوری ناکۆکی نەتەوەیی و ئایینی لەنێو

دانیشتوانی ئەو ناوچەیە دایساند. بەرایێ شەڕ لەنێوان ئاسوری و عەجەمەکان دایسا، دواتریش کەوتە نێوان کوردو ئاسوریەکانیش. رۆژی شەممە ۱۷ مارت مارشیمون کوژرا، دوو رۆژ دواتر ئەو هەواڵە گەیشتە وورمێ، رۆژی ۲۱ بەتوندی کلپەی سەند، هەر لەو رۆژەدا چەکدارە کوردەکانی لای دیانەکان چەك کران و کوژران. نووسەرەکان ژمارەی کوژراوەکانی وورمێ بە ۱۰-۱۵ هەزار کەس دادەنێن، پاشان ئاسوریەکان پەلاماری "چاریق"یان دا، دوای شەڕێکی سەخت دایکی سمکۆو کچێکی جەعفەر ئاغای برای کوژران [۲۶: ۳۱۰-۳۱۱]. بەم چەشنە کوردستان کرا بە مەڵبەندی ململانێی ئایینی و شەڕی نێوان کوردو ئاسوری، کە بێگومان ئەمە رەنگدانەوەیەکی ئاشکرای ململانێیە نێو دەوڵەتیەکە بوو. هاوکات ئەو رووداوانە بوونە ئەگەری زێتر خۆ تێ هەڵقورتاندنی دەوڵەتە گەورەکان. هەر لە مانگی مارتدا ئەمەریکاییەکان لیژنەیەکیان بۆ هاریکاریکردنی ئاسوریەکان بەیەکەوەنا، کە بەلیژنەی ئێران ناسرا. ئامانجی راگەیانراوی ئەو لیژنەیە فریاڕەسی ئاسوری و ئەرمەنە کۆچکردووەکان بوو لە تورکیاوە بۆ ئێران. وەلێ رۆژنامەی تریبون Tribune کە لە نیویۆرك دەردەچوو ئەو راستەقینەی نەشاردەوە کەوا لیژنەکە ئامانجی پەرەپێدانی بڕوایی ئێران بوو بە ئەمەریکا [۹٤:۱٦٥]. شایەنی باسە تورکەکانیش کە لەباکورەوە هێرشیان دەکرد، ئەوانیش سڵیان نەکردەوە لەوەی ئاوری دووبەرەکی ئایینی خۆشبکەن، بۆ وێنە سوپای تورك هەر کە گەیشتە دەڤەرەکانی بایەزیدو دەورووبەری نزیکەی ۱۰۰ ئەرمەنیان کوشت [۲۷۳:۳۲٦]. مەبەستیان لەمەش ئەوە بوو ناکۆکی نێوان کوردو ئەرمەنەکان قووڵتر بکەنەوە، چونکە زۆربەی سوپاکانی عوسمانی لەو دەڤەرانەدا، لەبەر ئەوەی کوردستان بوو، لە کورد پێکدەهات.

لەکاتێکدا تورکەکان لە باکورەوە سەرکەوتنیان وەدەست دەهێنا، ئینگلیزەکان هەوڵیاندەدا لە باشورەوە شوێن پێیان لەق بکەن. بۆیە ژەنەڕال مارشاڵ هەوڵیدا هەڵمەتەکەی دەنستەرڤیل بەهێز بکات، چونکە ڕێگای نێوان هەمەدان و قەسری شیرین بۆ بەریتانیەکان مەترسیدار بوو، ئەو پڕوپاگەندانەی ئەڵمان و تورکەکان لە نزیك کفری دەیانکرد، بۆ بزواندنی هۆزە کوردەکانی رۆژهەڵات، کاریگەریان لەسەر ئەو ڕێگایەدا هەبوو. بۆیە ژەنەڕال مارشاڵ بڕیاریدا هێزەکانی تورك لەقەرەتەپەو کفری و دوز خورماتو دەربەڕێنێ و دەڤەرەکە بن دەست بکات [۲٥۰:۱٥۳]. هاوکات شالیارگەی جەنگیی داوای لە ژەنەڕال مارشاڵ کرد بەرەو

سلێمانی و کەرکوك بکەوێتە ڕێ. تـا فشـاری تورکـەکان لەسـەر قـەوقازو ئازربایجـان سـووکتر بکات [١٩١:١٨٩]. بەمەش لەلایـەك تورکـەکان ناچـار دەبـوون هێزەکانیـان لـەو دەڤەرانـەدا بکێشنەوە، لەلایەکی تـر کاریگەریـەکی گـەورەی دەبـوو لەسـەر ڕای گشـتی لـە ئـێران و ئەفغانستان، ئەمـەش دەبـووە سـۆنگەی ئـەوەی پاڵپشـتی سیاسـەتی بەریتانیـەکان بکـەن و پڕوپاگەندەی ئەڵەمانەکان چـرووك ببێ [١٦٦:٢٥٠]. ئینگلیزەکـان لـەمانگی ئایـاردا توانیـان کەرکوك داگیر بکـەن، وەلـێ دواتـر کـەرکوکیان جـێ هێشـت و کشـانەوە، ئـەو کشـانەوەیە کوردی نیگەران کرد، چونکە هیوایەکی زۆریان بە ئینگلیزەکان هەبوو لەم بـارە ناهـەموارەیان ڕزگار بکات ! کەچی تورکەکان بەخۆشحاڵیەوە سەیری ئەو کشـانەوەیان کـرد، وای بۆچـوون هاوپەیمانان دوچاری ئەستەنگ هـاتوون، بۆیـە لەیـەکێك لـە بەلاڤۆکـەکانیان بـۆ کوردیـان ڕوونکردەوە کەوا چارەنووسێکی ترسناك چاوەڕوانی هەموو ئەو ساویلکانە دەکا کە هاریکـاری دەسەڵاتدارانی بەریتانی دەکەن. لەو بەلاڤۆکەدا کوردیان بە ئەرمـەن و ئاسـوریەکان چاوترسـای دەکرد، کە ئـەوان چیـان بەسـەرهات و چـۆن کـاروانی بێـوەژن و هـەتیوانیان بـەرەو هەمـەدان بەڕێوەیە ! ئەوەشیان ڕوونکردەوە کەوا هێزەکانیان بیجارو سـنەیان گرتـووەو لـەو ماوەیەشـدا هـەموو ئـێران پـاك دەکەنـەوە [١٤٥:١٥]. لەڕاسـتیدا کشـانەوەی ئینگلـیز بـۆ کوردەکـان ڕووداوێکی ناخۆش بوو. وەك ڕۆژنامەی تایمز لە ١٥ تشرینی دووەمـی ١٩١٩ نووسـی : "ئـەو ڕووداوە بەڵێنەکانی بەریتانیای خستە تاقیکردنـەوە، لـە ئـەنجامدا بـووە شکسـتێکی گـەورە لـە هەڵوێستی سیاسی و سەربازی بەریتانیەکان، هۆزێکی وەکو هەمەوەند تووشی بێ هیوایی بوون و بوونـە دوژمنـی ئینگلیزەکـان [٣٣:٨٧]. کـەچی دواتـر ئینگلیزەکـان هـەمدیس هێرشـیان کردەوە، تورکەکان ناچاری کشانەوە بوون. سوپای تـورك بەکۆمـەڵ ئـاژەڵ و موڵـك و ماڵیـان بردو دەستیان بەسەرداگرت. دێهاتەکانی کوردیان خاپوور کرد، تەنیا بەتاڵان کردن نەوەسـتان، بەڵکو دەستیان کرد بە کوشتنی کوردە دووره پـەرێزو نیشتەجێکان. کـە ئەمـە بـاری کـوردی هێندەی تر سەخت کرد [١٩٥:٨]. لە ڕاستیدا سوپای تورك پێویستی بەهەموو شـتێك هـەبوو، بێ بەش بوو لە هەموو ئەو شتانەی کە سوپا پێویستی پێ بـوو. هۆکـاری گواستنەوەیان نـەبوو، ئازووقەو خۆراکیان نەبوو. سەربازە تورکەکان لە شەوانی سەخت و ئەنگوستە چاوی زسـتان لـە دەرگای کوردە هەژارەکانیان دەدا: "هجی الله اشکنه اجـم، بـیر پارچـه اکمـك ویـر از هورمـا

هجی". بۆ خاتری خوا برسیمە، لەتێك نان و هەندێك خورمام بدەنـێ [٢٥٦: ٤٦-٤٧]. وەك ئەحمەد خواجە لەبیرەوەریە مێژووییەکەی دەگێڕێتەوە : "سەربازەکانی تورك برسـی، تینـوو، بـێ بەرگ، بێ پێڵاو، زۆریان بەتفەنگی بێ فیشەکەوە رەق دەبوونەوەو دەمردن، حکومـەت لـەجیاتی پۆستاڵی عەسکەری، بەشی جووتێـك کاڵـە زەوێڵـە چـەرمی دەدانـێ، ئـەوانیش لـەجیاتی پێـڵاو بەناچاری دەیانکوڵاندو دەیانخوارد !" [٨٥:٥٣]. ئەو گرانی و برسیەتیە گەیشتە رادەیـەکی وا گەورەترین و قووڵترین دوژمنداری لەیاد بکرێ، ئاغا پـەترۆس کـە دوای کوژرانـی مارشـیمون بووە سەرکردەی سەربازی ئاسوریەکان، لە ١٩ نیسـانی ١٩١٨ بەیاننامـەی ئاشـت بوونـەوەی دیان و موسـڵمانەکانی دەرکـرد. تیـایدا نووسـیبووی : "... براینـە مـن کورتەیـەکتان لەهـەلو مەرجی شنۆ بۆ رووندەکەمەوە کە بەچاوی خۆم دیومە. لە کۆڵان و رێگای ناو مـاڵاندا ئێسقان گۆشتی پێوە نەمابوو، پارچـەکانی سـکەلیت و هـەیولایان هەڵنەوەشـاوەو وەکـو خـۆی پێکـەوە مابوو. خۆراکی سەگەکانی ئەوێ گۆشتی مرۆڤە... چەند لەبـەد بـەدتر بینـراوە، دایـك گۆشـتی رانی مناڵە خۆشەویستەکەی خۆی خواردووە، هەی هاوار براینـە هاوارتـان لێدەکـەم، لـەپێناوی مرۆڤایـەتی هـەرچی زووتـر رۆژگـاری ئاشـتبوونەوە تـەواو بکـەن بـۆ ئـەوەی سـاڵی داهـاتوو پێویستیمان بـە خواردنـی گۆشـتی نـەوەی خۆمـان نـەبێ..." [٣١٥:٢٦]. ئـەو برسـیەتیە وای لەیەکێکی وەکو سمکۆ کرد، کەسی دەست نەکەوت لـەچیا زێـتر پـەنای وەبـەربا، بۆیـە داوای یارمەتی لێکرد. رووی لەچیاکان کردوو هاواری کرد : "فریای میللەتی کورد بکەون، کە لـەو شاخانەدا لە برسان ناچار بوون گیا دەخۆن... من چی بکەم دەنگم بگەیەنمە پـاریس بـۆ ئـەوەی فریای میللەتی کورد بکەوێ، تۆ – واتە چیا – لە جیاتی ئێمە دەنگمان بگەیەنـە بـەو وڵاتانـەو داوای ناردنی خواردنیان لـێ بکە، پێویستیمان بە قوتابخانە هەیە، پێویستیمان بەهـەموو شـتێك هەیە کەبەرەو شارستانیمان ببـات، مـن بـاوەڕم بـەروس و تـورك و ئێـران نیـە، ئێـوەن هیـوای ئـەوەتـان لـێ بکرێت یارمەتی کورد بدەن" [٢٧٥:٤٣]. بەم چەشـنە لـەدوا سـاڵی جـەنگدا لـە کوردستان برسیەتی گەیشتبووە رادەیەکی وا وەك رەفیق حیلمی دەڵێت : "ئیـتر ئەوانـەی خـوا پاروە نانێکیشی دابوونێ و بـە کولەمـەرگی دەژیـان، لەبـەر هـاوارو نـوزەی بـێ هـێزو دەنگـی پاڕانەوەی ژن و مناڵ و پیرەمێردە نەخۆشەکانی دەست و بێ ئاوساو بەدەست خۆیـان نـەبوو لـە قوڵپەی گریانیان دەدا" [٢٠:٣٢].

ئینگلیزەکان سوودیان لەم بارە نالەبارە وەرگــرت و ســەرکەوتن لــەدوای ســەرکەوتنیان وەدەست هێنــا. لــە ٣١ تشرینی یەکــەمی ١٩١٨ هــەواڵی ئــاگر بەســت بــەر گوێــی ســەربازە تورکەکان کەوت. هێزەکانی بەریتانیا لەو کاتــەدا لەباشــوری کوردســتان لەســەر هێڵــی گشــتی خانەقین – کفری – کەرکوك – گەیارە – عــەنا بــوون، سەربــاری ئــاگــر بــەست ئــەو هێزانــە بەردەوام بوون لەسەر پێشرەوی خۆیان تا (موسڵ)یشیان نەگرت نەوەستان [١٩١:٢٠٧]. بــەم چەشنە جەنگی جیهانی یەکــەم لەبــەرەی رۆژهــەڵات دیمــاهی هــات، ئــەو جەنگــە وەك ونســتون چــەرچل دەڵێــت : "جیــاوازی لەگــەڵ هــەموو شــەرە کۆنــەکان هــەبوو، لەلایــەنی هــێزی لــەبن نەهاتووی لایەنە شەڕوانەکان و هەبوونی هۆکاری خاپوورکردنی مەترسیدار. هەروەها جیــاوازی لەگەڵ هەموو شەڕە نوێیەکانیش * هەیە، لــەو دڕندەییــەی کــە تیــایدا ئــەنجامدرا، ئــەو شــەڕە هەموو مەرگەساتی سەدەکانی بەخۆوە گرتبوو، بەتەنیا ســوپا نەخرایــە جەنگــەوە، بــەڵکو گــەلان بەتەواوی خرانە نێو کورەکەیەوە، هەموو هەوڵێك درا بۆ برسیکردنی تەواوی نەتــەوەکان، بــەبێ گوێ دانە رەگەزو تەمەن، تا خۆیان بەدەستەوە بدەن" [١٩:١٣٦]. کوردستان بــووە گۆڕەپــانی ئەو جەنگە ترسناکە لەبــەرەی رۆژهــەڵات. بۆیــە بەشــێکی زۆر گــەورەی زیانــەکانیش بــەر ئــەو کەوت، بەبێ ئەوەی نەدەستی لە جەنگەکەدا هەبێت و نە لەبەرژەوەندی ئەویشدا بووبێــت و نــە ئارەزووشی لێ بوو بێت !

---

* بێگومان مەبەست لە شەڕەکانی رۆژگاری نوێ، بەگوێرەی ئەو سەردەمەی چەرچل تیایدا ئاخاوتووە، کە بەر لەجەنگی جیهانی دووەم بووە.

## باسی دووەم: کورد لە نێوان
## دۆزی نەتەوەیی و بەرژەوەندی لایەنە شەڕوانەکان.

وەك ئاماژەی پێکرا، بەر لە دەستپێکی جەنگ، لایەنە رکابەرو بەرژەوەندی دارەکان، چالاکی و جموجۆڵی سیخوڕی و چاو ساغیان لە کوردستان چڕتر کرد.روسەکان کە هێشتا هیوایان مابوو تورکەکان تێکەڵ بە جەنگ نەبن. بە وورییاییەوە هەڵس و کەوتیان دەکرد، لە نامەیەکی سازانۆف کە بۆ یەکێك لە لێپرسراوە روسەکانی ناردبوو، هاتبوو : "ناتوانین ئەوە بێنینە بەر چاو ئەنجامی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان چی دەبێت. ورووژاندنی هەر هیوایەکی درۆزنانە لای کوردەکان، بە بەڵێنێکی دیاریکراو، بە کارێکی ترسناك دەژمێردرێت" [٨٨:١٥٦] . لەو سۆنگەیە بوو کاتێك شێخ عەبدولسەلام پەنای بۆ بردن و داوای یارمەتی لێکردن، پێیان راگەیاند باشتر وایە خۆی گوم بکا، چونکە لەم کاودانەدا لە بەرژەوەندی ئەواندا نەبوو دوژمنداری تورکەکان بکەن.هەروەها پێیان گوت: پێویستە دوو تا سێ مانگ چاوەڕوان بێت. ئەگەر پەیوەندی لەگەڵ تورکەکان بەرەو باشی چوو هەوڵدەدەن لێبوردنی بۆ وەربگرن، نەگەر بەرەو ناخۆشیش چوو، ئەوا هێزو چەکی دەدەنێ و رەوانەی بارزانی دەکەنەوە ! [٢١:٣٠٨]. شایانی ئاماژە پێکردنە شێخ عەبدولسەلام گەرەکی بوو پەیوەندی بە ئینگلیزەکانیشەوە بکات. لەم بارەیەوە ویگرام نووسیویەتی: "کە شێخ ژنەوتی ئێمە دەزڤرینەوە بەریتانیا، ئامادەیی خۆی نیشاندا سەردانی پاشای بەریتانیا بکا و لە سەر دۆزی سەربەخۆیی کوردستان لەگەڵی باخێوی!"[١٣٧:١٦٨]. بەر لە دەستپێکی جەنگ ، بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردی بەرەو پێشوە چوون و پێشکەوتن هەنگاوی دەنا. لە زۆر لە دەڤەرەکانی کوردستان هەوڵدان بۆ سەربەخۆ بوون لە ئارا دابوو، سەرۆکە دیارەکانی کورد ئاگاداری یەکتر بوون و دوورو نزیك پەیوەندیان لەگەڵ یەکدا هەبوو، بۆ وێنە پەیوەندی لە نێوان شێخ عەبدولسەلام و سمکۆدا هەبوو.[١٣٧:١٤٤]، هەروەها لە نێوان عەبدولڕەزاق بەدرخان و شێخ عەبدولسەلام و شێخ عەبدولقادری نایری هەبوو [٢١:٣٠٨]. هاوکات بەدرخانیەکان پەیوەندیان لەگەڵ شێخ مەحمود هەبوو لە سلێمانی، هەر لەو دەمەشدا مەلا سەلیم لە بەدلیس راپەڕینەکەی سازدا،کە دواتر سەرکوتکراو پێشەوای راپەڕینەکە ، مەلا سەلیم خۆی لە باڵوێزخانەی روسەکان حەشاردا. ناوی سمکۆش لە ئۆفیسە دیپلۆماتیکیەکانی فارس و تورك و روس و ئینگلیز بە فراوانی ناسرابوو، لە باڵوێزخانەی ئەو دەوڵەتانە دۆسیەی گەورەی بۆ رێکخرابوو .[٢٣٥: ٢٤٩-٢٥٠].

بەم جۆرە لـە لایـەك کـورد بـۆ خـۆی هـەوڵیدەدا و لەلایـەکی تـر لایەنـە بـەرژەوەندی دارەکان گەرەکیان بوو لە پێناو بەرژەوەندیەکانی خۆیاندا سوود لە کورد وەربگرن. یەکێك لە شارەزاکان لەم بارەیەوە نووسیویەتی : "ئەڵەمانەکان هەوڵیاندەدا بگەنە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و جێ پێی خۆیانی تێدا قایم بکەن، جیاوازی ئەڵەمانەکان لەگەڵ روس و ئینگلیزەکان لەوەدا بـوو ئەوان پشتیان بە یارمەتی و پشتگیری حکومەتی تورکیا و بەڕێوەبەرایەتی ئەو دەڤەرانە قایم بوو. لـەوەش زێـتر سـیخوڕەکانی ئەڵـەمانیا هەمیشـە دەسـت پێشـخەریان دەکـرد و ڕێگایـان پـاك دەکردەوە" [٤٥:٣٩١]. ململانێیەکە بە تەنیا لە نێوان روس و ئەڵەمانـەکان نـەبوو بـۆ ئـەوەی کورد بەلای خۆیاندا ڕاکێشن. ئینگلیزەکانیش ڕۆڵێکی بەرچاویان هـەبوو، بـەر لـە دەسـتپێکی جەنگ نمایندەی کونسوڵی بەریتانیا لـە شـاری (وان) کەوتـە دامـەزراندنی پەیوەندیـەکی نزیـك لەگەڵ سەرداره دەسەڵاتدارەکانی دەڤەری بەدلیس. لە لایـەکی تـر کونسـوڵەکانی ئینگلـیز لـە ئامەد (دیاربەکر) و موسڵ بە گەرمی کەوتنـە پڕوپاگـەندە کـردن دژی روسـەکان، کـە چاویـان بڕیبووە ڕۆژهەڵات و باکوری کوردسـتان. ئەوانـە خەڵکەکـەیان وا تێدەگـەیاند لـە ماوەیـەکی نزیك رۆژهەڵاتی ناڤین دەکەوێتە بن ڕکێفی ئینگلیزەکان. بەم چەشنە شیان ژمارەیـەکی زۆر لـە سـەرۆکە کوردەکـان بـە لای خۆیـان رابکێشـن. لەوانـە هـۆزی کـەلـــهوڕ [٣٥: ١٨-١٩]. چالاکی ئینگلیزەکان هەموو کوردستانی گرتبۆوە، بە شێوەیەکی تایبەتیش باشوور و ناوەڕاستی کوردستان. هەرچی روسەکان بـوون، لـەم پێواژۆکـەدا زێـتر بایـەخیان بـە کوردەکـانی نزیـك دەڤەرە سنووریەکانی خۆیـان دەدا، بۆیە شـکاکەکان و خانـەکانی مـاکۆ جـێ چـاوی روسـەکان بوون. سمکۆ خۆشی ئارەزووی هەبوو لە روسەکان نزیـك بێتـەوە، هەرچـەندە لـە سـاڵی ١٩١٣ هاریکاری ئازربایجانیەکانی دەکرد، کە لایەنگری عوسمانیەکان و دژ بە روسەکان بـوون. وەلـێ هەر لەو ساڵە یەکێك لە ئازربایجانیەکانی دایـە دەسـت روسـەکان، تـا سـەرنجیان بـۆ لای خـۆی رابکێشێ . لەمەش سەرکەوتنی وە دەست هێنا. هەر بـۆیـەش لـە بـن جـەختی روسـەکان، دوو سەرۆکی کورد کە پێشتر رکابەری سمکۆ بوون، هەرێی ئەمەکداریان پێدا [٣١٠:١٤٤].

سـەرباری ئەمـەش ئەڵەمانـەکان بـە هـۆی چـڕی چالاکیـەکانیان توانیـان کاودانەکـە هەڵوەگێڕنەوە، ئەوە بوو پەیتا پەیتا چاوساغیان دەنارده ئەو دەڤەرانە. لە بـەهاری ١٩١٤ چـەند ئەڵەمانێك سەریان لە هەرێمی وورمێدا، زۆر شوێنی تر گـەڕان، وێنـەی پـڕۆژە جەنگیـەکانیان گـرت. گـەرەکیان بـوو ئاگـاداری هەڵوێسـتی جـەنگی و ئـابووری روسـەکان بـن لـە بـاکوری

ڕۆژئاوای ئێراندا، واتە کوردستان. (شیومان) کە سیخوڕێکی بەناوبانگی ئەڵەمان بوو، لە وورمێ لەگەڵ کونسوڵی تورکەکان کەوتە گفتوگۆ، بەو نیازەی کونسوڵخانەیەك لە وورمێ بکەنەوە و کاری سیخوڕیەتی وە ئەستۆ خەن [٤٦: ٥١٠]. هەروەها (شیومان) چاوی بە سەرداری کەلهوڕەکان کەوت، نزیکەی بۆ دوو کاتژمێر بە نهێنی گفتوگۆیان کرد، هەرچەندە ئەنجامی ئەو گفتوگۆیە نەزانرا، وەڵێ ئاشکرا بوو کە گەرەکی بوو کەلهوڕەکان بۆ خۆی ڕابکێشێ [٣٢٦: ٧٠]. لە ئەنجامی ئەو هەوڵە سیخوڕیانەی هەواڵگرەکانی ئەڵەمان و تورك و ئەو پڕوپاگەندە فراوانەیَ لە کوردستان دەیانکرد، توانیان سمکۆ و مورتەزا گلی خان، سەرداری ماکۆ بۆ لای خۆیان ڕابکێشن [١٥٦: ٨٨].

لەو ماوەیەدا دۆزی کورد لە نێو بازنەی ململانێیەکی سەختدا دەخولایەوە، وەك لازاریف دەڵێ: "لە دراوێك دەچوو بۆ ئالو گۆڕ بشێت" [٤٦: ٥١٤]. لە دیماهیدا تورکەکان بە هۆی هاوئایینی و بانگی غەزادان توانیان بەشێکی زۆری کورد بۆ لای خۆیان ڕابکێشن. لە دەستپێکی جەنگدا ، هێزێکی تورکی بە پاڵپشتی هەزاران سوارەی کوردی چوونە ناو خاکی ئێران و مەهابادیان داگیر کرد. ئەو هێزانە لەگەڵ عەشیرەت و خێڵە کوردەکانی ئێران توانیان بە سەر روسەکان سەرکەون. پاشان بەرەو تەورێز چوون کە روسەکان پێشتر چۆڵیان کردبوو، پارێزگارەکەشی بەرەو تاران رایکرد، ئەوێشیان داگیر کرد [٣٤١: ٤٥-٤٨]. هەروەك لە هەواڵنامەکانی ڕۆژانەی عوسمانیەکان، کە لە ١٩١٤/٩/٢٧ نووسراوە، هاتووە: "شەڕێك لە نێوان عەشیرەتی قەرداری کورد و روسەکان روویدا، لە ئەنجامدا ئەفسەرێك و ٥٠ سەربازی روس کوژران [٨٣: ٦٤٢]. ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کەوا کورد جەنگاوەرو ئازا بووینە و کەمیان لێ کوژراوە . بگرە لە شەڕێکی وەکو چناق قەڵا، ٤٠٠ کەس لە باشترین رۆشنبیرانی کورد لە ئەفسەرو سەرباز کوژران [٢٥٩: ٢٨٥]. هەر لە سەرەتای جەنگیشدا، سمکۆ بە هێزێکی ٣ هەزار کەسیەوە لە نزیك خوی هاوکاری سوپای تورکەکانی کرد، روسەکانیان ناچار کرد، ناوچەکە چۆل بکەن و ئەو ناوە کەوتە دەست تورك [٢٦: ٣٣٧]. نەك پیاوە دیارو ناسراوەکان ، بەڵکو ئەوانەی لە سەربازیش رایانکردبوو گەڕانەوە و بەرەو پیلی غەزا چوون ! ئەحمەد خواجە کە باسی هاتنی خەلیل پاشا دەکا بۆ لای شێخ مەحمود و داوای بەشداری جەنگی لێدەکا، نووسیویەتی : "دوای ماوەیەکی کەم وولات شلەژا، چەکداری سوارە و پیادەی ناو چیا کە دەستی حکومەتیان نەدەگەیشتێ، لە عەشیرو ناو شار و لادێی و هەڵاتووی سەربازیەوە، بە

ناوی (غەزا)وە بە چەك و كۆڵی خواردەمەنی خۆیانەوە، دەستە دەستەو بـە هـەزاران ڕژانـە نـاو شاری سلێمانیەوە" [٨٤:٥٣]. کورد بەو خوێن گەرمیـەوە بـۆ عوسمانیـەکان چـووە گۆڕەپانی شەر. کەچی تورکەکان کوردەکانیان دەخستە بـەرەکانی پێشـەوەی جـەنگ، چـەکێکی واشـیان نەدەدانێ کە بتوانن بەشێوەیەکی باش بەرگری لە خۆیان بکـەن. ڕاستە دەوڵـەت خـۆی چـەکی باشی کەم بوو، وەلـێ سۆنگەی بنەڕەتی بـڕوا نـەبوون بـوو بـە کـورد. زنـار سلۆپی کـە خـۆی یـەکێك بووە لە بەشـدارانی جـەنگ ، لـەم بارەیـەوە لـە یاداشتـەکانیدا نووسـیویەتی: "کازاکـە روسەکان بە جـۆرە تفـەنگێك چـەکدار کرابـوون کـە دوو هـەزار مـەتر دەڕۆیشـت، شمشێری کازاکیان پێ بوو کە بە تیژی بەناوبانگـە و ووشـتری دەکـرد بـە دوو لەتـەوە. هـەرچی کـوردە هەژارەکان بوون تفەنگی ماوزەریان هەبوو، کە ئەو پەڕی هەزار مەتر دەڕۆیشت، دەبوایـە دوای هـەر تەقەیـەکیش پـڕ بکرێتـەوە. دوکـەڵێکی وەك دوکـەڵی کوانـوی لێ هەڵـدەستـا. شـمشێرەکـانیشـیان هێندە ناسك بـوو دەتگـوت لـە داری سـاج چێکـراوە. سـەرباری هـەموو ئەمەش، کـوردەکـان بـەرەنگـاریـەکـی تـونـدی کـازاکـەکـانیـان دەکـرد و زۆر جارانیـش بـە سەریاندا زاڵ دەبوون" [٤٥:١٧٦]. لـە پـاڵ ئەمـەش لـە سـۆنگەی شـارەزایی کوردەکـان لـەو ناوچانەدا، کە خاکی خۆیـان بـوو، واتـە کوردستان بـوو، تورکـەکان توانیـان زۆر سـەرکەوتن وەدەست بێنن. ئەڵەمانەکانیش پەیتا پەیتا نێردەکانیان دەنارده ئێران بە گشتی و کوردستان بـە تایبەتی، لە پێناو وەدیهێنانی ئامانجەکانیان. ئەو نێردانە بە سەر شـار و ناوچـە جیاجیاکـان پارڤـە دەکران. لە هەموو کارەکانی ئەو نێردانە ترسناکتر ئەوەبوو چەك و پارەیـان دەبـەخشیـەوە بـۆ ئەوەی خۆبەختکەر (متطوع) خڕ بکەنەوە و فێری چۆنیەتی جەنگ کردنیان بکـەن دژی روس و ئینگلیزەکان، بۆ ئەوەی ئەو نێردانە کارەکانیان بەباشترین شێوە ئەنجام بدەن . [١٠١: ٣٠] .

پڕوپاگەندەی غەزا کاریگەری خراوی لەسەر بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد هەبوو . وەك باسیل نیکتین دەڵێ: "جەنگ ئەو هەوڵە سەرەتاییانەی وەستان کـە ئامـانجی ڕێکخسـتن و چێکردنی بیرێکی نیشتمانی هاوبەش بـوو. بانگـەوازی جـەنگی پـیرۆز ڕێگـای بـە تورکـەکاندا جارێکی تر کوردەکان بە ڕێگایـەکدا بـەرن، دژی بـەرژەوەندی نیشـتمانی وگـەلی ڕاستـەقینەی خۆیان بێت. تورکەکان دەیانویست سوود لە کوردەکان وەرگرن لە پێناو ئامانجە جەنگیـەکانی خۆیـان ، وەلـێ بە ووردیش زێرەڤانیان دەکردن. هەروەها نیکیتـین ئامـاژەی بـۆ ئـەوە کـردووە کەوا لیستێکی گەورەی هەبووە ناوی ژمارەیەکی زۆر لە نیشتمان پەروەرانی کوردی تیـا بـووە لە کاتی جەنگدا لە سێدارە دران [٨٣:١٤٢].

روسەکان پێیان وابوو پێویستە بە وردیەوە مامەڵە لەگەڵ دۆزی کورد بکرێت. لەم رووەوە ماوەیەك بەر لە دایسانی جەنگ لێپرسراوێکی روسی نامەیەکی بۆ شالیاری کاروباری جەنگ نارد، تیایدا دەیگوت ئەگەرجەنگ لەگەڵ تورکیا دایسا، دۆزی کورد دۆزێکی گرنگ دەبێ و پێویستە بە ئاگاداری و وردیەوە ئاوڕی لێ بدرێتەوە [٤٥:٣٥١]. روسەکان بەتەنیا نەیاندەویست بۆ شەڕەکانی نزیك سنوورەکانی خۆیان سوود لە کورد وەرگرن، بەڵکو هەندێکیان رایان وابوو کورد بۆ شوێنی تریش بنێرن. هەروەك چۆن تورکەکان ژمارەیەکی ئێجگار زۆر کوردیان بە درێژایی چوار سەدە لە ئەوروپا بە کوشت دا ئەوانیش وا بکەن لەم بارەیەوە یەکێك لە ئەفسەرە روسەکان بە ناوی ئۆشاکرۆف، کە فەرماندەی بەتالیۆنی کازاکی ئێرانی بوو، لە کۆتایی تشرینی یەکەمی ١٩١٤ پێشنیارێکی پێشکەش بە کونسوڵی روس کرد لە کرماشان، تیایدا داوای کرد سوود لە عەشیرەتە کوردە شیعەکان و لوڕەکان وەربگیرێت بۆ داگیرکردنی کەربەلا. بۆ ئەمەش هاریکاری هاوبەش لەگەڵ ئینگلیزەکان بکرێت. کە لەوانەیە ئەو هەنگاوە ببێتە ئەگەری وەدەست هێنانی سۆزی موسڵمانەکان و کشانەوەی هێزەکانی تورکی لە سنوورەکانی روسیادا[٩٤:٨١].

تورکەکان بە تەنیا بەمە نەوەستان کورد بەکار بهێنن و وەکو قەلغانی مرۆیی بیخەنە پێشەوەی سوپاکانیان، بەڵکو دەیانویست ئەو کارە دزێو و نالەبارانەی خۆشیان ئەنجامیاندەدا بیخەنە ئەستۆی کوردەوە. وەك جاك جیفری سەرۆکی نێردەی ئینگلیزی دەڵێ : "شەڕی راستەقینە لە یەکی تشرینی یەکەمی ١٩١٤ دەستی پێکرد، لەو رۆژەدا هێزێکی گەورەی کورد هاتنە تەرگەوەڕ و ئۆردووی کازاکەکانیان وەدەرنا.، ئاوریان بەردایە گوندی نەستووریەکان و کەوتنە کوشتنی خەڵك و تالانکردنی ماڵەکانیان. ژمارەیەکی زۆری خەڵك رایانکرد و پەنایان بردە بەر وورمێ. دوای ئەوە بە دە رۆژ کوردەکان بەرەو دەشتاییەکان هاتن و هەر شەوە گوندێکی نزیکیان تالان دەکرد و ئاور تێبەردەدا، وورده وورده بەرەو شار دەچوون. نەستووریەکانیش وەك چۆن پەز لەبەر گورگ رادەکا، ئیوها رایاندەکرد. ئێمە بەرایێ لەو بڕوایە دابووین ئەو هەڵمەتانە کوردین، وەلێ راستەقینە پێچەوانەی ئەمە بوو، ئەو هەڵمەتانە هەڵمەتی حکومەتی رێکخراو بوو، ئەفسەری سوپای تورکی بوون، کە هۆزە کوردیەکانیشیان بەخۆوە دەگرت. ئامانجیان دەرکردنی روس و داگیرکردنی وورمێ بوو. هۆکارەکەشی پاڵپێوەنەری ئەڵەمانی بوو [٢١٢: ٢٠٥-٢٠٦].

ئەگەر کوردەکان لە سۆنگەی ئەوەی لە پێشەوەی سوپا بوون و لە کاتی سەرکەوتنە سەربازیەکان کوشتن و برین بەشی ئەوان بوو، ئەوا لە ژێرکەوتنەکانیش هەمان چەشن بوو. کاتێك تورکەکان لە تشرینی دووەمی ١٩١٤ توانیان بەرەو ئەرزەڕۆم و وان پێشڕەوی بکەن، ئەنوەر پاشا هێزێکی زۆری کۆکردەوە، کە ژمارەیان ٩٠ هەزار کەس دەبوو، توانیان هەندێك سەرکەوتن بە دەست بێنن و لە ٩ کانونی یەکەم بەرەو سەری قامیش بڕۆن، وەلێ روسەکان توانیان هێزەکانی عوسمانی بوەستێنن و هەندێك شوێنی ستراتیژی بگرن، دوای ئەوە بە چوار رۆژ سەرکەوتنێکی گەورەیان وە دەست هێنا و فەیلەقی نۆیەمی عوسمانیەکان هەمووی بە دیل گیرا [٧٢:١١١]. تەنانەت لەو شەڕەدا وەك عوسمان عوێزی باس دەکا، کە بە داخەوە ئاماژەی بۆ هیچ سەرچاوەیەك نەکردووە، ٤٠ هەزار جەنگاوەری کوردیان بۆ ئەو بەرەیە نارد. دوای ئەوەی کە زانیان ناتوانن بەرامبەر هێزەکانی روس خۆیان بگرن چونکە لە تفەنگ زێتریان پێ نەبوو، ئەو هێزەیان بە سەر چیای(الله اکبر) هەڵزنان، کە باوبۆران هەمووی لە گۆ خستن و رەقبوونەوە [٣٢: ٢٨-٢٩]. شایانی باسە جەمال نەبەزیش هەمان راستی دوپات دەکاتەوە کە دەڵێ لە ساڵانی جەنگدا ژمارەیەکی زۆر سەربازی کوردیان نارد بۆ ناوچەی قەوقاز، زۆربەیان لە سەرماندا رەقبوونەوە[٨٧:١٥]. دکتۆر کەمال مەزهەریش لە کتێبەکەی کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی ئاماژە بۆ هەمان بابەت دەکات. ئەمە سەرباری ئەوەی کاتێك سوپای روس بایەزید و ئەلاگێرد و وانیان گرت، هێزی ئەرمەنی لە پێشەوەی سوپاکەیانەوە بوو، ئەوانە زیانێکی گیانی و ماڵی زۆریان لە کورد دا. جگە لەوەی تورکەکانیش تاوانیان بەرامبەر کوردەکان ئەنجامدەدا و هەندێکیشیان شانازیان پێوە دەکرد[٤٠:٢٤٨]. هەر لەو ماوەیەدا عەلی ئیحسان پاشا داوای لە سەردار رەشید و کوردەکانی ئەو دەڤەرە کرد پەلاماری بیجار بدەن . خەڵکی شارەکەش کە هەمووی کورد بوون و شارەکەش شارێکی کوردی بوو. ئارەزووی ئەوەیان هەبوو روسەکان دەربکەن. بۆیە سەردار رەشید و سەید ئەحمەد و بابە رەسول و سوارەکانی جاف و لەگەڵ حاجی عارف بەگ ، هێرشیان بردە سەر ئەو شارە، بەرایێ هەواڵی ئەوە گەیشت کەشکستیان هێناوە، وەلێ دواتر ١٠٠ چەکدار لە دواوەی روسەکان سوڕانەوە. بەم شێوەیە سەرکەوتن و چوونە ناو شارەوە [٣٢٩:٣٣٢]. کاتێکیش روس پەلاماریان دەست پێکردەوە و گەڕانەوە، هەمدیس کورد کەوتنە پێشەوەی شەڕ. لە ناوچەکانی باکوردا وەك ئیحسان نوری دەڵێ: برایم ئاغای سەرۆکی عەشیرەتی جەلالی بەرەنگاری هێزەکانی روس بوەوە و رێگای نەدا بگەنە دۆڵ و شیوەکانی ئاگری. دواتر روسەکان لەگەڵی رێکەوتن، کە لەبری ئەوەی لە دواوە پەلاماریان نەدات، ئازووقەی بدەنێ [٩:١٢]. هەر بۆیە

تورکەکان کەوتنە پڕوپاگەندەی ئەوەی کورد ناپاکە و پێویستە لە ناوببرێن. دوای ئەمەش وەك لە باسەکەی تر ئاماژەی پێکرا، بە بیانگەی دوورخستنەوەیان لە گۆڕەپانی شەڕ، کەوتنە راگوێزانیان. هەرچی لە ناوچەکانی باکوری رۆژهەلات بوو، روسەکان سەرۆك و میرە کوردەکانیان بەدیل گرت، لەوانەش سمکۆی شکاك، رەوانەی گورجستانیان کردن کوردەکان دژی ئەو کارە وەستان و بە پاڵپشتی یەکێك لە سەرپەرشتیارە ئەڵەمانەکان کەوتنە پەلاماردانی روسەکان [٣٠٣: ١١٠]. ئەو سەرکەوتنانەی روس وایکرد لە میسۆپۆتامیا نزیك ببنەوە. بێگومان ئەمە دەبووە ئەگەری وەدیهێنانی خەونە لەمێژینەکەی روس، بە گەیشتن بە ئاوە گەرمەکانی کەنداو، کە مەترسی بۆ ئینگلیزەکان هەبوو. یەك لە دوای یەك و خێرایی ئەو رووداوانە، بووە هۆی ئەوەی گۆڕانی خێرا لە هەڵوێستی دیپلۆماتیکی نێو دەوڵەتیدا روو بدا [٢٣٧: ١٣٢]. ئەو گۆڕانانە بە تەنیا ئینگلیزەکانی نەترساند بەڵکو زەندەقی حکومەتی تارانیشی برد. بۆیە بە توندی داوای لە ئینگلیز و روسەکان کرد هێزەکانیان لە خاکی ئەودا بکێشنەوە. بۆ ئەو مەبەستەش لە ٢٣ کانونی یەکەمی ١٩١٤ چەند کۆبونەوەیەکیان لەگەڵ روس و ئینگلیزەکان گرێدا. ئینگلیزەکان وایان روونکردەوە کەوا باشترە روسەکان ئێران جێبهێڵن. روسەکان ئەوەیان رەتکردەوە! ئینگلیزەکان ویستیان وا دەربخەن یارمەتی ئەوان بۆ ئێران جیاوازیەکی رەهای هەیە لەگەڵ یارمەتی روسەکان کە گەرەکیانە ئێران لاواز و بێ توانا بێت، کەچی ئەوان گەرەکیانە بە هێزو توانا بێت! ئەو تەنگژە وایکرد پەیوەندی دیپلۆماتیکیان بشلەژێ ، بۆیە راستەوخۆ بە (سازانۆڤ)یان راگەیاند کە درێژبوونەوەی ماوەی ناکۆکیەکان لە سەر ئێران و کوردستان، لەوانەیە کێشەیەکی پڕ مەترسی لە نێوان روس و ئینگلیزەکان بێنێتە ئارا[٩٤: ٦٩]. ئەگەر چی ئینگلیزەکان لە باشورەوە پاراستنی سەرچاوە پەترۆلیەکانی خۆیان مسۆگەر کردبوو، وەك لێپرسراوە ئینگلیزەکان بە لەندەنیان راگەیاند، بەختیاریەکان کارەکانی خۆیان لە پاراستنی کێڵگە پەترۆلیەکان بە پوختی ئەنجامدەدا. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵیاندا بەختیاریەکان رازی بکەن بۆ ئەوەی هەر کاتێك ئێران چووە پاڵ ئەڵەمانەکان لە جەنگ، ئەوان بەردەوام بن لە پارێزگاریکردنی دەڤەرە پەترۆلیەکانی خۆیان [٣١٥: ٢٣٧-٢٣٨]. نەك بە تەنیا بەختیاریەکان بەڵکو سنجاویەکانیش کە لە تەك قەسری شیرین و کێڵگە پەترۆلیەکانی قورەتو نیشتەجێبوون، سوودیان لەم دەستکەوتانە وەردەگرت کە ئینگلیزەکان بۆیان بڕیبوونەوە. (شێرخان)ی سەرۆکیان کرابوو بە فەرمانڕەوای شارەکە، کونسوڵی ئینگلیز دەستی لە نێویانیاندا دەڕۆیشت. هەرچی لە کرماشان بوو، روسەکان مەڵبەندێکی پڕوپاگەندەیان دژی دەوڵەتی ناوەند تیا دامەزراندبوو، کە ٣٠٠ کازاکی ئێرانی پاسەوانیان دەکرد [٩٤: ٨٨-٨٩].

لەم پێواژۆکەدا چالاکی تورك و ئەڵمانەکانیش گەیشتبووە رادەیەکی زۆر بەرز، بە تایبەتی لە ناڤین و باشوری کوردستان. ئەمە وایکردبوو ئەو دەڤەرە ، کە بە گوێرەی رێکەوتننامەی ئینگلیزی - روسی ١٩٠٧ پارڤە کرابوو. لە ناوچەی بێلایەن کە دەکەوتە ناڤین و بەشێکی زۆری رۆژهەڵاتی کوردستانی دەگرتەوە. تورك و ئەڵمانەکان کەلێنێك بدۆزنەوە و دزەی تیا بکەن، بۆ دەست وەشاندن و لەیەکترازاندنی هەردوو هێزی روسی لە باکور و ئینگلیزەکان لە باشور. هاوکات لە ئەنجامی هاتنە خوارەوەی روسەکان و سەرهەڵدانی تەنگژە لە نێوان روس و ئینگلیزەکان وەك ئاماژەی پێکرا. خەریك بوو دەبووە ئەگەری لە یەکترازاندنی ریزی هاوپەیمانەکان. بۆیە روس و ئینگلیزەکان دەستیان کرد بە نامە گۆڕینەوە، وەك راشد ئەلبەڕاوی دەڵێ: لەو کاتەی ئینگلیزەکان رایاندەگەیاند دژی ئەڵمانەکان دەجەنگن و بەرگری لە رێکەوتننامە و گرێبەندە نێو دەوڵەتیەکان دەکەن، بەرگری لە دیموکراسیەت و مافی مرۆڤ و مافی چارەی خۆ نووسین دەکەن، لەو کاتەدا هاوپەیمانان رێکەوتن بۆ پارڤەکردنی وولاتانی رۆژهەڵاتی ناڤین [١٧١:١٢٠]. بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجە لە ١٨ مارتی ١٩١٥ ، روس و فەڕەنگ و ئینگلیزەکان لە سەر ئەوە رێکەوتن بە نهێنی بیروڕاو نامە گۆڕینەوە لە نێوان لەندەن و پاریس و پیتربورگ ئاڵوگۆڕ بکرێ [١٥٨:١٠]. ئەوە بوو لە ٤-١٠-١٩١٥ گەیشتنە رێکەوتننامەیەك کە بە رێکەوتننامەی قوستەنتینیە دەناسرێ، بە گوێرەی یەکێك لە بەندەکانی دەبوایە ناوچەی بێلایەن، کە لە رێکەوتننامەی ١٩٠٧ ئینگلیزی - روسی دیاریکرابوو، بکەوێتە بن نفوزی ئینگلیزەکان [٢١٧:٤٤٦]. بەم چەشنە ناکۆکیەکانی نێوانیان تا رادەیەك چارە سەر کرا، وەلێ لە هەمووی گرنگتر ئەوە بوو، ئەو رێکەوتننامەیە هەوڵێك بوو بۆ داخستنی ئەو دەروازەیەی کە تورك و ئەڵمانەکان لە ناوچەی بێلایەندا دەشیان دزەی تیا بکەن.

لە کاتێکدا هاوپەیمانان خەریکی ئەو رێکەوتننامەیە بوون. ئەڵمان و تورکەکان شیان بە ناوی غەزاوە ژمارەیەکی زۆری کورد فریو بدەن و بیکەن بە گژ روس و ئینگلیزەکانەوە. ئەوە بوو شێخ مەحمود لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە هۆزە کوردەکان بەرەو غەزا بەرێکەوتن و بەشداری شەڕی شعێبەیان* کرد. بەم چەشنە لەگەڵ ئینگلیزەکان کەوتنە شەڕەوە. لە شەڕی کوت و قەڵای سالحیشدا بەشداریان کرد و ئازایەتیان نواند، زۆریان لێ کوژرا و ژمارەیەکیشیان لێ

* هەندێك وای بۆ دەچن شێخ مەحمود بەر لەوەی بکەوێتە رێ بۆ خوارووی عێراق، بڕیاری داوە دەم و دوی نوێنەرانی روسی تاقی بکاتەوە، وەلێ روسەکان لە زمانی مینۆرسکیەوە پێی دەڵێن: بڕیار وابوو کە ویلایەتی موسڵ ببێ بە پشکی روسەکان، وەلێ ئەو بڕیارە تێکچوو[٦٠:٦٢].

بریندار بوو، لەوانە سەید ئەحمەدی خانەقا [٢٦:٣٨]. لە راستیدا شەڕی شعێبە سەرەڕۆیی و خۆبەکوشت دانێك بوو**وەك لە یەکێك لە بەڵگەنامە بەریتانیەکاندا هاتووە پێیان وابوو هێشتا پرەنسیپەکانی سوارچاکی لە ئارادایە [٤٨:٢٩٩]. لەو شەڕەدا بە هیچ شێوەیەك هاوسەنگی لە نێوان هێزەکانی تورك و ئینگلیزدا نەبوو، بە تایبەتی چەکی کوردەکان ، بە هەمان لە گوین لە لایەنی رێکخستن و پلانی شەڕەوەش. کە ئەمانە دوو هۆکاری یەکلایی کەرەوەن لە جەنگی نوێدا. بۆیە کاتێك لە شەوی ١٢/١١ نیسانی ١٩١٥ هێرشیان برد، هەردوای پازدە خولەك تۆپەکانیان بێ دەنگ کرا، لە بەرە بەیانی ١٤ـنیسان ئینگلیزەکان هێرشی پێچەوانەیان کردەوە تورکەکانیان تووشی شکستێکی خراو کرد، زیانی بەریتانیەکان ١٢٠٠ کوژراو بوو، هەرچی زیانی تورك و لایەنگرەکانی بوو گەیشتە ٦ هەزار کوژراو و بریندار، سلێمانێ عەسکەری، فەرماندەی هێزەکەی عوسمانی کاتێ ئەوەی زانی لە داخا خۆی کوشت [١٩١: ٢٨-٢٩]. شەڕی شعێبە زۆر شتی بۆ کوردەکانی باشور روونکردەوە، بەتایبەتی ئەوەیان بۆ دەرکەوت کە غەزا تەنیا پڕوپاگەندەیەکی دیماگۆکیە و پەیوەندی بە راستیەوە نیە! بۆیە دوای ئەوەی زیانێکی زۆریان لێکەوت بە ناکامی گەڕانەوە زێدی باب و باپیرانیان.

تورکەکان هەرچەندە ئەو هەموو کارانەیان بە کورد کرد، تەنانەت رێزی ئەو کەسانەشیان نەدەگرت کە بۆیان دەجەنگین. زنار سلۆپی لەم رووەوە لە یاداشتەکانیدا دەڵێ : لە شاری خینس زنەوتم کەوا سەرۆکی هۆزی سبیلکان بە سەختی بریندار و لە شار لە نێو جێگادا کەوتبوو. بە پێویستم زانی ئەو کەسە بناسم کە بە مێرخاسی و ئازایەتی ناوی دەرکردبوو. لە چادرەکەی خۆی بوو، هەوڵمدا دەربارەی دۆزی نەتەوەیی لەگەڵی باخێوم. ئەو کاتەی من لەوێ بووم دوو یا سێ کاتژمێری خایاند دوو جار ژاندارم هاتن و فەرمانی بەڕێوەبەری ناحیەیان پێ‌راگەیاند کە مانەوەی لەو شوێنە قەدەغەیە، ژاندارم فەرمانیان دەکردە سەر ئەو کەسە کە نیشانەی سەرهەنگی سوپای لە سەر شان بوو ! [٤٦:١٧٦]. هەر لەبەر ئەمە بوو وەك پەیامنێری رۆژنامەی باکۆ بڵاوی کردەوە : زۆربەی کوردەکانی باکور دڵیان بە

---

** رەفیق حلمی ژمارەی ئەو چەکدارانەی لەگەڵ شێخ مەحمود چووبوون بۆ شعێبە بە (١٠٠٠)کەس دادەنێ. الحسنی لە کتێبەکەیدا "العراق في دور الاحتلال و الانتداب" بە (١٥٠٠) کەسی داناوە. دوکومێنتی ژمارەی **F.O.5068-2205** کە لە ١٥ نیسانی ١٩٢٠ نووسراوە ٣ هەزار چەکداری داناوە [٣٤٦:٤٢]

جەنگەوە نەبوو لێی بێزار بوون. هاتبوونە سەر ئەو رایەی تورکەکان فریویان داون، بەوەی دەنگوباسی ناڕاست و تژی درۆ و دەلەسەیان پێ رادەگەیاندن [٥٨١:٤٦]. ئەو هەڵوێستانەی تورك وای لە هەندێك سەرۆکەکانی کورد کرد هەوڵبدەن پەیوەندی بە هێزی ترەوە بکەن. بۆ وێنە شێخ مەحمود دوای شەڕی شعیبە هەوڵیدا پەیوەندی بە ئینگلیزەکانەوە بکات [٦٠].

هاوکات دوای ئەوەی روسەکان لە بەرەکانی سەقزو بانە سەرکەوتنیان وە دەست هێنا، کوردەکانی ئەو دەڤەرە هەوڵیاندا دانوستانیان لەگەڵ بکەن، وەك شێخ رەئوفی زیایی لە یاداشتەکانی خۆیدا ئاماژەی بۆ دەکا، ئەویان بە نوێنەری بۆ ئەو دانوستانە هەڵبژاردووە. ئەویش دوای ئەوەی قەول و گلی هەموو عەشیرەتەکان وەردەگرێ، دەکەوتە گفتوگۆ لەگەڵ روسەکان. لە کاتی گفتوگۆدا دەیەوێ وا لە روسەکان بگەیەنێ کە ئەوان دەستیان بۆ درێژ نەکەن و ئەمانیش رێگا نەدەن خەڵك هێرشیان بکاتە سەر [٣١٨: ٥٨-٥٩]. لەو کاتەدا هاوپەیمانەکان هەوڵیاندەدا زێتر پەیوەندی بە نەتەوە بن دەستەکانی عوسمانیەکان بکەن. روسەکان ویستیان لە رێگای سەفوەت بەگەوە پەیوەندی بە شێخ مەحمودەوە بکەن. سەفوەت بەگ لە ئەیلولی ١٩١٥، لە سەقز نامەیەکی بۆ شێخ مەحمود نارد، لەو نامەیەدا بۆی روونکردەوە کەوا حوکمی عوسمانیەکان بەرەو نەمان دەچێ و دەزگای دەوڵەتیان خەریکە نەمێنێ. هەروەها لەو نامەیەدا باسی چەك و سوپای روسی بۆ کرد کە چەند مەزن کوشندەیەو کورد ناتوانێ بەرەو رووی بێتەوە، بۆیە بە پێویستی دەزانی هاریکاری روسەکان بکەن، تا روسەکانیش یارمەتیان بدەن [١٨٧:٣٨]. وەك بەرپەرچدانەوەیەکی هەڵوێستی روسەکان، تورکەکان ویستیان سەرکردە کوردەکان زێتر لە خۆیان نزیك بکەنەوە. لە تشرینی دووەمی ١٩١٥، تەلعەت پاشا کە ئەوسا شالیارگەی کاروباری ناوەخۆی بە دەستەوە بوو، داوای لە عەبدولقادری شەمزینی کرد بەلەزی بگەڕێتەوە کوردستان و راپەڕینێك دژی روسەکان پێکبهێنێت. عەبدولقادر ناچار بوو بە سەرزاری رازی بێت، وەڵێ هاوکات لە بنەوە خۆی گەیاندە ((سیراڤیموچ))ی نوێنەری روسیا لە ئەستانە، کە پەیوەندی بە باڵوێزخانەی ئیتاڵیاوە هەبوو، خاترجەمی کرد پشتیان تێناکات و نایانفرۆشێت ! [٥٨٣:٤٦]. لە پاڵ هەوڵی روسەکان، ئەگەرێکی تری ئەو هەڵوێستەی تورکەکان ئەو راپەڕینە کوردیانە بوو، کە هەر لە نیوەی یەکەمی (١٩١٥)ەوە لە دۆڵی موش و دەرسیم و باشوری رۆژهەلاتی ئەناتۆلیا سەریان هەڵدا بوو [١٥٦: ٩٠]. شایانی ئاماژە پێکردنە ئینگلیزەکان بە هەمان شێوە پەیوەندیان بە عەرەبەکانەوە کرد. لە ٢١ تشرینی یەکەمی ١٩١٥، ئەدوارد گرای، شالیاری هەندەرانی بەریتانی، باڵوێزی فەرەنگەکانی لە لەندەن پۆل کامبون **Paul cambon** ئاگادار کردەوە، لەو نامە گۆڕینەوەی لە نێوان ئەوان

و حوسێنی شەریفی مەکە رویداوە. ئارەزووی ئەوەی دەربڕی کە هەردوو دەوڵەت پێویستە لەم بارەیەوە بیروڕایان ئاڵوگۆڕ بکەن دەربارەی بەرژەوەندیەکانیان لە دەوڵەتی عوسمانی. دوای ئەوە دەستکرا بە دانوستان لە نێوان مارك سایکسی ئینگلیزی و جۆرج پیکۆی فەڕەنگسی [٤٣١:٢٦٥]. هەر لەو ساڵەشدا کاتێك شاندەکەی ئەرمەن، دکتۆر زاڤریف و نۆبار پاشا چوونە پاریس، فەڕەنگەکان ئەو باوەڕەیان نیشاندا کە پێویستە ئەرمەنستانی ئۆتۆنۆمیدار لە بن باڵی روس و فەڕەنگ و ئینگلیزەکان دابمەزرێ. هەر لەو دانیشتنەدا باسی ئۆتۆنۆمی کوردستانیش کرا [٥٠:٥٤].

نزیك بوونەوەی هاوپەیمانان لە کورد و عەرەب و نەتەوەکانی تری بن دەستی عوسمانیەکان. لە روانگەی بەرژەوەندی سیاسی و ستراتیژی و سەربازی خۆیانەوە بوو، گەرەکیان بوو دەوڵەتی عوسمانی لە ناوەوە هەڵتەکێنن. چونکە دەرچوونی عوسمانیەکان لە جەنگ، واتای ئارام بوونەوەی بەرەکانی رۆژهەڵات بوو، کە ئەمە کاری لێدانی ئەڵمانەکان و دەوڵەتانی ناوەندی لە بەرەکانی رۆژئاوا ئاسانتر دەکرد. بۆیە بە هەمان مەبەست هەوڵیاندا خۆیان لە جەمال پاشا نزیك بکەنەوە، بە تایبەتی دوای شکستەکەیان لە دەردەنیل، تا راپەڕینێك لە دەوڵەتی عوسمانی دایسێنێ. جەمال پاشا رازیبوو. بەو مەرجەی هاوپەیمانان دان بە مەرجەکانیدا بنێن، کە بریتی بوو لە پاراستنی سەروەریێتی دەوڵەتی عوسمانی لە ناوچەکانی سوریا و فەلەستین و میسۆپۆتامیا و کیلیکیە و ئەرمەنستان و کوردستان. هەروەها جەمال پاشا خۆی ببێتە سوڵتان. بەرامبەر ئەمەش رابگەیەنێ کەوا سوڵتان و حکومەتی دیلی بن دەستی ئەڵمانەکانن و بانگەشەی جەنگ بکات لە دژیان. هەر کاتێکیش جەنگی راگەیاند، هاوپەیمانان هەریێ ئەوەی پێ بدەن کە چەك و ئازووقەی پێویست بۆ سوپاکەی دابین بکەن، ئەمەو لەگەڵ چەند مەرجێکی تر. کەچی دوای ئەوەی روسەکان لەم بارەیەوە لەگەڵ ئینگلیز و فەڕەنگە هاوپەیمانەکانیان ئاخاوتن، ئەوان بەو مەرجانە رازی نەبوون [٧٦:٢١١]. جێگای سەرنجە هەر لەو ماوەیەدا ئەڵمانەکانیش هەوڵیاندەدا دەسەلاتی سیاسی لە ئێران بگۆڕن. قاو واکەوتەوە کودەتایەك خەریکە سەرتاسەری ئێران بگرێتەوە. ئەمە بووە سۆنگەی ئەژواری و هاموشۆیەکی بەهێز لە نێوان روس و ئینگلیزەکان. روسەکان فەرمانیان بە هێزەکانیاندا بەرەو تاران بجولێنەوە. ئەمەش نوێنەری ئەڵمانەکان و دۆستەکانی ناچار کرد بەرەو قوم بڕۆن. ئەڵمانەکان لەو کاتەدا (یەکێتی ئیسلامیان) دامەزراند بوو بۆ ئەوەی دژی ئینگلیز و روسە گاورەکان شەڕ بکەن! کۆمەڵێکی زۆر خەڵکیان لە دەوری خۆیان کۆکردبووەوە، لە پاڵ لایەنی دینی دەیانویست سوود لە لایەنی ئەتنیکیش وەربگرن، وایان بڵاودەکردەوە ئێرانیەکان ئاری

نەژادن و کرمان، کە شارێکی ئێرانی بوو لە (جەرمان) هاتووە ! [١٧٠:٣١٧]. پڕوپاگەندەی ئەڵمانەکان هێندە بەهێز بوو، تەنانەت شای ئێرانیش دەیویست تاران جێبهێڵێ، تا لە دوا چرکە ئینگلیز و روسەکان پێی راگەیشتن، خاویان کردەوە و رازیان کرد واز لە بیرۆکەی جێهێشتنی تاران بێنێ [٢١:٣١٤]. وەك لە زۆر شوێنی تر ئاماژەی پێکرا، لایەنی ئاینی و تایفەگەری رۆڵێکی گەورەیان لەو جەنگەدا دەبینی، لەوانە هاندانی کوردە شیعەکانی بۆ گرتنی کەربەلا، هەروەها لایەنی ئایینی، لە پاڵ نیشتمان پەروەریتی، وای لە یەکێکی وەکو فەتاحی قازی کرد بە توندی پشتگیری غەزا بکا. وەلێ عەشیرەتەکانی ناوچەی دەرسیم لەبەر ئەوەی شیعە بوون، بایەخیان پێ نەداو بە بێلایەنی مانەوە [٤١:٣٢٠]. لەو سۆنگەیەش بوو فەتاحی قازی لە کاتی گەڕانەوەی روسەکان بۆ مەهاباد، بەوپەڕی لە خۆبوردوییەوە بەرەنگاریان بووەوە. کوڕێکی لەو شەڕەدا کوژرا، خۆشی تا دوا فیشەك شەڕی کرد، کاتی ئەویش کوژرا ١٧ گوللە بە لەشیەوە بوو ! [١٨٣:٤٣].

ئەڵمانەکان لەو گاڤەدا لە کوردستان بە گەرمی کەوتبوونە خۆ و چالاکیان دەنواند، مارشاڵی ئەڵمانی ڤۆن دەرگۆڵتز Von der Goltz لە کانوونی دووەمی ١٩١٦ خۆی سەردانی ناوچەکوردیەکانی رۆژهەلاتی کوردستانی کرد، پڕوپاگەندەی تورکەکانیش لە نێو هۆزەکانی کاشان و کوردستان گەیشتبووە رادەیەکی وا لێپرسراوە ئێرانیەکانی تووشی دڵەڕاوکێیەك کردبوو [٢٤٥:٢٣٥]. هۆی زێتر بایەخ پێدانی تورك و ئەڵمانەکان لەو کاتەدا بە کورد، باوەڕنەمانی کورد بوو پێیان کە پەیتا پەیتا هێزەکانیان جێ دەهێشتن، لە کۆتایی ساڵی ١٩١٥ ژمارەی کوردەکان لە سوپای سێیەمی تورك کە بەرامبەر روس بوون، تەنیا ٨-١٠ هەزار کەس مابووەوە [٨٩:١٥٦]. لە کاتێکدا بەر لەو کاتە، کورد زۆرینەی هەرە زۆریان پێکدەهێنا. لە لایەکی تر ئەڵمانەکان هەوڵیاندەدا لە ناوچە گرنگ و ستراتیژیەکانی کوردستان کەلێنێك بدۆزنەوە تا بیکەن بە بنکەیەك بۆ فراوان خوازی بەرەو دەڤەرەکانیتر و دەستێکی کاریگەر لە هاوپەیمانان بوەشێنن لە سەرجەم رۆژهەلاتی ناڤیندا. بۆیە چاوساغەکانی تورك لە ناوچەکانی وورمێ و خوارووی رۆژهەلاتی کوردستان، چوستیەکی تەواویان دەنواند. دەیانویست دیوارێکی پتەو لە کورد دروست بکەن لە نێوان هێزەکانی روس و ئینگلیزدا. هاوکات ئەو هێزەی کورد رێگا لە باڵی راستی هێزەکانی روس بگرێت و رێگا نەدات هێرش بەرنە سەر هێزەکانی تورکیا لەبەرەی قەوقاز [٦٠٠:٤٦]. شایەنی باسە ماوەیەك بەر لەم کاتەش، بەهۆی کرداری هۆڤیانەی تورکەکان سەردارە کوردەکانی کرماشان نیگەران بوون، کە بەڕای ئەڵمانەکان ئەمە زیانی بە یەکێتی ئیسلامی دەگەیاند. بۆیە هەوڵیاندا دڵی کوردەکان رابگرن لە

خوسرەو ئاوا (خوسرەو ئاباد) لەگەڵ سەرۆکە کوردەکان کۆبونەوەو ڕێکەوتننامەیەکیان لەگەڵ گرێدان، کە هەر بەناوی ناوچەکە خوسرەو ئاوا ناسرا. بەپێی ئەم ڕێکەوتننامەیە کوردەکانی کرندو ناوچەکانی سنوور بۆیان هەبوو بە ئاسوودەیی لەماڵی خۆیان بژین و بەرهەمەکانیان کۆبکەنەوە. جێگای ئاماژە پێکردنە لەنێو ئەوانەی ئەم ڕێکەوتننامەیان مۆرکرد سیخوڕی بەناوبانگی ئەڵمانی (شیومان) بوو [٦٥:٣٢٦]. دوای ئەم هەولانە ئەڵمانەکان توانیان حکومەتێك لە قوم دابمەزرێنن، پاشان گواستیانەوە بۆ کرماشان، تا لە سنوورەکانی خۆیان نزیك و لە دەستی روسەکان دوور بێت. هەروەها پشت بەو هێزانەی تورك ببەستێ کە لە میسۆپۆتامیادا بوو. ئەو حکومەتە بە سەرۆکایەتی (نیزامولسەڵتەنە) فەرمانڕەوای لوڕستان بوو، کە لە کانونی یەکەمی ١٩١٥ ڕێکەوتننامەی هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئەڵمانەکان مۆر کرد و هەرێی پێدان لە ناوچەکانی بن دەستیدا ٢٠ هەزار سەربازیان بداتێ. بارتەقای ئەوەش ئەڵمانەکان هەرێی چەك و تەقەمەنیان پێدا، لەگەڵ مەشقوانی ئەڵمانی و دابینکردنی دارایی مانگانە. دواتر کۆمیساری ئەڵمانی بە شێوەیەکی رەسمی کاغەزی پشت پێ بەستنی (اوراق الاعتماد) بە حکومەتی نیزامولسەڵتەنە داو نێردەیەکی سەربازی ئەڵمانی نارد بۆ ئەوەی مەشق بە سەربازەکانیان بکات [١٥٨: ٧٤-٧٥]. هەروەها ئەڵمانەکان بۆ پتەوکردنی ئەو بەرەیە هەوڵیاندا پەیوەندی بە هێزە بەرهەڵستکارەکانی روس بکەن. وێدەچێ لەگەڵ ئەوانیش گەیشتبوونە جۆرە ڕێکەوتنێك. لە نامەیەکی باڵوێزی ئەڵمانی لە بایرن، کە لە ساڵی ١٩١٥ نووسیویەتی و بۆ شالیاری هەندەرانی وولاتەکەی ناردووە باسی پرۆگرامێك دەکات کە لە هەشت بەند پێك هاتووە، تیایدا باسی ئەوە دەکا کەوا لینین و هاوەڵەکانی ئەگەر دەسەلاتیان بکەوێتە دەست ئەو بەندانە جێبەجێ دەکەن، بە گوێرەی بەندی هەشتەمیش دەبوایە سوپای روس بەرەو هیندستان بکشێت [٨٥:٢٧٧]. بێگومان دامەزراندنی حکومەتێك لە ناوچەیەکی کوردی و لە ژێر سەرکردایەتی کوردێك واتایەکی زۆری دەگەیاند و هەڕەشەیەکی ئێجگار زۆری لە هاوپەیمانان دەکرد، بە تایبەتی لە ئینگلیزەکان. دەتوانین ئێژین ئەو ململانێیە لەو ساڵەدا بووە سۆنگەی دامەزراندنی حکومەتێك لە کاتی جەنگدا کەسیماو مۆرکی کوردی زۆر پێوە بوو، هەروەها کاریگەری زۆریشی هەبوو لە سەر ئەو هێرشانەی کە دواتر کرانە سەر کوردستان.

روسەکان وەك ڕێگا گرتنێك لەو کارە هەوڵیاندا هۆزە کوردەکانی ئەو دەڤەرە لە خۆیان نزیك بکەنەوە. بۆ ئەم مەبەستە باراتۆڤ هەموو عەشیرەتەکانی روانسەر و جوانڕۆ و سنجاوی و گۆران و هۆزەکانی تریشی بانگهێشتە کردجڤاتی یەکیەتی عەشایری(مجلس اتحادی

عشایری) دامەزراند. دوای ئەوە کوردەکان لە ناوە خۆشیان کۆبونەوەیەکیان سازدا کە شێخ مەحمود و هەموو خانەکانی هەورامان و مەریوان بەشداریان کرد، کۆبونەوەکە لە ماڵی مەحمود خانی کانی سانان ئەنجام درا. هەموویان بەڵێنیان بە یەکتردا کە یەکیەتیەکی عەشایری دابمەزرێنن، دواتر سەر لە نوێ بەڵێنەکەیان بۆ یەکتر دووبارە کردەوە [٣٢٩:٣٢٩]. لە راستیدا روسەکان دەیانویست هەرچۆنێك بێت ئەگەر نەشێن کورد بۆ خۆیان رابکێشن، وایان لێبکەن خەڵکیتر کاریان لێ نەکات. لە کۆتایی ١٩١٥ میر نیکولای نیکولاڤیچ، نوێنەری تازەی روسیا لە قەوقاز، فەرمانی دا نەخشەی سیاسەتێکی دەست نیشانکراو بۆ کورد دابنرێت. مەبەستیشیان لەم سیاسەتە ئەوە بوو ناکۆکی نێوان کوردەکان نەهێڵن و بە هەر چۆنێك بێت کوردەکان بۆ لای خۆیان راکێشن، تا پێویستیەکانی سوپاییان پێ دابین بکەن، وەلێ تا بە ووردی لێیان نەکۆڵرێتەوە و زیرەڤانیان نەکرێت چەکیان نەدرێتێ ! [٤٦: ٦٠٥-٦٠٦]. هەر لە پێناو ئەم ئامانجەدا، سمکۆیان گەڕاندەوە، دوای ئەوەی لە دوای جەنگەوە بەدیلیان گرتبوو رەوانەی تفلیسیان کردبوو. لە سەرەتای ساڵی ١٩١٦ سمکۆ تفلیسی بەجێهێشت و گەیشتە سەلماس، هەرچەندە بەرایێ پەیوەندی نێوان روسەکان لەگەڵ سمکۆ تژی گومان بوو، وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا ژەنراڵ چێورنەزۆبۆف بەردەوام داوای لە سمکۆ دەکرد سەردانی بکات، بۆ ئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ لێپرسراوانی روس بکات [٤٦:٦٢٣]. شایانی باسە لەبەر ئەوەی روس و ئینگلیزەکان مێژوویێکیان بەیەکەوە هەبوو، متمانەیان زۆر بە یەکتر نەدەکرد، هەریەکەیان لە زێدەبوون و پەرەسەندنی نفوزی ئەوەی تر دەسەنگریەوە. لەو کاتەدا گوستریای روسی جیاوکی پەترۆلی بۆ ماوەی ٧٠ ساڵ لە ئێران وە دەست هێنا، ئەمە ترسێکی گەورەی خستە دڵی ئینگلیزەکانەوە، سەرباری ئەوەی لە وەدەست هێنانی پەترۆل بێ هیوای کردن. روسەکان بنکەیەکی تژی بایەخیان کەوتە دەست بۆ گڕدانی ململانێی ئیمپریالیستی لە نێوان خۆیان و بەریتانیادا [٢٤:٢٧٥]. ئەو گۆڕانە بەلەزانەی لە سەر گۆڕەپانی رۆژهەلاتی ناڤین روویاندا زەندەقی ئینگلیزو فەڕەنگەکانی برد، بۆیە هەوڵیاندا رادەیەك بۆ ئەو مەترسی و ناکۆکیانە دابنێن. لە کۆتایی شوباتی ١٩١٦ دا سایکس و پیکۆ چوار چێوەی پرۆژەیەکیان دانا بۆ پارڤە کردنی تورکیای ئاسیایی. هەر لە مارتی هەمان ساڵدا ئامادەیان کردوو دایان بە روسەکان. کوردستان بە پێی ئەو پرۆژەیە بە شێوەیەکی وا لە نێوان ئەو سێ دەوڵەتە پارڤە کرابوو، وەك پارچەیەك لەو دەوڵەتانەی لێ دەهات، یاخود هیچ نەبێت بە تەواوی دەیخستە بن سایە و دەسەلاتیان. فەڕەنگەکان بەشە هەرە چاکەکەی کوردستانیان دەکەوتە دەست، باشوری کوردستان و هەموو رۆژهەلاتی ئەناتۆلیا، لە سنوورەکانی ئێران تا دەریاچەی وورمێیان پێ

دەبڕا. چارەنووسی بەشەکانی تری کوردستان و ئەرمەنستان دانران بۆ ئەو کاتەی دەتوانن تورکەکان رازی بکەن، پاشان هەرێیان بە روسەکاندا، ئەرزەڕۆم و وان و دەڤەرەکانی کورد و لازەکانیان بدەنێ. ئەوەی لە باشوری رۆژهەلاتی ئەناتۆلیا دەمایەوە، لەوانە موش ئەویش بدرێتە فەڕەنگەکان [٤٦: ٦٣١-٦٣٢]. هەر لە مارتی ١٩١٦، بۆ ئەوەی باشوری کوردستان لەو مەترسیانە بپارێزن کە رووبەڕووی دەبۆوە، فەرمانیان بە پرسی سایکس دا، لە ئەفسەرانی ئینگلیزی و هیندی هێزێك دابمەزرێنێ. ئەوەبوو ئەو هێزەیان دامەزراند و ناویان نا (تفەنگدارانی باشوری ئێران S.P.R) هەرچەندە فەرمانفەرما، سەرۆکی حکومەتی ئێران لە تەموزی ١٩١٦ دامەزراندنی ئەو هێزەی واژۆ کرد، وەلێ ئینگلیزەکان هیچ کاتێك نەشیان ئەو هێزە بە رەسمی بێننە ناسکردن [٣١٩:٥٢]. لەبەر ئەوەی ئەو هێزە لە ناوچەکانی کوردستان بووە، بۆیە دەبێ کوردیش بەشداریان تیا کردبێ.

روسەکان لەو ماوەیەدا سەرکەوتن لە دوای سەرکەوتنیان بە سەر تورکەکان و ئەڵەمانەکان وە دەست دەهێنا. لە بەهاری ١٩١٦ بەرەو خانەقین و رواندز هاتن، هەرچی لە بەرەی سلێمانی بوو، ئەوا هێزەکانیان لە لای سنە (Sne) وەستان [١٩٢:٣٥]. دوای ئەوە بانە و سەقز و میاندواو تا شاخی تاریەیان گرت لە سنووری سلێمانی. شێخ مەحمود بە سوپایەکی گەورە رووبەڕووی سوپای تەزازی روس بۆوەو لە لای بانەو مەریوان لە یەکیاندا، روسەکان دوچاری تێکشکان بوون [٣٨:٢٧]. لە پاداشتی ئەو سەرکەوتنانە، تورکەکان چەند سەرۆك هۆزێکی کوردیان گوللە باران کرد، گوایە لە کاتی شەڕدا گوندەکانیان تالانکردووە ! وەلێ راستیەکەی ئەوە بوو دەسەلاتی ئەو کوردانە کەم بکاتەوە، کە لە سۆنگەی ئەو سەرکەوتنانەوە وەدەستیان هێنابوو [٤:٢٠]. هاوکات رێگای ئەوە بگرن بەم سەرکەوتنانە بەخ و لە خۆبایی بن و چاویان بشکێنن. مستەفا پاشای یامولکی لە بانگی کوردستان سەر ووتارێکی بە ناوی عیبرەت نووسیوە ، تیایدا ژمارەی ئەو کوردانەی گوللە باران کران بە ١٧ پیاوی سەنگین دادەنێ [٨٠:٩٨]. روسەکانیش سەرباری ئەو کارە تژی هۆڤیەتیەی دژی کورد و خاکی کوردستان ئەنجامیان دەدا. بەردەوام بوون لە کارکردن بۆ راکێشانی کورد بە لای خۆیاندا، بە تایبەتی گەرەکیان بوو ئەو عەشیرەتانە بۆ لای خۆیان راکێشن کە لە خوارووی هێڵی کرماشان- خانەقین نیشتەجێ بوون، ئەمەش هێڵی لەیەکدابڕانی هێزەکانی روس و بەریتانیەکان بوو. لە راپۆرتێکی باڵوێزخانەی بەریتانیا هاتووە : "باشترین رێگا بۆ راکێشان و بێلایەنکردنی کوردەکانی رۆژهەلاتی کوردستان ئەوەیە، عەشیرەتەکانی دەوروبەر بۆ خۆمان رابکێشین، وەکو

بەختیاریەکان و والی پشکۆ و کۆمەڵەکانیان" [٢٧٦:٣٨٩]. ئەمە ئەوە روونەدکاتەوە ئینگلیز و روسەکان لە یەك کاتدا بایەخیان بە هۆزەکانی ئەو دەڤەرە داوە. تا رادەیەکی زۆر پشتیان بە شوێن و رۆڵی کوردەکان بەستووە، لە حوزەیرانی ١٩١٦ سازانۆڤ بۆ تارانی نووسی : "ئەگەر هاتوو هێزەکانی باراتۆڤ کشانەوە، تەنیا ئەوە لە حکومەتی شا دەخوازین دەسەڵاتی خۆی بەکاربێنێ و بە هەموو توانایەکەوە هەوڵبدات کوردەکانی کوردستان* و کرماشان بدەنە پاڵ ئێمە" [٤٦:٦٢٢]. ئەڵەمانەکانیش بەیاننامە و چاپەمەنیەکانی پان ئیسلامیەکانیان بە هەموو رۆژهەلاتی کوردستان بلاو دەکردەوە. بۆ ئەوەی خەڵکەکە لە روسەکان دووربخەنەوە و بەرەو تورکەکانیان رابکێشن [٣٥:١٢]. هەرچی دەربارەی هەڵوێستی کورد خۆیەتی، ئەوە لە سۆنگەی پارچە پارچەیی خاکەکەی و چون یەك نەبوونی رەفتاری لایەنە شەڕوانەکان لە هەموو ناوچەکاندا، یەك هەڵوێستی نەبوو. بەڵکو هەڵوێستەکانی وەکو کاردانەوەیەك بوو بۆ ئەو کارانەی لەو شوێنانە بەرامبەری کراوە. بۆ وێنە هەرچەندە روسەکان لە باشوری رۆژهەلاتی کوردستان، بەو کارە هۆڤیانە هەڵدەستان، لە باکور بە هەمان شێوە نەبوون. بە تایبەتی لە ساڵی ١٩١٦. چونکە کاتێك ساڵداتی ** روسی ئەرزەرۆمی گرت، رێگای نەدا یەك ئەرمەنی بچێتە نێو شارەوە، هەروەها فەرماندەی سوپای یەکەم کە ئەو شارەی بن دەست کرد، رێگای نەدا یەك تیپ ئەرمەنیان تیا بێ بەم لایەدا بچێ [١٥٤:٣٢٦]. هەر بۆیە کاتێك سوپای روسی بەرەو ئەرزەرۆم و وان چوو، عەبدولرەزاق بەدرخان پەیوەندی پێوەکردن. بەو ئامانجەی کورد هاریکاری روس بکەن، روسیش یارمەتی کورد بدەن بۆ سەرخوەبوون [٢٧٦:٣٠٠].

لە راستیدا بوونی رۆشنبیرانی کورد لە بەرەکانی جەنگدا، وای لێدەکردن بە وریاییەوە ئاگاداری ئەو سیاسەتە نەبن کە لە لایەن شەڕوانەکانەوە دژیان پیادە دەکرا. وەك سورەیا بەدرخان نووسیویەتی : گەلێك لە پیاوە کوردەکان کە لە سوپای تورکدا سەرباز بوون ئاگایان لە سیاسەتی تورك نەبوو لە کوردستان. لەو کاتەدا پڕوپاگەندەیەکی بەهێزیان دەکرد بۆ بەرهەڵستی کردنی ئەرمەنی و دیانەکان، بە کوردەکانیشیان دەگوت، روسەکان لەگەڵ ئەرمەنیەکان رێکەوتوون کوردستانیان بدەنێ. بۆیە هەمدیس کورد بوون بە داردەستی تورکەکان. کاتێکیش سوپای تورك شکستی هێنا. کوردەکانی

---

* مەبەستی لە سنەیە.

** ساڵدات: سەربازی روسی

وان و بەدلیس و ئەرزەڕۆم رایانکرد و کشانەوە ناوچەکانی دیاربەکر و موسڵ [٥:٤٨]. ئەو بارەی لـە کاتی جەنگدا دروست ببوو وایکرد پلانی تورکەکان بەرامبەر بە کـورد سـەربگرێ. سـەرکەوتنی پلانـی تورکەکانیش واتای سەرنەکەوتنی پلانی تێکۆشەرانی کورد بوو. کە هەوڵیاندەدائەو گوریەی کـورد لـە جەنگدا دەیدا شێوازێکی نەتـەوەیی وەرگـرێ و کـە جـەنگ دیمـاهی هـات کوردیـش شـتێکی دەسـت کەوێت. لەو کاتەدا کورد زێتر هەوڵیاندەدا لە روسەکان نزیك ببنەوە، وەڵێ روسەکان گەرەکیان نەبوو هیچ هەرێیەك بە کورد بدەن. لە ساڵی ١٩١٦ چەند سەرۆکێکی کورد ئامانجی سەرخوبوونی کوردیـان خستە بەردەم لێپرسراوە روسەکان. کامیل بەدرخان داخوازیە نەتەوەیەکانی کـوردی بـە مـیری مـیران نیکۆڵای نیکۆلاڤیچ راگەیاند، کـەچی کاربەدەستانی روس لـەم رۆژانـەدا رازی نـەبوون لـە روانگـەی دۆزێکی سەربەخۆوە بڕواننە دۆزی کورد ! [٤٦:٦١٧]. بۆیە کورد بە ناچاری، کە کەس دەرگای بـە روویدا نەکردەوە، لە پاڵ تورکەکان مایەوە. لە ١٥ تەموزی ١٩١٦ هێزە کوردیەکانی سوپای تورکـی لە دژی هێزەکانی روس کەوتنە شەڕەوە. ئەنجامی ئەو شەڕەش شکسـت و پاشەکشـەی روسـەکان بـوو. ژمارەی ئەو کوردانەی لەبەر نەخۆشی و برسیەتی و سەرما و سۆڵە لە ناوچوون، زۆر لە زیـانی شـەڕەکە زۆرتر بوو [٢٤:٣٨].

لەگەڵ ئەوەی هەموو لایەنـە رکابـەرەکان گـەرەکیان بـوو کـورد لـە پێنـاو مەبەسـت و بەرژەوەندیـەکانی خۆیـان بـەکاربێنن. پـەیتا پـەیتا دروشمـی سـەرنج راکێـش و بریقـەداریان بەرزدەکردەوە. یەکەم راگـەیاندنی هاوپـەیمانان دەربـارەی گـەلانی ئیمپڕاتۆریـای عوسمـانی ئـەو یاداشتنامەیە بوو کە شالیاری هەندەرانی بـەریتانیا بـاڵفۆڕ لـە ١٨ کـانونی یەکـەمی ١٩١٦ بـۆ سەرۆکی ئەمەریکایی نارد. تیایدا ئەوەی درکاند یـەکێك لە ئامانجەکانی هاوپەیمانان لەم جەنگەدا ئەوەیە ئازادی بۆ ئەو خەڵکە دابین بکەن کە لە بـن دەسـەڵاتی تورکـی خوێنـاویدان[٧٥:٢٣٧]. نەك بەرژەوەندی لایەنە شەڕوانەکان لەگەڵ کورد یەکی نەدەگرتەوە، بگرە ئەو لایەنانـە لـە نێـو خۆشیان کۆك و تەبا نەبوون. بۆیـە لـە بـەهاری ١٩١٧ کـاتێك روسـەکان بەتـەمابوون هـێرش بکەن، ئینگلیزەکان توانیان بە بەرتیل و هەرێ پێدان ژمارەیـەکی زۆر لـە سـەرۆك کوردەکـانی رۆژهـەڵاتی کوردسـتان بـۆ لای خۆیـان رابکێشـن [١٥٦:٩٨]. لـەم بارەیـەوە مینۆرسـکی نووسیویەتی: "بەلای ئێمەوە زۆر گرنگە ببینە هاورێی کوردەکان، بە تایبەتی لـەم رۆژانـەدا کـە نیازی پەلاماردانی (موسڵ)مان هەیە. ئێستا کاتی ئـەوە نیـە کۆنە کا بەبا بدەین، راست نیـە دان بە سەربەخۆیی کوردنەنرێت. من دڵنیام کورد میللەتێکی زیرەك و خاوەن ئامـانجێکی نەتـەوەیی

روونه" [٦٤٩:٤٦]. ئەم جەورو ستەمەی لە کورد دەکرا، چ لە لایەنی مرۆیی‌یەوە کە وەکو جەنگاوەر لە ژێر چەندین پەردەدا فریویان دەدا و لە جەنگ بە کوشتیان دەدا، یاخود وەکو میللەت، کە باری گرانی ئەو سوپایانە کەوتبووە ئەستۆی، بە تایبەتی سوپای عوسمانیەکان، کە هەر لە سەرەتای جەنگەوە باری ئابووریان پەرێشان بوو، چ لەوەی خاکەکەی ببوە گۆڕەپانی شەڕو بەیەکدادان. شاعیرێکی وەکو مەلا حەمدون زۆر بە جوانی سالوخدانی ئەم بارەی کردووە، کە دەڵێ:

"ژەندرمە ئەسوڕێتەوە وەك واشەی برسی

بۆ لاشەی میللەت بە فرِوفێڵی غەزاوە

فەوتاوە لەبەر سوخرە کەرو هێستر و یابو

حوشتر سەقەت و شەل بوە گا پشتی شکاوە

کەر شەوقی زەڕینی نیە حتی لە بەهارا

ترسی هەیە نەك بیخەنە ژێر باری قەضاوە"

[٢٢: ١٣٢-١٣٣]

هاوکات لەگەڵ ئەم بارە ناهەموارەدا بیری نەتەوەیی کوردی بوژانەوەیەکی بەسەرداهات، بۆیە دەتوانین ساڵی ١٩١٧ بە ساڵی بوژانەوەی بیری نەتەوەیی کورد دابنێین لە کاتی جەنگدا. لە سلێمانی شێخ مەحمود ئاوری خەباتی دایساند. دەنگی نارەزایی لە هەموو لایەك بەرز بوەوە، گەلێك لە خێڵەکانی کورد کەوتنەوە کۆچ و رەوی خۆیان بە بێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەو کۆسپ و ئەستەنگانەی تورك بۆی چێدەکردن [٦٣٨:٤٦]. هۆزی تر هەبوو بەرگەی ئەم بارە سەختەیان نەگرت، ژمارەیەکی زۆر بۆ چیاکانی ئەرمەنستان هەڵاتن، بنەماڵە و هۆزی جیاجیای یەزیدی لە عینتاب و هەرێمی فارس و وان هەڵاتن. لە سەرەتا لە (سورمالین)ی پارێزگاری یەریڤان گیرسانەوە [٥٨:٩٧]. هەرچی لە رۆژهەڵاتی کوردستان بوو، بارەکە جۆرە رێکخستنێکی بەخۆوە گرتبوو. لە ١٧ تەموزی ١٩١٧ یەکەمین کۆنگرە لە مێژووی رۆژهەڵاتی کوردستان بۆ سەرۆکەکانی کورد گرێدرا.ئەم کۆنگرەیە سێ رۆژ بەردەوام بوو. خۆپیشاندانێك بوو بۆ دۆستایەتی و هاریکاری کوردی -روسی، پەیوەندی باش لە نێوان

روسەکان و زۆر لە سەرۆك هۆزەکانی کرماشان بەسترا. هەروەها لە ١٤ ئەیلول کۆنگرەیەکی تر لە سنە لە نێوان ٢٧ سەرۆکی کورد گرێدرا. ژەنەراڵ باراتۆف ئەو ڕێکەوتننامەی لەگەڵ خانە کوردەکان مۆر کرد. ناوەڕۆکەکەی بە گوێرەی گلیەکانی باراتۆف ئەوە بوو: "عەشایرە کوردەکانی کوردستان و کرماشان، کە دوژمنی ئێمە بوون، لە ئێستاوە بە تەواوی دۆستی ئێمەن و تەیاری بەرگری کردنن لە سنوورەکانی کوردستان"[٩٩:١٥٦].

هەر لەو ساڵەشدا کە روسەکان خەریك بوون هێرشێکی تر بۆ ناوچەی سلێمانی بکەنەوە، ساردی نێوان شێخ مەحمود و تورکەکانیان بە هەلزانی، باراتۆف نامەیەك و شمشێرێکی بە دیاری بۆ شێخ نارد. بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی وەرام بکات، نامەیەکی تریشی بۆ نارد، کە تیایدا باسی ئەو سەرۆکە کوردانەی دەکرد تورکەکان گوللە بارانیان کردبوون. داوای لە شێخ کرد تۆڵەی ئەوانە بکاتەوە و وولاتەکەی لە بن دەستی تورکەکان رزگار بکات [٢٨:٣٨]. بەرامبەر ئەو گۆڕانانەی لە هەڵوێستی کورد روویدا بەرامبەر بە روسەکان، دەبێ روسەکانیش بەڵێنێکیان بە کورد دابێ ! لە راستیدا هۆی ئەوەی کوردەکان زۆرتر لەگەڵ روسەکان بوون، چونکە لە دەڤەرەکەیان نزیکتربوون، ئینگلیزەکان هێشتا لە باشوری میسۆپۆتامیاوە بەرەو کوردستان نەهاتبوون. باسیل نیکتین کە کونسوڵی روسەکان بوو لە وورمێ لەم بارەیەوە نووسیویەتی: "لە کۆتایی ساڵی ١٩١٧ لە مەڵبەندی کونسوڵخانەکەم پێشوازیم لە شاندێکی کورد کرد، کە لە لایەن کۆمەڵەی رزگارکردنی کوردستان (جەمعیەی استخلاصی کوردستان) نێردرابوون. نامەیەکیان لە سەید تەهاوە بۆ هێنا بووم، تیایدا داوای لێدەکردم چاوی بە پیاوانی سەربازی روسی بکەوێ، بۆ ئەوەی لە سەر کارێکی هاوبەش دژی تورکەکان لەگەڵیاندا رێکەون، کە بتوانن کوردستان رزگار بکەن[١٨٤:١٤٢]. شایانی ئاماژە پێکردنە هەر لەو ساڵەدا عەباس خانی سەردار رەشید، کە نەوەو میراتگری میری ئەردەلان بوو، لە روانسەرەوە راپەڕینی بەرپاکرد بۆ ئەوەی حکومەتە لە دەست چووەکەیان بگەڕێنێتەوە. لەگەڵ سەرۆك عەشیرەتەکانی ئەو دەڤەرە لە بنەوە پەیوەندی بەست، هەموو هەرێیان پێدا یارمەتی بدەن و پشتی بگرن [٢٧: ٧٢-٧٣].لە لایەکی تریشەوە فەرەنگەکانیش هەوڵیاندا لە کورد نزیك ببنەوە. حکومەتی فەرەنگسا لە ١٣ کانونی یەکەمی ١٩١٧ هەموو کاربەستانی ناوچەکەی ئاگادار کردەوە، کە کۆلۆنێل شاردینی بکرێتە لێپرسراوی دۆزینەوەی رێگایەك بۆ گفتوگۆ کردن لەگەڵ سەرۆکە کوردەکان [٢٦: ٢١٠-٢١١]. ئەو نزیك بوونەوەیە لە کورد لە

سۆنگەی ئەو گۆڕانکاریانە بوو کە لە بەرەکانی جەنگدا روویاندەدا، یاخود وا چاوەڕوان دەکرا روو بدات. لە هەمان کـاتدا نـارەزایی کـورد بەرامبـەر تورکـەکان گەیشـتبووە ئاسـتێکی بـەرز، چونکە هیچ حسێوێکیان بۆ کورد نەدەکرد. تەنانەت دوای کشـانەوەی هێزەکانـی روس لــە بەرەکانـی جەنگ، پـاش سەرهەڵدانی شۆڕشـی ئۆکتۆبـەر، وەك ئاشـکرایە تورکـەکان کەوتنـە پەلاماردانی باکوری کوردستان و قەوقاز و ئازربایجان. لە رێگادا کەوتنە قڕکردنـی ئەرمەنـەکان، ئەگەرچی ئەو سوپایە ژمارەیـەکی زۆری کـوردی لەگـەڵدا بـوو، کـەچی هـەندێك لـە ئەفسـەرە تورکـەکان، کـە دەسـتیان بـە سـەر تـەورێز داگـرت، بـە ئاشکرا رایانگـەیاند بـە گەیشـتنیان (ZO)*یان لەناوبرد لە گەڕانەوەشـیان (Lo)** یـەکان قـڕ دەکـەن ! [١٤٢:٣٤٨]. یـەکێکی وەکو جەلادەت بەدرخان لەو نامەیەی لە سیەکاندا بۆ مستەفا کەمالی نـاردووە، ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکا کە رۆژانە چەندین جار ئەو پەیڤانەی لە بن گوێ گوتـراوە[١٨:١٥١]. سـەرهەڵدانی ئـەو گۆڕانانە و هەوڵدانی لایەنەکان بۆ نزیکبوونەوە لە کورد، بە تایبەتی نزیك بوونەوەی روسـەکان لە کورد، مەترسی خستە دڵی ئینگلیزەکانەوە. چونکە دەیانزانی ئەمە دەبێتە ئەگەری بالا دەسـتی نفـوزی روسـەکان. لـە کـانونی دووەمـی ١٩١٨ پیـاوانی ئینگلـیز راپۆرتێکیـان بـەرزکردەوە دەربارەی نادڵسۆزی ئەو عەشیرەتانەی لە سـەر سـنووری ئـێران –تورکـی نیشـتەجێ بـوون. بـە تایبەتی عەشیرەتی سنجاوی کە مەترسیەکی بەردەوامی بـۆ رێگـای هـات و چـۆی بەریتانیـەکان چێکرد بوو. بۆیە لە نیسانی ١٩١٨ هێزیان کردە سەر ئەو عەشیرەتە، سـەرباری ئـەوەی لەگـەڵ ژمارەیەك لە سەرۆك و خاوەن دەسەڵاتە کوردەکان رێکەوتن، ئەو هێمنـی و ئارامیـە نەهاتـە دی لە رێـزی ئـەو کوردانـەی لـە ناوچـەی کـرداره سـەربازیەکانی بـەریتانیادا بـوون [٢٦:٢٥٥]. سۆنگەی ئەمەش وەك ویلسن نووسیویەتی نمایندەکانی دوژمـن چالاکانـە لـە نێـو ئـەو هێزانـەدا کاریان دەکرد. بە تایبەتی لە نێو رێزی سنجاویەکان خەڵکی وایـان دۆزیبـوەوە ئـارەزووی ئـەم جۆرە کارانەیان هەبوو. بۆیە هێرشیان دەکـردە سـەر کـاروانی ئینگلیزەکـان. تـا ئینگلیزەکـان هەڵسان بە رێکخستنی کۆمەڵێك عەشیرەتی کوردی، کە دۆستیان بـوون ! شـەڕێکی سـەختیان لەگەڵ سنجاویەکان کرد و لە ئەنجامدا ((عـەلی ئەکبـەرخان))ی سـەرۆکی سـنجاویەکان زامـدار

---

* ZO مەبەستیان لە ئەرمەنەکان بوو.

** Lo مەبەستیان لە کوردەکان بوو.

بوو [۲۸۵:۱۲۹]. ئینگلیزەکان لەم ماوەیەدا گەیشتبوونە ئەو پێواژۆکەی بەرەو باشوری کوردستان هەڵزنێن. بۆ ڕێگا خۆشکردن بۆ ئەو ئامانجە کەوتنە پڕوپاگەندە کردن، ئەوە بوو ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی)یان دەرکرد، زۆر جاران تێگەیشتنی ڕاستی دەکەوتە باسی ((خۆشەویستی)) و ((دڵسۆزی)) بێ هاوتای ئینگلیز بۆ کورد. دەینووسی: "حکومەتی ئینگلیز کوردانی زۆر خۆش دەوێ... چونکە دەزانێ لە تاریخی عالەمدا کوردان ناوێکی گەورەیان هەیە و بە مەردیی و ئازایی هەتا ئێستاکە خۆیان ڕاگرتووە. حەز ناکا بڵاوبێتەوەو خزمەتی ئەم و ئەو بکەن.. هەڵبەتە حکومەتی موعەزەمەی ئینگلتەرە، کە کوردانی لە هەموو کەس زیاتر خۆش دەوێ، وەکو ئیشی ئەقوامی تری ئاسان کرد ئیش بۆ ئەوانیش ئاسان دەکا" [۱۱۸:۳۷]. لە کاتێکدا ئینگلیزەکان گەرەکیان بوو بەم لە گوینە کورد فریو بدەن، تورکەکان هەوڵیاندەدا دوژمنایەتی کورد لەگەڵ دیانەکان هەڵایسێنن، وەك ئاشکرایە لەو کاتەدا باری نێو دەوڵەتی بەرەو ترسناکی دەچوو. ڕوسەکان لە سۆنگەی بەرپا بوونی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لەگەڵ ئەڵەمانەکان لە دانوستاندا بوون. ئینگلیزەکان لە لایەك لەو بۆشاییە گەورەیە دەترسان کە دوای کشانەوەی هێزەکانی ڕوس پەیدا دەبوو، لە لایەکی تر لەوە دەترسان تورکەکان لە بن فشاری ئەڵەمانەکان پەلاماری سنوورەکانی ڕوسیا بدەن، تا تەوقی ئەو پشتێنەیە خنکێنەرە بشکێنن کە هاوپەیمانان بۆیان چێکردبوون. بەم جۆرە دوای بەستنی پەیمانی بریست–لیتوفسك، ئەو ناوچەیە بووە گۆڕەپانی ململانێی ئەڵەمانی–بەریتانی، بە هۆی شوێنی ستراتیژی‌کە دەگەیشتە نێوەڕاستی ئاسیا و هیندستان و ئەفغانستان و ئەو پەترۆڵە زۆرەی کە هەیبوو [۱٤۷:۹٤]. لەو کاتەدا ئاوری دوژمنداریان لە نێوان کورد و ئاسوریەکان دایساند، هاوکات ئینگلیزەکانیش دەیانویست لە هێڵەکانی دواوەی بەرەکانی جەنگ ئەستەنگ بۆ تورکەکان چێبکەن. بۆیە لە تەموزی ۱۹۱۸ پەیوەندیان بە ئێزدیەکان کرد، بۆ ئەوە پاڵ بدەنەلای ئەوان و لە نێوان نیزیپ و موسڵ ڕێگا لە کاروانەکانی تورك بگرن. بۆ ئەم مەبەستەش بڕێك پارە و چەکیان دانێ.لەبەر ئەوەی ئێزدیەکانیش بەر لەو کاتە لە لایەن تورکەکانەوە دەستدرێژیان کرابووە سەر.ڕایانگەیاند هەرکە هێزەکانی بەریتانی گەیشتە ناوچەکانی ئەوان پەلاماری هێزەکانی تورك دەدەن[۲۵۰: ۱۹٤–۱۹۵]. هەر لەو ماوەیەشدا لە مانشێتی یەکێك لە ژمارەکانی تێگەیشتنی ڕاستی هاتبوو: "حکومەتی بەریتانیای عوزما سەعی بۆ کورد دەکا، ئەو حکومەتە وەك دەڵێ قۆڵێکی موحتەشەمەی بۆ کورد درێژ کردووە بۆ ئەوەی

خۆی له دهست حکومهتی تورك نـهجات دا، دهبـێ کوردهکـان بـه کـهمالی دیقـهت حهرهکـهت بکهن. چونکه ئهمڕۆ له حکومهتی موعهزهمـهی بـهریتانیا زیـاتر هیـچ حکومـهتێك نیـه خزمـهتی حوریـهتی بهشـهر و سـهعادهتی ئـهقوام بکـا" [۳۷:۱۱۹]. ئینگلیزهکـان هـهوڵیاندا کـورده پهڕاگهندهکانی ئهوڕوپاش لهو پڕوپاگهندانه تێوهگلێنن، واتا پڕوپاگهنده بـۆ ئـهو بیروڕایانـهی بـۆ سهرخوهبوونی کورد دهکران. بۆ ئهمهش تهنیا پشـتیان بـهو کهسـانه نهدهبهسـت کـه لایـهنگری خۆیان بوون وهك سورهیا بهدرخان، بهڵکو پشتیان بهوانهش دهبهسـت کـه دڵیـان بـه روسـهکان خۆش بوو. وهکو عهبدولڕهزاق بهدرخان و یوسف کامیل بهدرخان. ههواڵگری تایبهتی بهریتانی ههوڵیاندهدا بڕوایی به کورد بێنن که دوای ئهوهی جهنگ دیماهی دێت ئهوان رزگار دهبن. ههر لـه تـهموزی ۱۹۱۸ هـهندێك لـه سـهرۆکه کـوردهکـانـی نـاوچـهی مـههـابـاد بیرۆکـهی راگهیاندنی کوردستانێکی سهربهخۆیان له بن سهرپهرشـتی بـهریتـانیـا راگـهیاند. موکریهکـان لهم بارهیهوه گفتوگۆیان لهگهڵ کونسوڵی بهریتانیا له کرماشان کـرد[۲۵۵: ۲۶-۲۷]. دوای هاتنه خوارهوهی هێزهکانی ئینگلیزیش بۆ باشوری کوردستان، به تایبهتی بۆ ناوچـهکانی کفـری و کهرکوك، شـێخ مـهحمودی حـهفید پـهیوهندی پێوهکـردن. هاوکـات ژهنـراڵ مارشـاڵ چـهند ئهفسهرێکی نارده ناوچهکانی خانهقین و کفری بـۆ ئـهوهی هـهندێك خۆبهختکـهر(متطـوع) لـه سوارهی کوردی ناونووس بکهن. تا هێزی ناوچهیـان لێ پێکبهێنرێ و به موچهی تایبـهتی، دژی پڕوپاگهندهی تورك و ئهڵهمانهکان له بهرزاییهکانی سـیروان بـهکاریان بێنـن [۲۵۰:۱۹۳]. بـهم چهشنه تا دیماهی جهنگ کورد له ململانێ دابوو، له لایـهك له پێناو وهدیهێنانی ئاواتهکانی خۆی، که بهداخهوه به هۆی گهورهیی هێزه شهڕوانهکان، ئهو لایـهنهی زۆر بێ هێز بوو، له لایـهکی تـر وهکو گهمهیـهك له نێوان ئهو زلهێزانهدا! تا ئـاگر بهسـتی مـودروس راگهیـهنرا، کـورد زیـانێکی ئێجگار گهورهی لێکهوت. هاوکات لهگهڵ وهستانی جهنگ بزاڤـی رزگـاریخوازی کوردیـش لـه سهرتاسهری کوردستان بهرهو پێواژۆکێکی نوێ ههنگاوی نا.

# بەشی سێ یەم

# کوردستان لە ساڵەکانی دوای جەنگی جیهانی یەکەم

## باسی یەکەم : ناکۆکی و ململانێ

## لەسەر بەرژەوەندیەکان دوای جەنگ و چارەنووسی کوردستان

دوای ئەوەی جەنگی جیهانی یەکـەم دیمـاهی هـات ، بـە پێـی ئـاگر بەسـتی مـودروس ، دەبوایە تورکەکان دەست بەجێ هێزەکانیان لـە بـاکوری رۆژئـاوای فـارس کەدەکاتـە بـاکوری رۆژهەلاتی کوردستان–و ئەو دیو قەوقاز بکشێنەوە، بۆ ئـەو شـوێنانەی بڕیـاری لەسـەر درابـوو [XI : ٣٤٣]. دوای ئەمەش دەوڵەتی عوسمانی خرایـە سـەر خوانـی پارڤـە کـردن . پارچەیـەکی گەورەی کوردستانیش ، کەلە بن دەسەلاتی ئەو دەوڵەتەدا بوو ، پڕوشکی ئەو ئاورەی بەرکەوت . ئەوەی رۆڵی گەورەی لەو کـرداره دەگـێڕا ، بـە پلـەی یەکـەم ئینگلیزەکـان بـوون ، چونکـە بەشێکی گەورەی ئەو دەڤەرە لە بن کۆنترۆلی راستەقینەی ئەواندا بوو .

ئینگلیـزەکان هەر لەسەرەتاوە بەپێویستسان زانـی کـە ڕاو بۆچـوون دەربـارەی کێشـەی کوردو پاشەڕۆژی کوردستان پێشکەش بکەن. هەر دەسەلاندارێك لەوانـە لەشـوێنی خـۆیدا چ لەبەغداو چ لەندەن و چ لەئەستەنبوڵ قاهیرە ڕاو بۆچوونی خۆیان خستە ڕوو بەشیکی بـاش لـەم بۆچوونانە پۆزەتیڤانە بوون دەربارەی مافی کوردو وڵاتی کوردستان. بۆ وێنە مێژۆر نۆنێل دوای ئەوەی هاتە سلێمانی و لەلایەن خەڵکی سلێمانییەوە بەگەرمی پێشوازی کرا ڕایگەیاند کە ئەو هیـچ ئەسـتەنگێك نـابینێ لـە دامـەزراندنی دەوڵـەتێکی کـوردی لـەژێر پاراستنی بەریتانیـەکان [٢٨٥] هـەروەها وێلسـن پـێی وابـوو ڕاپرسـی ناوچـە کوردیـەکان بکرێـت، کەئەلتـەرناتیڤی نەچوونە پاڵ میسوپۆتامیا دامەزراندنی دەوڵەتێکی جیاوازو سەربەخۆ دەبێت کە نزیکەی هەموو ویلایەتی موصل (باشوری کوردسـتان) بگرێتـە خـۆ، کەلـەژێر دەسـەلاتی تورکیـش دا نـەبێت هەروەها لەوانەیە لەژێر پاراستنی بەریتانیەکانیش نەبێت [١٢٩ : ٣٢٩–٣٣٠]. هەرچی کرزن بوو ئەویش لەسەرەتادا ڕای وابوو کـە کوردسـتانێکی سـەربەخۆ دابمـەزرێت [٨٧] بـەم جـۆرە بۆمان دەردەکەوێ کەوا هەڵوێستی ئینگلیزەکان کە خۆی لەزۆربەی ئـەو راوبۆچونانـە دەنوانـد کە پێشکەش کرا لە ساڵەکانی دوای جەنگ هەتاوەکو کۆتایی هاوینی ١٩٢١ بەشێکی زۆریـان پۆزەتیڤانە بوو. چونکە زۆر هۆ پاڵی بە ئینگلیزەکانەوە نابوو کە بایـەخ بـە دۆزی کـورد بـدەن.

وەك ویڵسن گوتی: یەکەمیان پاشەڕۆژی باشوری کوردستان (ویلایەتی موسڵ) کە زۆربەی دانیشتوانی کورد بوون دووەمیان دۆزی ئەو زەوی و زارانەی کە دەکەونە ژوور ویلایەتی موسڵ، سێ یەمیان بزاڤی نەتەوایەتی کورد بوو لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان کە پێویست بوو حسێبێکی تایبەتی بۆ بکەین .

بەم چەشنە چارەنووسی کوردستان کەوتە بەرنەشتەری بیروڕای جیا جیا ، هەریەکە لەروانگەیەکەوە سەیری دۆزی کوردی دەکرد،وەڵێ هەموو رایەکان لەوە رێك و تەبا بوون کە دەوڵەتێکی یەکگرتوویی کوردی چێ نەبێ. لەو رۆچنەیەوە دەیانڕوانیە دۆزەکە چۆن بتوانن ئەو دەستکەوتانە بچەسپێنن کە لە جەنگدا وەدەستیان هێنابوو. وەك تەوەرێکی بنەڕەتی کوردستان بۆنی ئەوەی لێدەهات پارڤە بکرێ بۆ چوار پارچە، بەشی باکور، باشور، رۆژهەڵات، رۆژئاوا. بەشی باشور بە میسۆبۆتامیاوە بلکێنرێ ، ئەو بیرۆکەش لەگەڵ بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی عەرەبی هاتبووە ئاراوە . کەلێژنەی رۆژهەڵاتی ناڤین لە ٢٧ تشرینی دووەمی ١٩١٨ لەو کۆبونەوەیەی بەسەرۆکایەتی کرزن گرێدرا ، لەو دۆزەی کۆڵیبوەوە [ ١٠٠ : ١٧٠]. هەرچی بەشی رۆژهەڵاتی کوردستان بوو ئەوا لەبەر دەستی ئێرانیەکاندا مابوەوە، چونکە ئێران بەشێوەیەکی رێژەیی، قەرزار نەبوو، لەجەنگدا بێلایەن بوو، داهاتێکی سەرەتایی پەترۆلی هەبوو. ئەو خاڵانە وایانکرد لەو چارەنووسە رزگاری بێ کە دەوڵەتی عوسمانی دوچاری بوو [ ١٧٩ :٢٥ ]. کرزن * لەم بارەیەوە گوتی : "بەهۆی شوێنی جوگرافی ئێران و بەرژەوەندی مەزنی ئێمە لەم وڵاتەدا، هەروەها لە پێناو ئاسایشی ئیمپراتۆریای ئێمە لە رۆژهەڵاتی ناڤین ، هەرگیز ناتوانین دەست بەرداری ئێران بین .ناتوانین رێگای ئەوە بدەین ، بە بیانگەی نالەباری حکومەت، ئاژاوە لەو هێڵە هەستیارە بێتە ئاراوە کەدەکەوێتە نێوان ئیمپراتۆریای ئێمە لە هیندو میسۆپۆتامیاو بکرێ بە مۆڵگەی پلاندانانی سیاسی نێو دەوڵەتیی و تەنگژەی ئابووری[٣١٦ : ٢٦-٢٧]. هەر بۆیە کاتێك کوردەکانی رۆژهەڵات ئارەزووی ئەوەیان دەربڕی کە گەرەکیانە بچنە پاڵ حکومەتەکەی شێخ مەحمود، ئینگلیزەکان رایانگەیاند لە توانای ئەواندا نیە کارێکی وابکەن دژی سەربەخۆیی ئێران بێت و لەگەڵیدا نەگونجێن. هاوکات

---

* جورج نتئائیل کرزن (١٨٥٩ -١٩٢٥ ) یەکێکە لە سیاسەتوانە گەورەکانی ئینگلیز . لەتەمەنی (٣٩) ساڵیدا بوو بەپاشای هیند (١٨٩٨-١٩٠٥ ) هەروەها لە (١٩١٩ -١٩٢٤ ) پلەی شالیاری هەندەرانی وەرگرت. رۆڵێکی سەرەکی هەبوو لە چارەسەرکردنی کێشەکانی ئەوروپاو رۆژهەڵاتی نزیك لەدوای جەنگ . بەدرێژایی جەنگی جیهانی یەکەم ئەندام بوو لە شالیارگەی جەنگی بەریتانی [ ٣٠٠ : ٤٠ ].

رایانگەیاند ئەو عەشیرەتانەی لە خاکی عوسمانیەوە کۆچیان کردووە بۆ ئێران، پێویستە بگەڕێنەوە خاکی خۆیان [٣٢٦ : ٢٨٦ ] . مەبەستیشیان لە مەدا ئەوەبوو مەترسیەك بۆ ئەو هۆزە کوردانەی ڕۆژهەلاّت چێ بکەن کە یارمەتی ( شێخ مەحمود )یان دەدا. هەروەك چۆن گەرەکیان نەبوو کەس خۆی لە سەربەخۆیی ئێران هەڵقورتێنێ ، بەهەمان لەگوین نەیاندەویست کەس دەست لەکاروباری باشوری کوردستان ( ویلایەتی موسڵ) وەربدات. بۆیە کاتێك لە کۆشکی وێلز رای ( ویلسن ) یان دەربارەی دوا ڕۆژی ئەم دەڤەرە پرسی، گوتی : باشوری کوردستان و (دیرئەلزور) بە میسۆپۆتامیاوە دەلکێنرێ ، هەروەها ئەو دەڤەرە کوردیانەشی پێوە دەلکێنرێ کە ئێستا بەشێکن لە ویلایەتی موسڵ [ ٢٠٧ : ١٣٥-١٣٦ ]. ئینگلیزەکان لەمێژ بوو بەرژەوەندیەکانی خۆیان لە باشوری کوردستان دۆزیبووەوە، کە ئەگەرچی بەگوێرەی پەیماننامەی سایکس پیکۆ بەر فەڕەنگەکان کەوتبوو ، واتە بەناو هی فەڕەنگەکان و بەکرداریش لەبن دەستی ئینگلیزەکان دابوو ، هەرگیز ئامادە نەبوون دەست بەرداری بن ، ئەوە بوو لۆید جۆرج سەرۆك شالیارانی ئینگلیزی توانی بە فێڵێکی زیرەکانە لەبەردەستی کلیمانسۆی سەرۆك شالیارانی فەڕەنگی دەربێنێ .

ئینگلیزەکان لە پێناو دابینکردن و پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆیان بەزۆر شێوە کۆسپیان لەبەردەم قەوارەیەکی سەربەخۆی کوردی چێدەکرد . لەو ئەگەرەش بوو بیرۆکەی ئۆتۆنۆمیان داهێنا ، کە بۆ یەکەمین جاربوو لە کوردستان و بگرە لە ڕۆژهەلاّتی ناڤین ، لە لایەن ئینگلیزەکانەوە بە کارهات . ئەو بیرۆکەیان سەبارەت بە بارودۆخی ناوچەکەو بەرژەوەندیەکانی خۆیان داهێنا . تا بەرەنگاری بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی پێبکەن [١٤ : ١٤ ]. تەنانەت جۆرو شێوەی ئەو ئۆتۆنۆمیەش ، وەك ویلسن لە کۆنگرەی ئاشتی پێشنیاری کرد دە بوایە بمێنێتەوە بۆ ئەوەی بەریتانیەکان دەست نیشانی بکەن ! [٣٣ : ٤٢ ] .

ئەو ململانێ و ناکۆکیانەی دوای جەنگ سەریان هەڵدا ، ترسێکیان لای سەرۆکەکانی کورد گوراند. ئەو نامەیەی سەید عبدولقادری شەمزینی لەرێگای نوێنەری کورد شەریف پاشا بۆ کۆنگرەی ئاشتی نارد لە پاریس ، ئەو ترسەی بە ئاشکرا پێوە دیاربوو، سەید عبدولقادر لە نامەکەیدا نوسیبوی : "ئەو پڕوپاگەندانەی بۆ پارڤەکردنی کوردستان * بۆ دووبەش وە هەرمێن دەخرێن ، وام لێدەکا سەرنجی بەرێزتان بۆ ئەوە رابکێشم، کە ئەم پارڤە کردنە پەرای ئاشتی ناکات لە ڕۆژهەلاّتی نزیك" [ ٢٩٣ : ١٠٧ ]. تەنانەت مەترسی پێوەلکاندنی باشوری

* مەبەستی لەو پارچەیەی کوردستانە کە لەبن دەسەلاتی عوسمانیەکاندا بوو.

کوردستان بەمیسۆپۆتامیا ، وای لە هەندێك لە رۆشنبیرانی کورد کرد بەلایان چاکتربێت بە ئێرانەوە بلکێنرێن ! بۆ ئەم مەبەستە شەریف پاشا لە کۆنگرەی ئاشتیەوە تەلەگرافێکی بۆ نامق بەگ و مەحمودپاشای سەرۆکی جافەکان نارد ، ئەوەی دوپات کردەوە ، لەجیاتی میسۆپۆتامیا ، کورد ئارەزوو دەکەن بە ئێرانەوە بلکێنرێن . بۆ ئەمەش داوای کۆکردنەوەی واژووی لێکردن [٢٧٦ :٣٩٢ ]. ئەمە لە کاتێکدا ئینگلیزەکان هەموو توانایەکیان خستبووە گەڕ بۆئەوەی ئێران لە گفتوگۆکانی کۆنگرەی ئاشتی هەلاوێردن . بەبیانگەی ئەوەی بێلایەن بووە و بەشداری جەنگی نەکردووە [ ١٩٥ : ٢٨ ] .

لەو ماوەیەدا گۆڕانی زۆر بەلەز بەسەر تەرازووی هێزەکان دادەهات، کە ئەمە رۆلی گەورەی لەسەر سیاسەتی جیهان بەگشتی ورۆژهەلاتی ناڤین بەتایبەتی هەبوو. کە کاریگەری راستەوخۆو ناراستەوخۆی لەم پێواژۆکەو پێواژۆکی دواتری مێژووی کوردبینی.

لەو گاڤەدا یەکێتی سۆڤیەت کە وەکو زلهێزێك سەری هەلدابوو. ئەگەر چی خۆی بەپشت و پەنای چەوساوەو بن دەستان دەزانی، نەك هەرپشتی کوردی نەگرت ، بگرە بەکۆنە پارێزو چاوێکی دوژمنکارانەوە دەیڕوانیە هەموو بزاڤە نەتەوایەتیەکانی کورد.لەو بانگەوازەی کە ئاڕاستەی موسلمانانی رۆژهەلاتی ناڤینیشیان کرد ، ناوی دوانزە میللەتیان هێنا، ناوی کوردیان نەهێنا ! [ ٣٣: ٣٥] هەر لەسالی (١٩١٧ ) ەوە لینین رایگەیاند کەوا حکومەتەکەیان بەشێوەیەکی گشتی هەموو رێکەوتننامە نهێنیەکان رەتدەکاتەوە، بەتایبەتی ئەو رێکەوتننامە نهێنی یانەی دەرحەق بە دەولەتی عوسمانی گرێدرابوون [٢٣:١٠٧]. ئەم هەلوێستە مەترسی بۆ ئینگلیزەکان چێکردو وای لەیەکێکی وەکو لۆید جۆرج کرد لە ووتارێکیدا بلێ : "بەریتانیا هەرگیز نەیویستووە تورکیا لە پایتەخت دووربکاتەوە چونکە شوێنی رەگەزی تورکەکانە!" [ ٣٤٧ :٣٢٤ - ٣٢٥ ]. بەم جۆرە لەلایەك کار بۆ پارڤەکردنی کوردستان دەکرا ، لەلایەکی تر هەولدەدرا کورد بەبن دەستی بمێنێتەوە . کوردستان لە نێو بەرداشی دووزلهێزدابوو، کە هەولەکانی شتاقیان لە بەرژەوەندی ئەودانەبوو.

لەو کاتەدا کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس لە کۆبونەوەکانی خۆی بەردەوام بوو، لە دیمانەی گفتوگۆیەکدا کە لە ٣٠ کانونی دووەمی ١٩١٩ ئەنجامیاندا گەیشتنە ئەو بڕیارەی : "هاوپەیمانان و ئەو دەولەتانەی لەگەل ئەوان لەسەر ئەوە رێکەوتوون ، ئەرمەنستان و سوریا و میسۆپۆتامیا و کوردستان و فەلەستین و نیمچە دورگەی عەرەب پێویستە بەتەواوی لە ئیمپڕاتۆریای تورکی جوێ بکرێتەوە [٢٧٩: ٤١ ] . دواتر لەسەر پێشنیاری سەرۆك

شالیارانی ئیتالی (ف. ئۆرلانـدۆ) واژەی ئەرمەنستان و کوردستان و سوریاو میسۆپۆتامیا و فـەلەستین و نیمچە دورگەی عەرەبی لەدەقەکە لابران و کران "بەو زەویانەی کە پێشتر سەر بە تورکیـا بـوون". وەك نووسـەرێك نووسـیویەتی : "ناوهێنـانی ئەرمەنستان و کوردسـتان زۆر سەخت بوو هێشتا بەر لەکاتی خۆی بوو" [ ٢٥٥: ١٤٨ ] .

هەرچی ئەمەریکاییەکان بوو پێ یان وابوو ئەو ناوچە سروشتیە جوگرافیە بدرێتە کورد ، کە لە باکورەوەی ئەرمەنستانی پێشنیارکراو ، لە باشوریشیەوەی میسۆپۆتامیابوو ، هـەروەها لە رۆژئاواوە نێوان دیجلە وفـورات، لەرۆژهەلاتیشـەوە سـنووری ئـێران . دەلـوێ ئـەم زەویانـە بخرێنە ژێر حوکمی منداتێکی توند، بۆ ئەوەی بۆ سەربەخۆ بوون تەیاربکرێن [٢٥٥ :١٥٧ ] . ئەگەر ئەو پێشنیارەی ئەمریکاییەکان لەسایەی ئەو گفتوگۆیانـەوە تـاوتوێ بکـەین ، کـە لـە کۆنگریسی ئەمەریکا هاتە ئـارا ، لـە ١٤ تشـرینی یەکـەمی ١٩١٨ ، ئـەندامێکی کۆنگریـس بڕیارێکی هاوبەشی پێشکەش کردو تیایدا دانیان بە کۆمـاری (ئـارارات )نـا، یـاخود بڕیـاری ٣٧٨ کونگرێس کە دانی بە ئەرمەنستان دەنـا بەهـەر شـەش ویلایەتەکەیـەوە، [ ٢٥٩: ٨٨ ] ئەوەمان بۆ روونەبێتەوە کەوا ئەو پێشنیارە تەنیا بزاڤێکی دیپلۆماتێکی ئەمەریکی بوو بۆ فشار خستنە سەر ئینگلیزەکان تا مەرامە سیاسی و ئابووریەکانی خۆیان وەدەست بێنن.

جێگـای ئامـاژە پێکردنـە ئـێران لـەو گاڤـەدا بـەو بـێ هێزیـەی خـۆی ، بـەبێ ئـەوەی چاوەڕوانی بانگهێشت بکات، لەژێر سەرکردایەتی شالیاری هـەندەرانی خـۆی (مشـاور ممالك النصـاری ) بـەهیوای بەشـداریکردن شـاندێکی نـاردە کۆنگـرەی ئاشـتی. شـاندەکە چاویـان بەژمارەیـەك لـە سـەرۆکەکانی دەوڵەتـە گـەورەکان کـەوت لەوانـە پوانکـارێ * وسـەرۆکی ئەمەریکی ویلسن [٣٢٢: ٥٣ ] . وەڵێ ئینگلیزەکان ئامادە نەبوون گـوێ بـۆ داواکاریـەکانی ئێران رادێرن، لەو نامەیەی ئەحمەد فروغی ، یەکێك لەئەندامانی شاندەکەی ئێران کە بۆ تارانی ناردووە نووسیویەتی : "تا ئێستا لە رەفتاری ئینگلیزەکان ئـەوەمان بـۆ دەرکـەوتووە دەیانـەوێ ئێران لە رووی سیاسی و ئابووریەوە لەبن دەستی خۆیاندا بێـت" [٣٢٢ :٥٤ ]. گومـانی تیـا نیە ئێرانیەکانیش دەیانویسـت سـوود لـەو کاودانـە نێـو دەوڵەتیـە وەربگـرن کـەدوای جـەنگ هاتبووە ئارا .هەستیان دەکرد یەکێتی سۆڤیەت ، ئەو هێزە نوێیەی لە سـنوورەکانی باکوریـان پەیدابوو، مەترسی بۆ سەر ئینگلیزو رۆژئاواییەکان هـەبوو. لەهـەمان کاتیشـدا سـۆڤیەتیەکان

---

* سەرۆکی فەرەنسا بوو

گەرەکیان بوو بە هەموو شێوەیەك دڵی ئێرانیەکان رابگرن. لە ٢٦ حوزەیرانی ١٩١٩ ( ل. کاراخان ) جێگری کۆمیساری کاروباری هەندەرانی سۆڤیەت یاداشتنامەیەکی دا بە ئێران، تیایدا پوختەی ئارەزووی وولاتەکەی دەربڕیبوو بۆ قەرەبوکردنەوەی ئەو زیانانەی ئێران لەسەر دەستی روسیای پێشوو لێی کەوتبوو. رایگەیاند، قەرەبوەکەیان بەوە دەبێت، دەست لەو قەرزانە هەڵدەگرن کە لە لایەن روسیای تەزاریەوە درابوو بە ئێران. هەروەها دەست بەرداری هەموو مافێکی دارایی دەبن لە گومرگ و تەلەگراف و پۆستەو باج و جیاوکە تایبەتیەکانی تر [٧ : ٢١٣].

ئاخاوتن لەسەر ناکۆکیەکان و چارەنووسی کوردستان بەو لەگوینەی ئاماژەمان بۆ کرد لەراستیدا گەڕانەوە بوو بۆ پارڤەکردنەکەی پەیماننامەی سایکس-پیکۆ، تەنیا ئەو گۆڕانەی تیاکرابوو باشوری کوردستان ( ویلایەتی موسڵ) لە فەڕەنگەکانەوە گوێزرابووەوە بۆ ئینگلیزەکان. هاوکات لەسۆنگەی کشانەوەی روسەکانیش بۆشاییەك لەناوچەی نفوزی روسەکان هاتبووە ئارا. واتە لەباشورو رۆژهەلاتی کوردستان بارەکە چەسپا بوو. تەنیا دیاریکردنی سنوورەکانیان مابووەوە. ناوچەکانی رۆژئاواش کەوتبووە بن نفوزی فەڕەنگەکان و چارەنووسی بەو دەوڵەتە عەرەبیە بەستڕابووەوە کە خەریك بوو لە بن سایەی فەڕەنگەکان لە سوریا دادەمەزرا واتە تەنیا ناوچەکانی ناڤین و باکوری کوردستان مابووەوە !

هەواڵی پارڤە کردنی کوردستان لەرێگای شەریف پاشا لە کۆنگرەی ئاشتیەوە گوێزرایەوە کوردستان ئەم هەواڵانە کوردیان وروژاندو مەترسیەکی گەورەشیان بۆ ئینگلیزەکان چێکرد بۆیە شالیارگەی هەندەرانی بەریتانی هەڵوێستی خۆی لەم بارەیەوە روونکردەوە. دوپاتی کردەوە کەوا کۆنگرە دەربارەی چارەنووسی کوردستان هێشتا نەگەیشتۆتە هیچ بڕیارێك . ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە کۆنگرە لە کارەکانی خۆی بەردەوامە بۆ دامالینی کوردستان لە ئیمپراتۆریای تورکی و دابینکردنی سەربەخۆیی خۆی. هەروەها گوتی : "هێشتا هیچ توێژینەوەیەك نەکراوە بۆ ئەو رێگایانەی کە پێویستە بگیرێتە بەر بۆ وە دیهێنانی ئەم ئامانجە" [٢٧٦: ٣٣٩ ] لە هەمان کاتیشدا ئینگلیزەکان پەیتا پەیتا پڕوپاگەندەیان دەکرد و رێگایان بۆپارڤە کردنی کوردستان خۆشدەکرد. پەیامنێری رۆژنامەی تایمز لە ٢٢ ئایاری ١٩١٩ نووسی : "تاکە رێگا بۆ پاراستنی ئاشتی لە ناوچەکانی خانەقین و سلێمانی ئەوەیە باشوری کوردستان بە میسوپۆتامیاوە بلکێنرێت" [١٣٥: ٣٠٧ ] هەر بەهەمان مەبەستیش بەڵگەنامەکانی بەریتانی ئەو سەردەمە هەوڵدەدەن باری کوردستان بە ئالۆزو

تڕی ئاشوبە نیشان بدەن ، تارووی ڕاستەقینەی نیازەکانیان لـە پەنا بشارنەوە . ئـەگینا ئەگـەر پلانی داگیرکەران نەبوایە ئامانجەکانی کورد روون و ئاشکرابوو .ئەم گێرە شێوێنیەی ئینگلـیز و دارو دەستەکانیان هەر بۆ ئەوە بوو هەستی ڕاستەقینەی کورد بەدومان بێت و روخسارەکەی دیارنەبێت. ئەگەر چی هەست و نەستی ئەوان هیچ رۆڵێکی نەدەبینی و بەرژەوەندی زلهێزەکان سەنگی مەحەکی دانوستانەکان بوو ! سەرباری ئەمەش هەندێك لە لێپرسراوانی ئینگلیز رقێکـی تایبەتیان بەرامبەر بە کورد هەبوو . لەیەکێك لەو بەڵگەنامانەی کە لـە ١٣ حوزەیرانـی ١٩١٩ لـە لایـەن کـارگێڕی سیاسـی بـەغدا دەرچـووە، دوای ئـەوەی پڕۆژەیـەکی بـۆ پارقـەکردنی کوردسـتان خسـتۆتە ڕوو لـە کۆتـایی بەڵگەنامەکـە نووسـیویەتی : "لام باشـترە لـە جیـاتی سەربەخۆیی کوردان، ئەمەریکا تەنانەت تورکیا لە کوردستان ببینم" [ ٤٥ : ٩٠ ] ئەمـە رای ڕاسـتەقینەی ئینگلیزەکـان بـوو، بۆیـە کـاتێك چـەند پێشـنیارێك لەلایـەن لێپرسـراوێکیان دەربارەی وورمێ خرایە ڕوو، کە تیایدا پێشنیاری کردبوو وورمێ یا بە کوردستان بلکێنرێ ، یـاخود بخرێتـە بـن دەسـەڵاتی دەوڵـەتێکی بێگانـەوە، یـا بدرێتـە فارسـەکان [ ١٩٤: ٣٩]. بەریتانیەکان ڕێگای سێ یەمیان هەڵبژاردوو خستیانە بن دەستی فارسەکان !

لەو ماوەیـەدا ململانێ لەسەر کوردستان خەریـك بوو بـەرەو پێواژۆکێکـی مەترسـی دار هەنگاوی دەنا، ئەمە وایکرد لە ئـەنجامی ئـەو ململانێ یـەدا هـێزی ناوچـەیی تـر سـەرهەڵبداو بەرزبێتەوە. وەك مێژۆرنۆئێل لە یاداشتەکانی رۆژی ٧ ئەیلولی ١٩١٩ نووسـیویەتی : "ئـەمرۆ مێژۆر برۆنۆی فەرەنگسی گەیشتۆتە ناوچەکە. لە بەشی ژاندارمی ناوچەی خارپوت و سیواس بە پشکنەر کاردەکات. نایشارێتەوە کە لایەنی مستەفا کەمال دەگرێـت و لـە زۆر بۆنـەدا ئـەو پشتگرتنەی بە ئاشکرا دەربڕیوە. بێزاری خۆی بەرامبـەر ئـەو هەنگاوانـە نیشانـداوە کـە دژی مستـەفـا کەمال نراوە" [ ٤٩ : ٧٠ ]. ئەمە وای لە ئینگلیزەکان کرد هەڵوەستەیەك بکـەن و بسەنگرێنەوە . ئەدمیراڵ ویپ لە ٨ ئەیلولی هەمان ساڵدا حکومەتەکەی ئاگادارکردەوە کـەوا : "سەرنەکەوتن لەگەیشتن بە ئاشتیەکی هەمیشەیی گەورەترین گیروگرفتی چێکـردووە. [٣٤٣: ١٨١ ] . ئەم کردارانە وورەی کەمالیستەکانی بـەرز کـردەوە بۆیـە هـەوڵیاندا لەگـەڵ عەرەبـە توندڕەوەکـان دەسـت تێکـەڵ بکـەن ، کەلـە سـوریا دژی فەرەنگـەکان خـەباتیان دەکـرد . کۆمیساری باڵای ئینگلیز لە قاهیرە لە ١٩ ئەیلول تەلەگرافێکی نـاردووە باسـی ئـەوە دەکـات "کەوا (رەمەزان شلاش) حەلەبی جێ هێشـتووە ، خـۆی بـە فـەرمانڕەوای (خـاپور و فـورات ) ناساندووە، بەگوێرەی ئەو زانیاریانەی هەن پەیوەندیەکی پتەو لـە نێـوان حکومـەتی دیمەشق و

تورکەکاندا هەیە" [ ١٣٠ : ٢١]. شایەنی باسە هەندێك جاران لەنێو ئەو ناکۆکی و ململانێ یەدا راستی دەدرکێنرا ئەگەر چی ناراستیشیان مەبەست بوایە ! بۆ وێنە لە ١٦ تشرینی یەکەمی ١٩١٩ شالیاری هەندەرانی ئێران ( نصر الله فیروز الدولە ) بەکرزنی راگەیاند : "ئەو پێی راست نیە بڵێی کوردستانی تورکیا و کوردستانی ئێران، چونکە لەراستەقینەدا هەموویان یەك کوردستان پێکدەهێنن. ئەوەی لەنێوان ئەم دووپارچەیە ناوی سنووری لێنراوە سنوورێکی ئەندێشەییە.[ ٢٨٣: ٤٦ ]. لەنێوەڕاستی ساڵەکانی ١٩١٩ وسەرەتای ساڵەکانی ١٩٢٠ کەمالیستەکان وەك هێزێکی بەرچاو وەدیارکەوتن، دوورنیە بەریتانیەکان خۆیان دەستیان لەمەدا هەبووبێ [ ٢١١]. بۆئەوەی بیانکەن بەئامرازێك کێشەکانی رۆژهەلاتی ناڤینیان پێ یەکلابکەنەوە. بەشکچی دەڵێ : "لەساڵانی ١٩٢٠ کێشەی کەمالیستەکان لەگەڵ ئینگلیزەکان لەسەر زەوتکردنی پارچەیەکی گەورەتر بوو لەکوردستان. ئەم کێشەیە کێشەیەکی کۆلۆنیالی بوو ، ئەم کێشەیە لەسەر بەتورك کردن و کۆلۆنیکردنی کوردستان بوو. بۆیە کێشەی کەمالیستەکان هیچ ناوەرۆکێکی دژ بە کۆلۆنیالیستی و ئیمپریالیستی نەبوو . [١: ٥٤] .

کەمالیستەکان هەوڵیاندەدا سوود لەو مەترسیانە وەرگرن کە سۆڤیەتیەکان چێ یان کردبوو .ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ چەندەی ململانێ یە نێو دەوڵەتیەکە بەگوڕتر دەبوو، ئەو هێزە ناوچەییانەی کە خەریك بوو سەریان هەڵدەدا، هێندە زێتر بەرز دەبوونەوە. بارتەقای ئەمەش دۆزی کورد کپ دەکرایەوە و پشتگوێ دەخرا !

سیاسەتی بەریتانیەکان ئەوەبوو چەند دەوڵەتێکی بەهێز لەسنوورەکانی سۆڤیەتدا وەك داردەستەیەکی خۆیان دامەزرێنن . سۆڤیەتیەکانیش هاوکات دەیانویست مەترسیەکانی ئینگلیز لە خۆیان دووربخەنەوە و پەیوەندی دۆستانەو هاریکاری لەگەڵ هاوسێکانیان ببەستن .مستەفا کەمال و رەزاخان ئەو دووکەسە بوون ، بۆ ئەو گەمەیە ، لەلای هەردوو بەرەی ململانێ یەکە بەشیاو و لەبار دەبینران ! دەیانتوانی باشترین رۆڵ لەبەرێوەبردنی ئەم سیاسەتە بگێڕن . بەپلەی یەکەمیش لەسیاسەتی ئینگلیزەکان ، چونکە ئەوان لەو بوارە دا دەست پێشخەر بوون . بۆیە پێویستە بەئاگاداریەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو بەڵگەنامانەدا بکەین کەدەیانەوێ رووی راستەقینەی سیاسەتی ئینگلیزەکان لەکوردستان بشارنەوە کە دەستیان لەهەموو شتێکدا هەبوو بۆ وێنە رەزاخان پەیوەندیەکی پتەوی بەگەورە ئەفسەرانی ئینگلیزەوە هەبوو ، دوای ئەوەی دەسەلاتی کەوتە دەست بە "هاورێ یانی چەك ناوەزەندیدەکردن"

[١٩٥ : ٦٠ ]. لەو سۆنگەیەش بوو ئینگلیزەکان چەندین بروبیانگەیان بۆ سنوورەکانی باشوری کوردستان دەدۆزیەوە بۆ پارێزگاری کردنی دەوڵەتی عەرەبی. وەك ئەندمۆندز دەڵێ: بڕیارمان دا باشترین بیانگە کەبەرزی بکەینەوە بیانگەی ئابووری‌یە ![ ١٨٤: ٣٦٦ ].

سەرباری ئەو هێزە نێو دەوڵەتیانە ، ئەو هێزە ناوچەییانەش کە بۆ سەربەخۆیی کاریان دەکرد ، گەرەکیان بوو خاکی کوردستان بۆ خۆیان بپچڕنەوە .هەر بۆئەم مەبەستەش عەرەبەکانی سوریا پەیوەندیان بەکەمالیستەکانەوە کرد. لەسەر چەند خاڵێك لەگەڵیان ڕێکەوتن . یەکێك لەخاڵەکان پەیوەندی بەهەندێك دەستکاریەوە هەبوو لەسنوورەکانی باکوری سوریا .[ ٩٩: ٦٠]. واتە داوای زێتر پچڕینەوەی خاکی کوردستانیان دەکرد بۆ سەر ئەو دەوڵەتە عەرەبیەی کە هێشتا لە سوریا دایاننەمەزراندبوو !

لایەنە بەرژەوەندی دارەکان ، ئەگەر لەکاتی جەنگدا بەچەك پاڵپشتی یەکتریان کردبێ ، ئەوا دوای جەنگ بەهۆی ناکۆکی بەرژەوەندیەکان بەردەوام لە دانوستان بوون . ئەمەش نیشانەی گۆڕانی بەردەوام بوو لەشێوازەکانی ئەوچارەسەریانەی کەدوای جەنگ بۆ ئەژواریەکانیان دادەنا. لە٢٣ نیسانی ١٩٢٠ ڕێکەوتننامەیەکی سێ‌قۆڵی لەنێوان حکومەتەکانی فەڕەنگساو ئیتالیا وبەریتانیا گرێدرا. تیایدا ئەوەیان دەربڕی کە ئارەزووی دڵسۆزانەیان هەیە یارمەتی تورکەکان بدەن لەپێشوەبردنی داهاتەکانی خۆیان و وەلاوەنانی ململانێی نێو دەوڵەتی .کە ببووە ڕێگر لەبەردەم ئەم ئامانجانەدا .لەم ڕوانگەیەوە وەك دەیانگوت ! سەربەخۆیی کوردستان ئێستا یادواتر لەلایەن ئەو دەوڵەتانەوە دانی پیادەنرێت ![٢٨٤: ١٠٠ ] .کەچی لەهەمان کاتدا لۆید جۆرج دەربارەی باری کوردستان گوتی : کە ئەو بۆخۆی هەوڵیداوە بیروبۆچوونی کوردەکان بزانێ . دوای گەڕان و پرسین لە ئەستانەو بەغدا و جێگای تر هیچ کوردێکی وەکو نوێنەری کورد بۆدەرنەکەوتووە ، هەرتەنیا نوێنەری هۆزەکانی خۆیان بوون ! لەلایەکی تر ئەوەی بۆ دەرکەوت ، کوردەکان هەستیان کردووە بەبێ ئەوەی هێزێکی دەرەکی هەبێت پارێزگاریان لێ بکات، ناتوانن پارێزگاری لەخۆیان بکەن . هیچ کامێکیش لەفەڕەنگ و ئینگلیز، توانای هەڵگرتنی ئەو ئەرکەی نیە ! بۆیە هیوای ئەوەی خواست کەوازیان لێ‌بهێنرێ و بکەونەوە بن چەپۆکی تورکەکان ،چونکە وولاتەکە لەبن دەسەڵاتی ئەواندا ڕاهاتووە . هەروەها گوتی : "شتێکی ئاسان نیە کوردستان لە تورکیا جوێ‌بکرێتەوە!"[ ٣٤٣ :١ ٣٠-٢ ٣٠ ]. ئەم ڕایانەش ڕادەی ناکۆکی نێوان ئەولایەنانە دەردەخات کەهەردوو ڕۆژ دوای ئەوە کۆنگرەی (سان ڕیمۆ )یان گرێداو لایەکی کوردستانیان بەمیسۆپۆتامیاوە لکاند!.

وەك ئاماژەی پێكرا كوردستان لەرووی سیاسی و سەربازیەوە زوو پارڤەكرابوو . ئەو هەموو گفتوگۆو رێكەوتننامانەی لەو ماوەیەدا گرێدەدران تەنیا بۆ ئەوەیان بوو شێوەیەكی (یاسایی ) و ( شەرعی) بەپارڤەكردنەكە بدەن. سیستەمی ماندات كە لە سان ریمۆ پیادەكرا، لەراستیدا تەنیا بەرگێكی یاسایی بوو كردیانە بەر بەرژەوەندە یەكانی خۆیان، لەو دەڤەرانەی لەرووی پراكتیكەوە لەبن نفوزو دەسەلاتی خۆیاندابوو. ئەگینا كاتێك عەرەبەكانی میسۆپۆتامیا نارەزایییان دژی ماندات دەربری. بەریتانیەكان بەیاننامەیەكیان بلاوكردەوە و تیایدا رایانگەیاند، كەوا سیستەمی ماندات گەرەكیەتی دەولەتێكی عێراقی لەبن پاراستنی بەریتانیەكان دابمەزرێنێت و ئەركی پاراستنی ناوەوە و ئاسایشی دەرەوەی بخاتە ئەستۆی خۆی[ ١٥٦ :١٢٣ ]. پاراستنی هێمنی و ئارامی ناوەخۆش سەركوتكردن و كپ كردنەوەی ئەو بزاڤە كوردیانە بوو ، كە هەولی سەربەخۆ بوونی كوردیان دەداو دژی لكاندنیان بوون بەمیسۆپۆتامیا.

ئەو چاوچنۆكیەی ئینگلیزەكان لەلایەك و تەشەنەكردنی نفوزی سۆڤیەتیەكان لەلایەكی تر ،بەهیچ لەگوینێك لەبەرژەوەندی كورددا نەبوو. كەمالیستەكان و دەسەلاتدارانی ئێران هەولیاندەدا لە سۆڤیەتیەكان نزیك ببنەوە، كەمالیستەكان نامەیەكیان بۆ سۆڤیەت نارد، تیایدا دەیانگوت : "ئێمە لەگەل ئێوە لەسەر یەك رێگاین . خەباتی هەردوو لامان دژی ئیمپریالیزمە . گۆرەپانی خەباتی ئێمە كە دژی ئیمپریالیزمە ، لەهەمان كاتدا هێلی بەرگریكردنی ئێوەیە، بۆیە چاوەروانی ئەوەتان لێدەكەین پشتمان بگرن . چاوەروانی چەك و مالتان لێ دەكەین" [١٣٨ : ٥٣ ]. فارسەكانیش لەهەمان سالدا خەریكی دانوستان بوون لەگەل سۆڤیەت بۆ گرێدانی پەیوەندی دۆستایەتی لەنێوان هەردوولادا.سۆڤیەتیەكانیش وایاندەزانی رێكەوتن لەگەل هاوسێكانی باشوریان لەئێران وتوركیاو ئەفغانستان رادەیەك بۆ لاتەریكی دیپلۆماتیكی یان دادەنێ . هەروەها بەسەركەوتنێكیان دەزانی دژی ئیمپریالیزم لە ئاسیاو رۆژهەلاتی ناڤین ! [ ١٥٨: ٢٣٠ ] .

ئەو گۆرانانە تا دەهات زێتر كوردستانی دەخستە ژێر پێی و دۆزی كوردی فەرامۆش دەكرد . بەریتانیەكان لە هەمووان زێتر بایەخیان بەكوردستان دەدا . بەماوەیەكی كەم بەر لەگرێدانی پەیماننامەی سیڤەر .بەراشكاوی بەشالیاری هەندەرانی توركیان (حكومەتی ئەستانە) راگەیاند كە دۆزی كورد بە لای ئەوانەوە زۆر گرنگە . هەر لەو كاتەشدا بەرپەرچی پێشنیارێكی فەرەنگیان دایەوە دەربارەی پارڤەكردنی دەسەلات لەكوردستان [ ٧٠ : ١٧].

پەیمانی سیڤەر کەلەکاتژمێر ٤،١٠ خولەك لەرۆژی ١٠ ی ئابی ١٩٢٠ ئیمزاکرا [١٦٤ :١١٨]. سۆڤیەتیەکان بانگهێشت نەکران، ئەمەش تورك و سۆڤیەتی لەیەك نزیکترکردەوە. چونکە بەپێی ئەو پەیماننامەیە گەرووەکان لەنێوان تورك و یۆنانیەکان پارڤەکرا. هەروەها کەشتیەوانی جەنگی وبازرگانیان تیا ئازادکرا ، دەبوایە لەکاتی جەنگ و ئاشتیدا چەك لەگەرووەکان دامالرێ و ببێتە ناوچەیەکی بێلایەن[١١٥ : ٢٢]. لەراستیدا سۆڤیەتیەکان، وەکو تەزاری یەکانی پێش خۆیان، بەرژوەندی گرنگی خۆیان لەگەرووەکان دا دەدۆزیەوە. بۆ تورکەکانیش وەك دەسوقی دەڵێ :- ئەگەر ئەو پەیماننامەیە جێبەجێ کرابوایە واتای لەناوچوونی بوونی تورك بوو [ ٢٦٣ :٤١٧ ]. ئەو پەیماننامەیە پەیوەندیەکی زۆری بەکوردەوە هەبوو ، زۆریشی لەسەر نووسراوە. زۆر لەو نووسینانەی بۆ مێژووی ئەو پێواژۆکەی میللەتی کورد تەرخان کراون ، باسی بەندەکانی (٦٢، ٦٣، ٦٤) دەکەن لە چوارچێوەی مێژوویی خۆی زۆر گرنگەو سوودی بۆ کێشەی کورد هەبوو تاوەکو ئەمڕۆش کورد ئەم سآ بەندە بەسەرچاوەیەکی ڕەسەن دادەنآ کە دان پیانانێکی ئاشکرای دەوڵەتە زلهێزەکان و هاوپەیمانەکانە کان بوو بەکێشەی کورد، هەر وەکو ئاشکرایە هەر لەبەندی یەکەمدا پێویست بوو لیژنەیەکی نێو دەوڵەتی دابنرێت بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەی کورد بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ. هەروەها بەگوێرەی دوو بەندەکەی تر حکومەتی عوسمانی پابەند بوو کە پێشەکی دان بەو بڕیارانەدا بنێت کە لەسەر کێشەی کورد دەدرا بەبێ ئەوەی هیچ ئاستەنگێگ بێنێتە پێشەوە بەپێی بەندی ٦٤ ئەوەی زۆر گرنگە ئەوەیە کە پەیماننامەکە دەڵێت کوردەکانی ویلایەتی موسڵ (باشوری کوردستان) مافی ئەوەیان هەیە بەگوێرەی ئارەزووی خۆیان بەم دەوڵەتە کوردیە ببەسترێنەوە بەم جۆرە دەوڵەتێکی یەکگرتووی کورد پێك بێت.

بەگوێرەی بەندی (٢٧) سنووریان لەگەڵ سوریاو میسۆپۆتامیا جوێکرابووەوە. کەلەهەردوولاوە کوردستانی دەبڕی [ ٧٦ :٢٩ ]. هەرچی رۆژهەلاتی کوردستان بوو ، بەهێچ جورێك لەپەیمانی سیڤەر ناوی نەهاتبوو. سەیرئەوەیە کە هەر ئەورۆژەی پەیمانی (سیڤەر ) ی تیامۆرکرا، لەلایەکی ترەوە، بەریتانی و ئیتالی و فەرەنگەکان پەیمانێکی تری سێ قۆلیان مۆرکرد بۆ ئەوەی ناوچەی دەسەلات لە باکوری کوردستان لە نێو خۆیاندا پارڤە بکەن.[ ٧٠- ١٨ ] . لەمەش سەیرتر ئەوەبوو پەیماننامەی سیڤەر لەکاتێکدا راگەیەنرا کە سوپای سوڵتان ئابلووقەی کەمالیستەکانی دابوو لە ئەنقەرەو زۆری نەمابوو بەسەریاندا زاڵ بێ، تەنانەت هەندێك لە نووسەران پێیان وایە ئەم راگەیاندنە لەم کاتەدا ناسکەدا بەفریاچوونێکی کەمالیستەکان بوو چونکە بووە ئەگەری ئەوەی رای گشتی لە تورکیا دژی سوڵتان بورووژێنی

[٢١١ :١٥٣ ] . لەراستیدا ئینگلیزەکان پەیمانی سیڤەریان وەك پێوازۆکێك لە پێوازۆکەکانی ململانێ بەکارهێنا .چونکە خۆیان کەهێزێکی گەورەو سەرەکی بوون لەپەیماننامەکـە باوەڕیـان پێی نەبوو ! ئەمەش لەو چاوپێکەوتنە دەردەکەوێ کە سەید تەها لە (١٨-٢٣ )ی ئابی ١٩٢٠ لەگەڵ کاپتن هێی، فەرمانڕەوای سیاسی ئینگلیز لەهەولێر ئەنجامیدا . کاپتن هێی بەسەید تەهای گوت : "ئەرکی بەریتانیا نیە خۆی لەکاروباری کوردستان هـەڵقورتێنی ،بـەگوێرەی دەقـەکانی رێکەوتننامـەی ئاشتی بڕیـار دراوە لـەماوەی چـەند مـانگێکی کـەم . لـە ئـەوروپاوە لێژنەیـەك پێکبهێنرێت بۆ دیاریکردنی سنووری ئەم وولاتە". کاپتن هێی خۆی گومانی لەسەرکەوتنی ئـەو لێژنەیە، تەنانەت لەهاتنیشی هەبوو ![ ٢٧٦ :١١٣ ] . سەرباری هـەموو ئـەو خالانـەی باسمـان کرد .جگە لەئیتالیا هیچ لایەنێکی تر باوەڕی خۆی بەو پەیماننامەیە نەدا، ئەگەر چی (ئیتالیا)ش **لـەکۆنگرەی سـان ریمـۆ ،واتــە کــاتێك سـیڤەر پرۆژەبـوو ،رایگـەیاندبوو بـۆ پاراسـتنی رێکەوتننامەیەکی لەم بابەتە تاقە سەربازێك نانێرێ [ ٧٦ :٤٣ ] . بەم چەشنە وەك هەسـرەتیان دەڵێ** : "دۆزەکە ئەوە نەبوو ئارەزوویان هەبووبێ سەربەخۆیی بەکورد بدەن ،بەڵکو بەکارهێنانی هیوا نەتەوەییەکانی کوردبوو ،لەبەرژەوەندی و چاوتێبڕینە دوژمنکارانەکانی خۆیـان" [٢٤٨ : ٣١ ] . لەو سۆنگەیەش بوو دزموند ستیوارت نووسیویە: "فێڵ کردن لەسەر پلەو پایە (مرکز) وسەوداکاری نهێنی ،وایانکرد توندتریـن پەیماننامـە بێـت لـەمێژوودا ، بـەڵکو لەهـەموان هیـچ وپوچتر (سخیف)تر بێت [١٦٩ :٢١٧].

پەیماننامەی سیڤەر ئەگەر چی لەرووی مێژوویەوە یەکەم بەڵگەنامەی نێو دەوڵەتیـە کـە باسی چارەنووسی کوردی دەکرد ،وەڵی هەمان سـیڤەر ،کوردسـتانی بـەجۆرێکی تـر پارچـەکرد .ئەویش پارچەکردنێکی کولۆنیالانەی کوردبوو [٧٦ :٣٩] . ئـەو پەیماننامەیـە هێنـدەی پـەرای کەمالیستەکانی کرد ،نیو هێندەش پەرای دۆزی کوردی نەکرد ،چونکە رەتکردنـەوەی سـیڤەر لەلایەن کەمالیستەکان تــەنیا لایـەنگیری گـەلی تورکـی دەسـت نەخسـتن ، بـەڵکو لایـەنگیری سۆڤیەتیەکانیشیان دەسـتکەوت .کـە نارەزاییـان دژی ئـەو پەیماننامەیـە دەربـڕی و پەیوەندیـە دیپلۆماتیکیەکانیان لەگەڵ کەمالیستەکان دەسـت پێکـردەوە.[١٦٩: ٢٣٥] .ئەمـەش ئـەوەی دەگەیاند سۆڤیەتیەکان ،تەنانەت دژی قەوارە ئەندێشەییەکەی کوردیش بـوون ،کـەنیاز بـوو بـەپێی سـیڤەر لەسـەر خـاکی کوردسـتان دابمەزرێ! لـە تشرینی دووەمی ١٩٢٠ ، یـەکێك لـەتوێژەرەوە بـەناو دەنگـەکانی سۆڤیەت گوتـی : "شۆڕشـێکی سـۆڤیەت لەئەرمەنسـتان دا پیلانەکانی ئینگلیز پووچ دەکاتەوە، کەگەرەکیانە دەوڵەتێکی کوردی داردەستیخۆیان لـەدژی ئێمە دابمەزرێنن" [ ٣٣ :٣٥ ].

کەواتە لەو ماوەیەدا باری ململانێ یەکە لەسەر کوردستان بەم جۆرە بوو : سۆڤیەتیەکان لەدامەزراندنی ئەو دەوڵەتە ئەندێشەییە دەترسان . ئینگلیزەکان وایان دەردەخست کە بەهێزبوونی بزاڤی کەمالیستەکان زەندەقی بردوون ! ئەو کەمالیستانەی ئەگەر لەگەڵ هێزی ئینگلیزەکان بەراوورد کرابونایە ، ئەوا زۆر لەخوارەوەی هیچ بوون .وەلی بیانگەیەکی لەباربوو بۆیان بۆ دامەزراندن و پتەوکردنی ئەو حکومەتە عەرەبیەی کەلەمیسۆپۆتامیا دا کاریان بۆ دەکرد و دەیانویست باشوری کوردستانی پێوە بلکێنن .بۆیە وەك لە تێبینیەکانی ئەفسەرێکی سیاسی ئینگلیز هاتبوو : "مستەفا کەمال سیاسەتێکی وا پیادە دەکات کە ئەژواری بۆ بەریتانیەکان چێدەکات .دەست لەنێو دەست لەگەڵ عەرەبە توندڕەوەکان کاردەکات تا سەربەخۆیی میسۆپۆتامیا تێك بشکێنێ، ئەگەر بەختمان یارنەبێ و نەتوانین لەو ماوەیەدا حکومەتێکی عەرەبی دابمەزرێنین ". هاوکات لێپرسراوانی شالیارگەی هەندەرانی بەریتانی فەرماندەکانیان لەمیسۆپۆتامیا ئاگادارکردەوە ،کە هاوپەیمانێتی کەمالی – بەلشەفی ،دەبێتە ئەگەری ڕاماڵینی کوردستان و ئێران .کەتا ئەو دەمە بەربەست بوون لەنێوان میسۆپۆتامیا وروسەکان، بۆیە گەیشتنە ئەو بڕوایەی ئاشتی لەگەڵ تورکیا، بۆی هەیە بەربەستی تورکی بەرامبەر چاوتێبڕینەکانی روس دابمەزرێنێتەوە و گەفی کەمالیستەکان لە میسۆپۆتامیا دووربخاتەوە [ ٩٩ : ٥٠ ] . بەریتانیەکان لەپاڵ کەمالیستەکان هەوڵیاندەدا سوود لەسۆڤیەتیەکان وەربگرن بۆ وەدیهێنانی ئامەنجەکانیان . زۆر بەدڵیان بوو کاتێك سۆڤیەتیەکان یاداشتنامەیەکیان پێشکەش کردن، کەتیایدا دەیانگوت : "حکومەتی سۆڤیەت پشتگیری خەباتی میللەتی تورك دەکات ، پشتگیری هەوڵەکانی تورکیا دەکات بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی سیڤەر ،کە سەربەخۆیی و یەکێتی خاکەکەی دەخاتە مەترسیەوە . تورکیا لەو خەباتەیدا گشت گەلانی روسیای لەپشتە" [ ٣٣ : ٣٩ ] .تا زێتر جێی پێی خۆیان لە میسۆپۆتامیا قایم بکەن .شایەنی باسە لەو کاتەدا لەئەنجومەنی باڵای نەتەوایەتی تورك دەنگی وابەرز دەکرایەوە کەبۆنی کۆمۆنیستی لێدەهات ! ئەمەش بۆ ترساندنی ئینگلیزەکان و سەرنج ڕاکێشانی سۆڤیەتیەکان بوو لەروخساردا، چونکە لەوانەیە لەپشت پەردە وە ئینگلیزەکان هەر خۆیان دەستیان لەم گەمەیەدا هەبوبێ ! هەروەك چۆن لەعێراق حکومەت و بەرهەڵستکار بەپەنجەی ئەوان هەڵدەسوڕان ! لە ١٨ تشرینی دووەمی ١٩٢٠ یەکێك لە پەرلەمانتارەکان لە ئەنجومەنی باڵای نەتەوایەتی تورکی گوتی : بەڕێزان ... وولات واتای ئابووری ئەو وولاتە ... هیچ کەسێك نوێنەرایەتی وولات ناکات تەنیا ڕۆڵە ڕاستەقینەکانی نەبێت ، لەئاسنگەران کە چەکوشەکانیان لە دەست دایە ، جووتیاران کە لەپشت گاجووتەکانیانەوەن [١٦٢ : ٢٧]. هەر لەو مانگەشدا مستەفا کەمال نامەیەکی بۆ (شیشرین) شالیاری کاروباری هەندەرانی سۆڤیەت نارد، تیایدا دەیگوت: "بەتەنیا پلیشاندنەوەی ئیمپریالیستی تاوانبار

پێویست نیە ، بەڵکو پێویستە حوکمی بۆرژوازی بەگشتی پـان بکرێتـەوە" [٢٧٧ :٤٥ ]. لـە ١٨ کانونی یەکەمدا نامەیەکی تری بۆ لینین نـارد تیـایدا پێشـوازیەکی گـەرمی لەپتـەوکردنی پەیوەندی دۆستانەی نێوان هەردوولا کرد. سیاسەتی سۆڤیەتی لە رۆژهەلاتی ناڤین و سـەرتاپای جیهان بـەرز نرخـاند[١٣٨: ٥٤ ] .بۆیـە سـۆڤیەتیەکان بـاروبوێکی زۆری کەمالیستەکانیان کرد. هاوکات فەرەنگەکانیش بەهەمان جۆر لێ یان نزیـك دەبوونـەوە . ئـەو هـەموو یارمەتیـە بووە ئەگەری بەهێزبوونی کەمالیستەکان . لە کانونی دووەمی ١٩٢١ توانیان لەشەری ئینۆنۆ* سەرکەوتن وەدەست بێنن. ئەنجامی ئەم سەرکەوتنەش لە٢٢ هەمان مانگدا کۆنگرەیەك لەپاریس گرێدرا. تیایدا نوێنەری ئیتاڵیەکان (سفۆرزا) ، داوای دەستکاریکردنی پەیمانی سـیڤەری کـرد ،وەکو ئەوەی تورکەکان داوایـان دەکـرد . لـەو کۆنگرەیـە گەیشـتنە ئـەو بریـارەی پێویسـتە هاوپـەیمانان کۆنگرەیـەکی تـر لەلـەندەن گرێبـدەن [ ٨٥: ٨٨]. ئـەم سـەرکەوتنانەی کەمالیستەکان ،کە کورد رۆڵێکـی گـەورەیان تیـادابینی ،لـەرووی سیاسـی و سـەربازیەوە تـا ئاستێکی بەرز بەهێزی کردن . بۆیە کەوتنە مشور خواردن بۆ لێدانی راپـەڕیوەکانی کـورد لـە قۆچگیری ! ئەو گۆڕانە بەلەزانەی دوای سیڤەر روویاندەدا، وای لەکەمالیستەکان کرد بـەباوەڕ بەخۆبوونێکەوە دەیانگوت سیڤەر ئەو کاغەزەش ناهێنێ کەلەسەری ئیمزاکراوە .بەکورتی وەك لازاریـف نووسـیویەتی : شـەش مـانگ بەسـەر پەیماننامـەی سـیڤەردا تێپـەرێ کەکێشـەکەی چاوپێخشاندنەوەی خرایە ڕوو، بەرایێ بەشێوەیەکی نهێنی بوو ، پاشـان ئیتـاڵی و فەرەنگـەکان بەئاشکرا ئەوەیان نیشاندا. دواتریش ئینگلیزەکان چوونە ریزیانەوە . لە ٢٥ کـانونی دووەمـی ١٩٢١ ، ئەنجومەنی باڵای دەوڵەتە هاوپەیمانـەکان بریارێکیـان لـەم بارەیـەوە دەرکـرد، تیـایدا بانگهێشتەی شاندی ئەنقەرەیان کرد بۆ بەشداریکردن لـەکۆنگرەی داهـاتوو لەلـەندەن [ ٢٥٥ :٢٦٦ ] .عیسمەت ئینۆنۆ دەڵێ : "دوای ئەوەی لە ئینۆنۆ سەرکەوتین ،کۆنگرەیـەك لەلـەندەن گرێدرا ،هەریەکە لەئێمەو حکومەتی ئەستانە بەتـەنیا بانگهێشـت کـرا، وەڵێ ئێمـە خۆمـان پـێ خاوەن دەسـەلات بـوو " [٣٣٣ :١٨ ] .ئـەم بانگهێشـتەی کەمالیسـتەکان دان پێنـانێك بـوو پێیـان .دانان بەکەمالیستەکانیش پشتگوێ خستنی دۆزی کوردبوو !

کۆنگرەی لەندەن لە٢١ شوبات دەستی پێکرد و تا ١٤ مارتی خایاند .لەدانیشتنی ٢٥ شـوبات، کەلەکۆشـکی (سـانت جیمـس ) لەلـەندەن گرێـدرا، باسـی پەیماننامـەی سـیڤەرو ئەرمەنستان وکوردسـتان کـرا. باسـی ئـەو گۆڕانانـە کـرا کـە لـەدوای سـیڤەر هاتبوونـە ئـاراو کاریگەریـان لەسەر هەندێك لە بەندەکانی سیڤەر هـەبوو. بەتایبـەتی ئـەو بەندانـەی پـەیوەندیان

* ئینۆنۆ ناوچەیەکە لە باکوری کوردستان [٢٦٩].

بەکوردستان و ئەرمەنستانەوە هەبوو ،وەڵی وەك لۆید جۆرج گوتی: "پێویستە تورکەکان لە پێشەوە بەندەکانی تر قبوولْ بکەن" ئەمەش ئەوەی دەگەیاند کە ئامادەن دەست بەرداری ئەوبەندانەبن کە تایبەت بوو بە کورد ! تورکەکانیش گوتیان : "ئەوان کەبەزمانی نوێنەری ئەنجومەنی باڵای نەتەوایەتی تورکیا داخێون کوردوتورکی تیایە ! " هەروەها لە ٢٦ ی شوباتیش کرزن هەمان شتی دووبارە کردەوە ،هەرچی بەکر سامی بوو سەرۆکی شاندی ئەنقەرە گوتی : "کوردەکان هەمیشە رایانگەیاندووە ئەوان بەشێکی جوێ نەکراوەن لەتورکیا" هەروەها گوتی : "کورد هیچ ئارەزووێکی تایبەتیان نیە، ئەوان ئارەزوویانە وەکو برا لەگەڵ تورکەکان بەیەکەوە بژین" [ ٢٩٢ : ١٠٦ ].

لەوکۆنگرەیەدا تورکەکان پێیان لەسەرداواکانی خۆیان داگرت .وەك مستەفا کەمال لەیاداشتەکانیدا نووسیویەتی : "بەگوێرەی سیڤەر دەبوایە ئێمە بەرهەڵستی لەسەر هیچ نەنوێنین ،وەڵی لەم کۆنگرەیەدا شاندی ئێمە وەرامی بەرهەڵستکارانەیان لەسەر هەموو ئەمانە دایەوە" تەنانەت تورکەکان زۆر داواکاریشیان پێشکەش کرد ،ئەوەی پەیوەندی بەکوردەوە هەبوو ،داوای ئەوەیان کرد کە ئابڵووقە کەم بکرێتەوە لەسەر نیشتەجێکردن و فراوان کردنی نیشتەنی کردن [ ٣٣٤ : ٣٩٢-٣٩٣ ]. ئەو پێداگرتنەی تورکەکان ناکۆکی خستە نێو هاوپەیمانەکان، بۆیە خۆیان لەناوبژیوانی نێوان تورك و یۆنانیەکان کێشایەوە. ئەمەش بۆ یۆنانیەکان شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو. وایان لێکدایەوە ئەو یارمەتیانەیان دەوەستێنرێ کەپێیان دەدرا [ ٩١ : ٢١ ]. ئەمە (فینزیلوس)ی سەرۆکی یۆنانیەکانی زۆر تووڕە کرد ! چووەلای کرزن و پێی گوت : "ئێمە لەدەوڵەتە هاوپەیمانەکان بووین جەنگمان دۆڕاند، ئایا ئەندامێك لە هاوپەیمانان بەتەنیا جەنگ دەدۆڕێنێ ؟! هاوپەیمانان یان هەموو بەیەکەوە سەردەکەون، یا بەیەکەوە دەدۆڕێنن". لەکۆتاییدا گەفی لەکرزن کردو گوتی : "بۆ هەموو دنیا دەگێڕمەوە کە ڕێکەوتن لەگەڵ ئینگلیزەکان ئەمە ئەنجامەکەیەتی!!!"[ ٣٣٣ : ٢٤ ].

کۆنگرەی لەندەن هیچ ئەنجامێکی نەبوو ، چونکە بەکر سامی دەیگوت نابێ شاندی ئەستانە بەشداری کۆنگرەکە بکەن . لەلایەکی تر پێی لەسەر ئەوە داگرت کە گفتوگۆکانی کۆنگرە نابێ لەسەر بنەماکانی پەیمانی سیڤەر بێت [ ٣٤٧ : ٣٥٨-٣٥٩ ]. هەرچۆنێکی بێت ئەو کۆنگرەیە هەلێکی لەباری بۆ کەمالیستەکان رەخساند کەپەیوەندی بەزۆر دەوڵەتانەوە بکەن ،لەوانەش بەریتانیا و ئیتاڵیا وفەڕەنگسا ،کە سێ دەوڵەتی سەرەکی بوون لەبازنەی

هاوپەیمانەکاندا ،لەگەڵ بەریتانیەکان لەسەر ئەوە ڕێکەوتن حکومەتی ئەنقەرە دیلەکانیان ئازادبکات .ئەوانیش دیلەکانی تورك ئازاد بکەن، تەنیا ئەوانە نەبێ کەبەخراوی مامەڵەیان لەگەڵ دیلە ئەرمەن و ئینگلیزەکان کردبوو . هەرچەندە حکومەتی ئەنقەرە باوەڕی خۆی بەم ڕێکەوتننامەیە نەدا،وەلێ ژمارەیەك لەدیلەکانی هەردوولا ئاڵوگۆڕکران .لەوڕێکەوتننامەیەی لەنێوان فەڕەنگ و تورکەکانیش گرێدرا، بڕیاریاندا لەبەرەکانی باشور کاریدوژمنکارانە بوەستێنن .حکومەتی ئەنقەرە هێزەکانی لەو دەڤەرەدا چەك بکات و چارەسەری کێشەکانی سنووربکەن .فەڕەنگەکانیش هێزەکانیان لە عینتاب و روها (ئورفە) بەرنەدەرەوە، بڕیاری ئەوەشیان دا لەو پرۆژە ئابووریانەی لەو دەڤەرانەدا ئەنجام دەدرێن ،فەڕەنگەکان ڕێزی پێشەوەیان هەبێت .ئەمە جگە لە ویلایەتەکانی خارپوت و ئامەد ( دیاربەکر) وسیواس و دەرهێنانی کانزا لە ئەرغەنی [ ٨٥ : ٩٣ ].

ئینگلیزەکان لەگۆشەنیگایەکی گەورەترەوە سەیری ڕۆژهەلاتی ناڤینیان دەکرد . ئەگەرچی ئەو ڕووداوانە زۆربەی دەستی خۆیانی تێدابوو ،وایان نیشان دەدا کە لەبەرژەوەندی ئەواندانیە ! دەیانویست لەئێرانیش دیوارێکی پتەو بەرامبەر سۆڤیەتیەکان چێبکەن .قاجاریەکانیش هێندە لاوازو بێخێر بوون نەدەشیان ئەم ئەرکە ئەنجام بدەن .ئەمە وایکرد چاوێك بەسوودی مانەوەی سیستەمی قاجاریدا بخشێننەوە [٩٥: ١٧٠ ]. دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت کە ڕێکەوتننامەی ٩ ئابی ١٩١٩ بەئەنجام ناگات، لەوەترسان ئەو وولاتەیان لەبن دەست دەربچێت . بۆیە هەوڵیاندا سوپای کازاکەکان کەلەبن فەرماندەیی ئەفسەری روس بوون و بەشێك لەبۆجەکەیان لەلایەن ئینگلیزەکانەوە دابین دەکرا، بخەنە بن کۆنترۆڵی خۆیانەوە . شالیاری موختاری ئینگلیز لە ئێران لەم بارەیەوە یاداشتنامەیەکی دابەکرزن کەتیایدا هاتبوو : کۆنترۆڵکردنی سوپای کازاك لە لایەن ئەفسەرانی ئینگلیزو دەرکردنی (ئیستساروسلسکی) * و ئەفسەرانی روس ... لەئیجرائاتە یەك لەدوای یەکەکانی ڕێکەوتننامەکە خاترجەممان دەکا .[ ٣٣٠ :١٤٣ ] .چونکە دامەزراندنی هێزێکی یەکگرتوو ئامانجێکی بنەڕەتی ڕێکەوتننامەکەی ١٩١٩ بوو .بۆ ئەم مەبەستەش هەر لە مارتی (١٩٢٠) ەوە کۆمسیۆنێکی هاوبەش لەئێرانی و ئینگلیزەکان بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە دامەزرابوو . کۆمسیۆنەکە بەیەك دەنگ ئەوەی دەربڕیبوو کەپێویستە سوپای کازاکەکان و پۆلیسی باشور لەسوپایەکی یەکگرتوو کۆبکرێتەوە [٣٢١: ٦٢-٦٣]. ئەم هەنگاوانەشیان بۆ ئەوەبوو

---

* ئەفسەرێکی روس و فەرماندەی سوپای کازاك بوو.

بەرژەوەندیەکانی خۆیان لە مەترسی سۆڤیەتیەکان دووربخەنەوە ! بەم جۆرە بەریتانیەکان بەر لەجەنگ بەبیانگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانیان لە هیندستان و رۆژهەلاتی ناڤین هێزێکی زۆریان هێنابووە ئەم دەڤەرە. دواتر بۆ هێشتنەوەی ئەو هێزانە بیانگەی ئەوەیان دەهێنایەوە کە گەرەکیانە رێگا لە مەترسیەکانی سۆڤیەت بگرن[ ٣١٦ :١٢ ] . ئەوەبوو لە ٢١ شوباتی ١٩٢١ رەزاخان ،ئەفسەری سوپای کازاك ،کودەتاکەی ئەنجامدا، کەهەر بەناوی ئەو مانگە ناونراوە (حوت) کە کودەتاکەی تیا کرا. بەر لە کودەتاکە بە هەفتەیەك لێپرسراوێکی بەریتانی چاوی بەرەزاخان کەوت ، بۆ ئەوەی جڵەوی دەسەلات لەتاران بگرێتە دەست ، چەند مەرجێکی بۆ دانا ، لەوانە هیچ هەڵمەتێك ئەنجام نەدا بۆ دەرکردنی ئینگلیزەکان ، بەڵێنی ئەوەش بدا رێگای توندوتیژی نەگرێتە بەر . لێپرسراوەکە نووسیویەتی : "رەزاخان گوتویەتی بەگوێرەی ئارەزووی ئێوە کاردەکەم !" [ ٣٢١: ٦٩]. رەزاخان وەك مستەفا کەمال لەسەر دووپەت یاری دەکرد لەسۆنگەی مەترسی سۆڤیەتەوە دەیویست لە ئینگلیزەکان نزیك بێتەوە . لەیاداشتەکانی خۆیدا ئەوە دەگێرێتەوە کە چۆن کاتێك ئابلووقەی تارانی دابوو ئینگلیزەکان چونە لای، یەکسەر وای نیشاندا هۆکاری ناوەخۆی ئێران وای لێکردووە ئەو کارە ئەنجامبدا [٢٠٢: ٢٥] .بەمەش گوایە هەوڵیداوە ئەو گومانە لای ئینگلیزەکان بڕەوێنێتەوە کەسۆڤیەتیەکان دەستیان لەم کودەتایە هەبێت. ئەم سیناریۆیەش یەك سیناریۆ بوو مستەفاکەمال و رەزاخان ڕۆڵیان تیادەبینی ! تەنیا پێنج رۆژ دوای ئەو کودەتایە رێکەوتننامەیەکی لەگەڵ سۆڤیەت مۆرکرد ! بەپێی بەندی شەشەمی ئەو رێکەوتننامەیە سۆڤیەتیەکان مافی ئەوەیان هەبوو سوپابنێرنە ئێران ،ئەگەر ئێران بکرابوایە بنکەیەك بۆ دەستدرێژی کردنە سەر سۆڤیەت [١٥٨: ٢٣١] .ئەوەی لەورێکەوتننامەیە زێتر پەیوەندی بەکوردەوە هەبوو بەندی چوارەم بوو .بەگوێرەی ئەوبەندە هەردوولایان رێگای پێکهێنانی هیچ گروپێك، یاخود جێگای هیچ تاقم و کەسێکیان نەدەکردەوە لەووڵاتی خۆیان جابەهەر ناوێکەوە بوایە ،چ دژی ئێران بوایە یاروس و هاوپەیمانەکانی. هەروەها دەبوایە کەسانی سەربازی وەرنەگرن و رێگانەدەن کەل وپەلی نەفەرات بۆ رێزەکانی سوپا بگوێزرێتەوە . هاوکات رێگا بەهیچ رێکخستنێك نەدەن، بەهەرچی ناوێکەوە بێت ، ئەگەر بیەوێ دژی پەیمانکاری بەرز خەبات بکا[ ٢٦: ٢١٩] .سۆڤیەتیەکانیش بۆئەوەی هاریکاری رەزاخان بکەن ،کۆمۆنیستەکانی ئێرانیان ئاگادارکردەوە لایەنگیری رەزاخان بکەن وپڕوپاگەندەی وابکەن کەئەوەی بەرهەڵستی بکات بەکرێگیراوی ئیمپریالیزمە ![ ٢٣٢: ٤١] . لەو پێواژۆکەدا سۆڤیەتیەکان پێیان وابوو پێویستە هەموو توانایەکیان بخەنەگەڕ بۆ ئەوەی نیازی دوژمنەکانیان بەربەست بکەن . بەڕای خۆیان ئەمە پاڵپشتی کردن بوو لەو بزاڤانەی دژی

بەریتانیا بوون لەئێران و تورکیاو ئەفغانستان .کەئەو بزاڤانە بەتەنیا گەفیان لەرێگای هیندستانی بەریتانی نەدەکرد ، بەڵکو هیوای ئەوەی لەکن دەگوراندن ئینگلیزەکان رازی دەبن کە چیتر خۆیان لە کاروباری ئەوان هەڵنەقورتێنن و دەست بەرداری ئەو سیاسەتەیان دەبن [ ٣٣٨: ٢٤].

ساڵی ١٩٢١ ساڵێکی چارەنووس ئامێزە لەمێژووی کورد ،چونکە بەهێزبوونی کەمالیستەکان وسەرهەڵدانی دەسەڵاتی رەزاخان ،واتای کورژبوونەوەو داشکانی بزاڤی کوردو دۆزی نەتەوایەتی کوردبوو. هاوکات واتای پیادەکرن و جێگیرکردنی پارڤەکردنی نوێی کوردستان بوو، کەلەدوای جەنگەوە ،وەك ئاماژەی پێکرا دەستی پێکردبوو . بۆ وێنە لە ٧ مارتی ١٩٢١ ئەنجومەنی شالیارانی حکومەتی کاتی عێراقی، برِیلرێکی دەرکرد بۆ لکاندنی ناوچەی سلێمانی بەعێراق. لە خاڵی یەکەمی ئەو برِیارەدا هاتبوو : "لەبەربا یەخی شوێنی جوگرافی لیوای سلیمانی وئەو پەیوەندیە سیاسیو ئابووریانەی بەمیسۆپۆتامیای دەبەستێتەوە،هەروەها لەبەر خوونەریتی هاوبەش لەنێوان هەردوو ناوچەدا ، ئەنجومەنی شالیاران پێشنیاری پایەدار کۆمیساری باڵادەکات،کۆن لەسەر کۆنیەتی خۆی بهێڵێتەوە و بەرێوەبەرایەتی ئەو لیوایەش لەگەڵ میسۆپۆتامیا یەکبخات" [٢٠٣: ١٠٦] .وەك ئاشکرایە دەرچوونی ئەو برِیارەش پەیوەندیەکی پتەوی بەکۆنگرەی قاهیرەوە هەبوو ، کە تەنیا پێنج رۆژ دوای ئەوە ئینگلیزەکان بۆ چارەسەرکردنی ئەژواریەکانیان لەرۆژهەلاتی ناڤین لەقاهیرەی پایتەختی میسر گرێیاندا.

لەمانگی مارتدا چارەنووسی کوردو دۆزی نەتەوایەتی کورد لەنێو دووکۆنگرەدا تاوتوێ دەکرا . لەلایەك کۆنگرەی لەندەن لەلایەکی تر لەکۆنگرەی قاهیرە .شایەنی ئاماژە پێکردنە لەودەمەی تورکەکان لەکۆنگرەی لەندەن بەشداریان دەکرد ،سۆڤیەتیەکان دانوستانیان لەگەڵ کردن و لەهەمان مانگدا رێکەوتننامەی دۆستی و برایەتیان لەگەڵ مۆرکردن، کە بەرای لینین ئەو رێکەوتننامەیە ئامرازێکی گرنگ بوو بۆ دوورخستنەوەی تارمایی جەنگ ، جەنگی هەتاهەتایی لەناوچەی قەوقاز . دوای ئەوە هاریکاری لەنێوان هەردوولا بووە یەکێك لە هۆکارە یەکلایی کەرەوەکان لەسەرکەوتنی کەمالیستەکان . سۆڤیەتیەکان لەساڵانی ١٩٢٠-١٩٢١ یارمەتیەکی زۆری تورکەکانیان دا کە زێتر لە ٤٩ هەزار تفەنگ و ٦٣ ملوێن فیشەك و ٥٤ تۆپ بوو لەگەڵ تەقەمەنی پێویست .هەروەها بیست هەزار دەمامکیان دانێ بۆ بەرگریکردن لەگازی ژەهراوی لەگەڵ چەندین جۆری تر لەچەك و بەنزین و پەترۆل [٢٣٧:

٢٤٣] . كه بەشێكی زۆری ئەو چەكانەیان بـۆ لێدانـی بزاڤـی نەتەوایـەتی كـورد بـەكارهێنا !
هەرچی لەكۆنگرەی قاهیرە بوو لەچەند خاڵێكیان كۆڵیەوە كە پەیوەندی بەكورد هەبوو وەك لە باسەكانی تر بەووردی باسی دەكەین . وەڵێ لەهەمووی سەیرتر ئـەوەبوو بەشـداربوانی كۆنگـرە دەیانویـست ئارەزووی كوردەكان بزانن ، كە ئایا گەرەكیانە لـە عـێراق جـوێ ببنـەوە یـاخود پێیەوە بلكێن ! [١٤٦: ٥٠] . لەكاتێكدا كورد هەر لە دوای جەنگەوە دەنگی بەرزدەكردەوە وهاواری سەربەخۆبوونی دەكرد !

هاوكـات ئینگلیزەكـان هـەوڵیاندەدا لەتوركـەكان نزیـك ببنـەوە .دوای سـەركەوتنی ئینۆنۆی دووەم پەیوەندیان پێیانەوە كرد [٢٦١: ٤٦-٤٧]. ئەنجامی ئەم هەولانە لە ١٠ ئـابی ١٩٢١ ئەنجومەنی بالای جەنگی هاوپەیمانان رایگەیاند :كە شـەڕی یۆنـان و توركیـا شـەڕێكی تایبەت بەخۆیانەو بەریتانیا و فەڕەنگسا و ژاپۆن وئیتاڵیا بێلایەنی خۆیان رادەگەیـەنن [٢٢٣: ٢٦] .هەردوای ئەوە لەدیماهی ئەیلول چەرچڵ گوتی: "ئێستا مسـتەفا كـەمال دەشـێ گـەف لـە میسۆپۆتامیا و باشوری كوردستان بكـات". هـەروەها فـەرماندەی گشـتی هێزەكـانی بـەریتانی لەبەغدا ئاماژەی بۆ ئەوە كرد كەلەوانەیـە مسـتەفا كـەمال لەهـەركاتێكدا بـەبزاڤێكی سـەربازی هەڵسێت بەرەو موسـڵ [٣٣٦: ١١١-١١٢] . هاوكـات یـەكێك لـە لێپرسـراوانی ئینگلیز لەبیرۆی قاهـیرە، كەسـەر بەشـالیارگەی هـەندەرانی بـەریتانی بـوو لـە ٢٦ ئـەیلولدا نووسـی : "دەست پێوەگرتنمان بە میسـۆپۆتامیا، لەهـەموو كـاتێك زێـتر دەوەسـتێتە سەرتوركیا. هـێزە ناوخۆیەكانمان ئەركی هاریكاریكردنی مەدەنیان لەئەسـتۆدایە، نـەك بـەرگریكردن لـە هێرشـی دەرەوە .بۆیـە پێویـستە ببینە دۆستی توركـەكان [٩٩: ٥٢] . هـەرچی دەربـارەی كۆمیسـاری بالای بەریتانی بوو لـەعێراق، لـە ٢٨ تشـرینی یـەكـەمدا نامەیـەكی بـۆ شـالیاری دەوڵـەت بـۆ كاروباری كۆلۆنیاكان نارد، تیایدا پێشنیاری كرد رێگا بە فەیسەڵ بدرێـت دانوسـتان لەگـەڵ كەمالیسـتەكان بكـات . چـەرچل ، شـالیاری كاروبـاری كۆلۆنیاكـان لـە ١١ تشـرینی دووەم وەرامی ئەم نامەیەی دایـەوە وگوتی : "ناتوانین ئێستا رێگـا بدەینـە فەیسـەڵ دانوسـتان لەگـەڵ كەمالیسـتەكان بكـات . چونكـە دانوسـتان لەئاسـتێكی بـەرزتر لەئارادایـە بـۆ ئاشـتی لەگـــەل توركەكان . لەكاتی ئێستادا پێویستە هەموو هەوڵێكتان بۆ ئەوە بخەنە كار لەسەر سنوور بمێننەوە وئارامی بچەسپێنن" [٢٠٣: ١٩٩ ] .لەو سۆنگەیەش بوو لـەوەرامی نامەیـەكی (سمكـۆ)دا كـە داوای هاریكاری ویارمـەتی لێكردبـوون . سـكرتێری كۆمیسـاری بـالا لـە بـەغدا ،لـەوەرامی نامەیەكیدا ، كەداوای كردووە وەرامی سمكۆ بدرێتەوە نووسیویەتی : "سیاسەتی ئەمڕۆی ئێمـە

بەرامبەر بەسمکۆوبەرامبەر بەکوردستانی ئێران بریتی‌یە لەوەی هیچ جۆرە دەست تێوەردانێك لە لایەن ئێمەوە نەکرێت، بەتایبەتی بەرامبەر ئەو رووداوانەی پەیوەندیان بەئاسایشی سنوورەوە هەیە ... لەبەر ئەمە زۆر گرنگ و پێویستە هیچ شتێکی وانەکرێت لەگەڵ ئەو سیاسەتەی ئێمەدا یەك نەکەوێ"[ ٤٣: ٣٣٤-٣٣٥]. لەهەمان کاتدا دانوستان لەنێوان فەرەنگەکان و کەمالیستەکانیش لەئارادابوو. بۆیە ئینگلیزەکان لەوە دەترسان فەرەنگەکان ئەو بارە ئاڵۆزە وەکو کارتێکی جەخت دژی ئەوان بەکاربێنن . بەپلەی یەکەمیش بۆ ئەم مەبەستەیان سوود لەکەمالیستەکان وەربگرن، چونکە لەوکاتەدا رێکەوتننامەی (فرانکلین-بۆیۆن) لە ٢٠ تشرینی یەکەمی (١٩٢١)یان لەگەڵ مۆرکردبوون. بەگوێرەی بەندی یەکەمی ئەو رێکەوتننامەیە شەڕلەنێوان هەردوولا دیماهی‌هات .بەگوێرەی بەندی سێیەمیش دەبوایە هەموو چەك و تەقەمەنی و ئازووقەی سوپای فەرەنگ ،لەو زەویانەی کەدانیان پیادەنرا بکەونە بن دەسەلاتی تورك، بۆ تورکەکانی جێ بهێڵن [ ٩٨: ٤٦] هەروەها بەگوێرەی ئەم رێکەوتننامەیە فەرەنگەکان بەڵێنیان بەتورکەکاندا ئاسانکاریان پێشکەش بکەن تا سەربازەکانیان لەرێگای سوریاوە بگوازنەوە بۆ کوردستان . ئینگلیزەکان واتێدەگەیشتن مەبەستیان لەکوردستان باشوری کوردستانە، چەرچل گوتی: "فەرەنگەکان لەسەر حسێوی بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا دەیانەوێ بەرژەوەندیەکانی خۆیان دابین بکەن". پێی وابوو بارەکە زۆر ترسناکەو پێویستە فشار بخرێتە سەر فەرەنگەکان .(کرزن ) یش هەمان بۆ چوونی هەبوو، بۆیە داوای گۆڕینی ئەو بەندەیان کرد کەپەیوەندی بەگێڕانەوەی دەڤەرەکانی نیزیپ (نصیبین) وجزیرەی بۆتانەوە هەبوو، کەبایەخێکی ستراتیژی گەورەیان بۆ تورکیا هەبوو .وەڵێ فەرەنگەکان ئینگلیزەکانیان هێورکردەوە، پێ یان راگەیاندن کەئەو بەند بەهیچ جۆرێك پەیوەندی بەباشوری کوردستانەوە نیە وهەرگیز هەڕەشە لەبەرژەوەندیەکانی ئینگلیز ناکات [٢٥٥: ٢٧٤-٢٧٥].

نیشاندانی ئەو هەموو مەترسیە لەلایەن ئینگلیزەکانەوە تەنیا بیانگەیەك بوو بۆ پتەو کردن و بەهێزکردنی حکومەتی عەرەبی لە عێراق .ئەگینا وەك لەیەکێك لەبەڵگەنامە بەریتانیەکاندا هاتبوو هەڵویستی کەمال بەرامبەر گۆڕینەوەی دیلەکان زۆر پۆزەتیڤانە بوو.هەروەها گومانیان لەوە دەکرد مستەفا کەمال پەلاماری باشوری کوردستان بدات [٢٠٣: ١٩٨]. لەپاڵ ئەمەدا حکومەتی عێراقیش لەوە نەدەترسا کەمالیستەکان پەلاماریان بدەن ، بەڵکو لەوە دەترسان ئەو رێکەوتننامەیە دەستیان بگرێ لەوەی بەهەر کارێکی پێویست هەڵسن بۆ دابینکردنی ئارامی و ئاسایش لەو دەڤەرەدا .بارەگای گشتی سوپای عێراق لە ٢٨ کانونی

یەکەمی ١٩٢١ راپۆرتێکیان بۆ جافەر عەسکەری ،شالیاری بەرگری نووسی ،دەربارەی رێکەوتننامەی تورکی-فەرەنسگی کەتیایدا هاتبوو: "ئەم رێکەوتننامەیە بارێکی تایبەتی لەسەر سنووری باکورو باکوری رۆژئاوای عێراق گوراندوە ،بەگوێرەی هەندێك راپۆرت ئاشتی لەسەر سنوورەکانی رۆژئاوا دەچەسپێ .لەلایەکی تر دەبینین لەرووی سیاسی و سەربازیەوە دەستی حکومەتی عێراق دەبەستێتەوە، بۆ ئەوەی هەرکارێك، ئەنجام بدا تا ئاسایش لەبەشی باکوری وولات بچەسپێنێ" [ ٨٣: ٤٩٨ -٤٩٩ ]. وەك دەردەکەوێ ، ئەم رێکەوتننامەیە کاریگەریەکی یەکجار زۆری لەسەر کوردستان هەبوو. بووە سۆنگەی دابڕینێکی جوگرافی دەڤەرەکانی جزیرەو جەرابلوس لەچیاکانی باکوری کوردستان و شارە سەرەکیەکانی وەکو جزیرەو مێردین و نیزیپ و روها .هەروەها گەلێك عەشیرەتی کوردی ناچار کرد ژیانی خۆیان بگۆڕن و هات وچۆی زۆزان و ئارانیان راگرن .بەم جۆرە کوردانی کورد داغی (KURT DAGI جبل الاکراد) کەدەکەوێتە لای رۆژئاواوە هەموویان بەسوریاوە لکاند بەبیانگەی ئەوەی یەکێتی جڤاکی و ئابووری پێکدەهێنێت [ ٧٨: ٧٦] .وەلێ لەهەموو بەندەکان ترسناکتر بەندی (١٣)بوو . بەپێی ئەو بەندە فەرەنگەکان دانیان بە پەیمانی میللی (میثاقی میللی) تورکەکان نا .بۆیە مستەفا کەمال پێی وابوو ئەم رێکەوتننامەیە هیوای نەتەوەی تورکی بۆیەکەم جار ژیاندەوە .بۆ یەکەم جاربوو پەیمانەکە لەلایەن دەوڵەتێکی رۆژئاواوە دانی پیابنرێ [ ٣٣٦: ١١٣] . ئەو گۆڕانانە بوونە ئەگەری سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکانی کەمالیستەکان. دواسەرکەوتنیشیان لەشەڕی سەقاریا بوو کەوای لەهاوپەیمانان کرد کۆنگرەیەکی نێو دەوڵەتی ببەستن بۆ دەستکاریکردنی پەیمانی سیڤەر. لە٢٢ مارتی ١٩٢٢ کۆنگرەی رۆژهەلاتی نزیك لەپاریس بەسترا، شالیاری هەندەرانی هەموو دەوڵەتە هاوپەیمانەکان تیایدا ئامادە بوون [٨٥:١٠٨ ]. لەوکۆنگرەیەدا باسی دۆزی کورد نەکرا . کەمالیستەکان توانیان ئەوە رەتکەنەوە کەوا دۆزی کورد بخرێتە بەرنامەی کۆنگرەی لۆزانەوە [٢٤٨: ٥١]. بەم جۆرە لە١١ تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ ئاگربەستی مۆدانیا مۆرکرا ،تیایدا مستەفا کەمال پێی لەسەر ئەوە داگرت کەوا پەیمانی میللی ( میثاقیمیللی) کەمترین رادەیە لەداواکاری تورکەکان . هەروەها داوای گەڕانەوەی خاکەکانی تریشی کرد [٢٢٣: ٢٧] . دوای ئەوە لە٢٠ تشرینی دووەم کۆنگرەی لۆزان دەستی پێکرد . شا فەیسەڵ جافەر عەسکەری هەڵبژارد تا نوێنەرایەتی حکومەتی عێراق بکات لەم کۆنگرەیەدا . تورکەکان نارەزاییان بەرامبەر ئەو پێنگاوە دەربڕی . لۆرد کرزن رایگەیاند کەوا عەسکەری بۆ ئاسانکردنی کارەکانی شاندی بەریتانی وەك راوێژکار بەشداری کۆنگرەکە دەکات لەکاتی لێکۆڵینەوە لە ئەژواریەکانی سنووری نێوان عێراق و تورکیا . جافەر ئەوەی دوپات کردەوە کەوازهێنان لەهەر پارچەیەکی باشوری کوردستان رێگا بۆ دەست تێوەردانی تورکەکان خۆشدەکات ، ئەمەش بواری ئاژاوە

فراوان دەکـات و حکومـەت دەخاتـە هەڵویـستێکی نارەحەتـەوە . چونکـە وازهێنـان لەموسـڵ پێویست بەوازهینان لەبەغدا دەکات ، وازهێنان لە بـەغداش پێویسـت بـەوازهێنان لـە بەسـرە دەکات ، ئەمەش زیان بەبەرژەوەندی بەریتانیەکان دەگەیەنێت لەکەنداوی فارس [ ٩٠: ٧٣] .
تەنانەت بەرلەکۆنگرەی (لۆزان)یش ئینگلیزەکان رایانگەیاند ئامادەنین هیچ پێنگاوێك بـەرەو ئاشتبوونەوە بنێن ، ئەگەر تورکەکان واز لەو کارە دوژمنکارانە نەهێنن کەلەباشوری کوردستان ئـەنجامی دەدەن [ ٢٥٥: ٢٨٠] . هـەرچی شـاندی تورکـەکان بـوو، بـۆ بەشـداریکردن لەکۆنگرەی لۆزان رێنماییەکیان پێدرا کەلە ١٢ بـەند پێکـهاتبوو ، پێنـج بـەندیان پـەیوەندی بەخاکەوە هەبوو . ئەوەی تیا دوپـات دەکرایـەوە کـە نـابێ هیـچ نیشتمانێك بـۆ ئەرمەنـەکان پێکبهێنرێت . هەروەها داوای گەڕاندنەوەی سلێمانی و کەرکوك وموسـڵی تیابوو . لەهـەمان کاتدا ئەوەشیان لەیاد نەکردبوو کەباسی چەند جیـاوکێکی پـەترۆل بکـەن بـۆ ئینگلیزەکـان ! [٣٣٦: ١١٦] .هەر لەو ماوەیەشدا شاندێکی کەمالیستەکان خەریکی دانوستان بوو لە ئـێران . لە٢٥ تشرینی یەکەم رێکەوتننامەیەکیان دەربارەی بەرەنگاربوونەوەی هەوڵـەکانی ئینگلـیزو ئەمەریکاییەکان مۆرکرد ، کەگـەرەکیان بـوو عەشیرەتەکانی سـەر سنوور بجوڵێنـن. ئەمـەش بەیەکەمین رێکەوتننامەی نێوان ئـێران و تورکیـا دادەنرێ دژی کـورد [ ٣٢٠: ٦٨ ]. دوای جەنگی جیهانی یەکەم و لەپاش سەرهەڵدانی دەوڵـەتی نوێـی تـورك وئـێران. هـەر ئـەو سـاڵەش ئینگلیزەکان بۆ فریودانی رای گشتی (شێخ مـەحمود) یـان گـەڕاندبووەوە. بۆ هێورکردنـەوەی بـاری رۆژهـەڵاتی کوردسـتانیش، یارمـەتی رەزاخانیـان دا بــۆ لێـدان و سـەرکوتکردنەوەی راپەڕینەکەی سمکۆ . ئینگلیزەکان دەیانویست کورد وەکو کارتێکی جەخت بەکاربێنن . لـەو نامەیەی مێژۆر نوئێل لە ١٩٢٢/١١/١٥ بۆ شێخ مەحمودی نارد ، باسی ئەوەی دەکرد لەگەڵ کۆمیساری باڵا ئاخاوتووە ، بۆی دەرکەوتووە کەئێستا ناتوانرێ بابەتی سەربەخۆیی کوردستان دیماهی پێ بهێنرێت ، ئەگەر شا فەیسەڵ و حکومەتی عێراق رازی نەبن [ ٣٨ : ١٠٠ ] . بـەم جۆرە ئینگلیزەکان چارەنووسی باشوری کوردستانیان بەدەسەڵاتی حکومەتی عێراقی بەستەوە . هاوکات ویستیان کورد هێور بکەنەوە و وایان نیشان بدەن کـەئامادەن شتێکیان بـۆ بکـەن ، تاوەك فشارێك لەکۆنگرەی لۆزان دژی تورکەکان بەکاری بهێنن .

دوای دەست پێکردنی کۆنگرەی لۆزان، لەئێوارەی ٢٦ تشرینی دووەمـدا عیـسمەت پاشـا داوای لـەکرزن کـرد کـەگفتوگۆی ئاشـکرا دەربـارەی داوای تورکـەکان بـۆ باشـوری کوردستان دوابخات ، تا ئەوان بیروڕایـان لەگـەڵ یـەکتر دەگۆڕنـەوە. دوای ئـەوە هەریـەکیان روانگەی خۆی لەیاداشـتنامەیەك نوسی و لـەنێوان ١٤ کـانونی یـەکـەم و ٣١ هـەمان مـانگدا بەسەر شاندی هاوپەیمانە سەرەکیەکانیان دابەشکرد [٢٢٣: ٣٠] . هەر لەکۆتایی ئـەو مانگـەدا

حکومەتی ئێران داوای لەنوێنەرایەتی فەڕەنگ و ئینگلیز و ئیتاڵیەکان کرد لەکۆنگرەی لۆزان ، کەلەبەرژەوەندی ئەوان چاوێك بەسنوورەکانی کوردستان و ئەو لایەنەی دەکەوێتە سەر سنووری تورکیا بخشێننەوە . بەدەست پێشخەری بەریتانیەکان ئەم داوایەی ئێران ڕەتکرایەوە . تەنانەت کرزن رازی نەبوو نوێنەری ئێران بەشداری کۆنگرەکەش بکات [ ٢٥٥: ٢٩٢] .

دانوستانەکانی کۆنگرەی لۆزان ئەوەیان سەلماند کەوا کەمالیستەکان باکوری کوردستان ، واتە ئەو دەڤەرانەی پێشتر لەبن دەسەڵاتی عوسمانیەکان دابوون مسۆگەرکردووە ، هەوڵیان بۆئەوە دەدا باشوریش دەست بخەنەوە . لەراستیدا کۆنگرەی لۆزان دەست بەرداربوون بوو لەمافەکانی گەلی کورد .ئەگینا وەك کەمالیستەکان گوتیان : "ئەگەر ئینگلیزەکان واتێدەگەن دەتوانن چارەسەری دۆزی کوردستان بکەن ، بابێنە ئەرزەڕۆم و بزانن کوردەکان چیان بەسەردێت!". تۆینبی لەم بارەیەوە گوتی: "تورکەکان وا تێدەگەن بەردەوام بوونی پارڤەکردنی کوردستان دەبێتە سۆنگەی ئاژاوە ، بۆیە رایانگەیاند کەدەست بەرداری هەموو جیاوکێکی پەترۆل دەبن ئەگەر واز لەکوردەکان بهێنن بۆ ئەوان" [٢٢٣: ٢٧١] . وەڵێ ئینگلیزەکان هەرگیز بەوە رازی نەدەبوون باشوری کوردستان بکەوێتە دەست تورکەکان ،چونکە ئەو کاتە گەورەترین پارچەی کوردستان دەکەوتە بن دەستی ئەوان، ئەمەش وایدەکرد تورکیا گەورەبێت و هەموو رەگەزەکانی بەهێزبوونی تیابێت. بوونی دەوڵەتێکی بەم شێوەیەش گەفی لەبەرژەوەندیەکانی ئینگلیز دەکرد لەرۆژهەڵاتی ناڤین . ئەمەش یەکێك بوو لەو ئەگەرانەی کەدەوڵەتێکی عەرەبیان لە عێراق دروست کردو باشوری کوردستانیان پێوەلکاند ، بەبیانگەی ئەوەی پەیوەندی ئابووری و جوگرافی پتەویان بەیەکەوە هەیە. لەم بارەیەوە فۆستەر زۆر جوانی بۆچووە کاتێ نووسیویەتی : "حکومەتی عێراق بەتەواوی مل کەچی کۆنترۆلی بەریتانیەکان بوو ... ئەنجومەنی دامەزراندنی عێراقیش کە داوای باشوری کوردستانی دەکرد ، رەگی پتەوی بەئامانجی ئینگلیزی – عێراقی هاوبەش هەبوو" [ ٢٧٢ : ٢٠٩ ]. جێگای سەرسوڕمانە تورك و ئینگلیز لەکۆنگرەی لۆزان لەسەر کوردو کوردستان مشت و مڕیان بوو . تورکەکان دەیانگوت مادامەکونێ باشوری کوردستان کوردی تیایە، کەواتە هی تورکانە، چونکە کورد لەرەگەزی تورکن ! ئینگلیزەکان دەیانگوت کورد لەرەگەزی تورك نین . موسڵ شارێکی عەرەبیە و بەچەند ناوچەیەکی کوردنشین دەوردراوە! هەروەها بیانگەی ئابووری وجوگرافیان دەهێنایە بۆ ئەوەی پاساودانی داواکانی خۆیان بکەن [٢٢٣] . لەکاتێکدا هیچ لایەکیان رێگای کوردیان نەدەدا تەنانەت بەرگریش لەخۆی بکات. جێگای ئاماژە پێکردنە

لەو کۆنگرەیەدا هەرکاتێك حکومەتی ئەنقەرەیان تاوانبـار کردبوایـە ، عیـسمەت سـوودی لـە گوێ گرانیەکەی وەردەگـرت و وای نیشـان دەدا گـوێـی لـێ نیـە ! جـەختـی لـەسەر ئەوە دەکرد کەوا حکومەتی ئـەنقـەرەش وەك بـەشـداربووەکـانـی تـری کـۆنگـرە پێویـستـە مامەڵـەی وولاتێکی سـەربەخوێ لەگـەڵدابکرێت[ ٣٤٧ : ٣٦٥-٣٦٦] . هەرچـەندە عیـسـمەت لـەهیچ کۆنگرەیەکدا بەشداری نەکردبوو ، وەك خـۆی گـوتـەنـی لـەبواری سیاسـەت و دانوسـتاندا شارەزایی نەبوو ، تەنانەت لەسەرەتای کۆنگرەکەدا کـاتـی خـۆی بـەتـەنیـا لـەهۆڵـەکـە دۆزیـەوە، لەوە دەترسا کە ئەمە جۆرە فێڵێکی تری ئینگلیزەکان بێـت ! [ ٣٣٣: ٢٥-٢٦] . ئەمەش رادەی گەورەیی رۆڵی ئینگلیزەکان نیشاندەدات .

رۆژی ٢٣ کـانونی دووەمـی ١٩٢٣ رۆژێـکـی سـەخت بـوو لـەکۆنگرەی لـۆزان . هەموری بۆ کێشەی باشوری کوردستان و دۆزی کورد تەرخان کرابوو . کرزن دوای ئـەوەی پاساودان و بیانگەکانی خۆی خستە روو، گوتی : "هەڵبژاردنی فەیسەڵ بەشـای عـێراق واتـای ئەوەبوو باشـوری کوردستان خرایـە سـەر عـێراق![٢٥٥ : ١٨٤]. تورکـەکان چـەند ترسـی خۆیـان بەرامبەر ئینگلیزەکان نیشاندەدا ،هێندەش زێتر زەندەقیان لەحکومەتەکەی شێخ مەحمود چووبوو. بەبیانگەی گرتنەوەی باشوری کوردستان هـەوڵیاندەدا حکومەتەکـەی شـێخ مـەحمود لەناوبەرن . تەنانەت کارگەیشتە ئەوەی بۆ ئەم مەبەستە تاتەمـەنی (٣٨) سـاڵی خـەڵك بەسـەرباز بگرن . هاوکات لەگەڵ حکومەتی ئێران رێکـەوتن کـەوا پاشـکۆی هێزەکانیـان بپارێزن لـەو باڵـەی باشـوری کوردستان کەدەکەوتـە نزیـك سنوورەکانی ئەوانـەوە [١٥٦ : ١٣١] . ئـەم رەفتارەی ئێران بەدڵی ئینگلیزەکان نەبوو . پێشتریش بە ئێرانیان راگـەیاندبوو ، بـەریتانیا کـە کۆسـپ دەخاتـە بـەردەم تورکـەکان لـە گەڕانـەوەیان بـۆ باشـوری کوردسـتان بـەرگری لەبەرژەوەندیەکانی ئێران دەکات . بۆیە ئێرانیەکانیش پێویستە یارمەتیان بدەن. هـەروەها پـێ یان راگەیاندبوون بەریتانیا لەگەڵ ئەوەیە هێمنی لەرۆژهـەڵاتی کوردستان بپـارێزێ [ ٢٥٥ : ٢٤٥]. لەهەمان کاتدا ئینگلیزەکان وەستانی کۆنگرەی لۆزانیان بەهـەلزانی، دوو رۆژ بـەر لـە دەسـت پێکردنـەوەی قۆنـاغی دووەمـی کۆنگـرەی لـۆزان ،سـلێمانیان بۆردومـان کـردو یۆزدەمیریـان لـەرواندوز وەدەرنـا . پاسـاودانی ئـەم کارەشـیان بـەوە کـرد گـوایـە بـەگوێرەی هەندێك بەڵگەنامەی کـەدەستیـان کەوتووە ، تورکەکان گەرەکیان بووە کرداره سەربازیەکانی خۆیان بەرەو خانەقین فراوان بکەن[ ١٤٦ : ٧٠]. بۆیـە بەر لەوەی ئـەوان وەخۆکـەون ، ئـەوان کرداره سـەربازیەکانی خۆیـان دەسـت پێکـرد. ئەودەڤەرانـەیان خسـتەوە بـن دەسـتی خۆیـان کەگـەرەکیان بـوو بیخەنـە چوارچێوەی ئـەو دەوڵـەتـە عەرەبیـەی دایەنمـەزراندبوو ، واتـە

چوارچێوەی عێراق . کە ئەو کارانەیان ئەنجامدا لە ٢٣ نیسانی ١٩٢٣ قۆناغی دووەم لەکۆنگرەی لۆزان دەستی پێکردەوە . لە ٢٤ تەموز کۆنگرەکە دیمەاهی هات و ڕێکەوتننامەیەکیان مۆرکرد ، کە هەر بە ناوی کۆنگرەکەوە ناونرا . بەگوێرەی بەندی سێیەمی ئەو ڕێکەوتننامەیە سنوورەکانی باشوری تورکیا کێشرایەوە دواوە . هەروەها دان بەسنووری نێوان سوریاو تورکیا دانرا وەك ئەوەی کە لەبەندی هەشتەمی ڕێکەوتننامەی (تورکی- فەڕەنگسی) دا هاتبوو ، کەلە ٢٠ تشرینی یەکەمی ١٩٢١ مۆرکرابوو . هەرچی دەربارەی سنووری باشوری تورکیا و باکوری میسۆپۆتامیا بوو ، بڕیاردرا لەماوەی ٩ مانگ بەڕێکەوتنێکی دۆستانە لەنێوان تورك و ئینگلیزەکان دیاری بکرێت . ئەگەر نەگەیشتنە ئەنجام ئەوکاتە کێشەکە بدرێت بەکۆمەڵەی گەلان [ ٨٥: ١٢٨] . بەم جۆرە بەگوێرەی بەندی سێیەم، لەبەرئەوەی پێشتر ڕێکەوتننامە لەنێوان تورك و فەڕەنگەکاندا مۆرکرابوو ، بەپێی یاسای نێودەوڵەتی بەشی ڕۆژئاوای کوردستان خرایە سەر سوریا ،کەلەبن ماندانی فەڕەنگەکان دابوو . ڕێکەوتننامەی لۆزان وەك بەشکچی دەڵێت : "بریتی‌یە لە پارڤەکردنی نەتەوەیی کوردو خاکی کوردستان ، بۆیە دوو واتای تەواو لێك جوێی هەیە بۆ کورد و تورکەکان ،بۆ تورك واتای دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ بوو ، بۆ کوردیش واتای بەیەکەوە لکاندن بوو ، واتای بەداموەزگاکردنی کۆیلەیەتی و بەکۆلۆنیکردن بوو . ئەم ڕێکەوتننامەیە بریتی بوو لە دامەزراندنی سیستەمێکی کۆلۆیالیستی نێو دەوڵەتی" [١: ٥٢] . وەك تۆمابواش دەڵێ : "ئەورۆپا هەمدیس کوردو ئەرمەنەکانی فریودا". بەگوێرەی رای یەکێك لەشارەزاکانی نێودەوڵەتی : ئەورۆپا کوردو ئەرمەنەکانی خستەوە بن دەستی جەلادەکانیان" [٣٤٨ : ١٤٣] . شایەنی باسە هەر لەو کۆنگرەیەدا کاتێك عیسمەت پاشا (ئینۆنۆ) باسی کەمە نەتەوەییەکانی لەگەڵ کرزن کرد ، کرزن بەسەرسامیەوە پرسی : ((ئایا کەمە نەتەوەییەکان ماون ؟)). عیسمەت پاشا لەم بارەیەوە نووسیویەتی : "بە(کرزن ) م گوت ئێمە ڕەگەزپەرستی قبووڵ ناکەین . کرزن وەرامی دایەوە : "ئازیزەکەم جاخەوشی ڕەگەز پەرستی چیە ؟" عیسمەت لەگەڵ پوانکارێ ،سەرۆکی فەڕەنگساش لەم بارەیەوە ئاخاوت ،پوانکارێ گوتی : "پیاوانی دەوڵەت نازانن بزاڤەکانی ئەناتۆلیا چیەو کێ لەم بزاڤانە بەرپرسیارە". هەروەها گوتی : "ئەوانە نەزانن لەوبڕوایەدان چەتەکان کە چونەتە چیا سەرکەوتن وەدەست دێنن" [٣٣٣: ٢٥-٢٦] .بەم چەشنە کەمالیستەکان لە لۆزان سەرکەوتنێکی گەورەیان وەدەست هێنا . زۆربەی بەندەکانی لۆزان لەسەر ئەو مەرجانە دامەزرا کەپەیمانی میللی دیاریکردبوو ،هەروەها تورکیا وەك دەوڵەتێکی خودان سەروەرێتی و سەربەخۆ دانی پیانرا [٩١: ٣٤]. هەرچی دەربارەی ڕۆژهەڵاتی کوردستانە ، ئەوا ئێرانیەکان بەنیازی ئەوەی فشار بخەنە سەر ئینگلیز لەتورکەکان

نزیك بوونەوە، چونكە ڕەزاخان لەوكاتـەدا دەیویسـت لوڕەكـان بخاتـە بـن دەسـتی خۆیـەوە ، كەئەوانیش دۆستی ئینگلیز بوون . ئینگلیزەكان پێیان وابوو پلانی شالیاری جـەنگ ڕەزاخـان خراونیە و لەسەر بنەمایەكی دروست داڕێژراوە ، هیچ بیانگەیەكی نەدەدا بەدەستەوە بۆ ئەوەی ئەوان خۆیان تێهەڵقورتێنن و یارمەتی بەختیاریـەكان بـدەن [٢٠٢: ٢١٠-٢١١] . ئـەوەبوو هەردوای ئەوە ئەحمەدشای قاجاریان ناچـاركرد پشـت بـەڕەزاخان ببەسـتێ و داوای پێكـهێنانی كابینەی حكومەتی لێبكات . سەرباری ئەمە ئینگلیزەكان دەیانویست لـەڕێگای ئێرانیەكانـەوە سەرئێشـە و ئـەژواری بـۆ حكومـەتی عـێراق چێبكـەن . بۆیـە لەسـاڵی ١٩٢٤ دەبینـین ڕووداوەكانی سنووری هەردوولا بەڕادەیـەكی زۆر ڕووی لـەزێدەبوون كـرد [١٤٩: ٢٨٤] .
لەڕاستیدا ئەو پێنگاوانەی ئینگلیز زێتر ئادگاری و تەكتیكی بوو . ئەگینا ئەوان بەردەوام بوون لەهاریكاریكردن و بەهێزكردنی حكومەتی عێراق .بۆ ئەم مەبەستەش كارەساتی ئاسوریەكانیان لەكەركوك قۆستەوە بۆ بـەهێزكردنی سـوپای عـێراقی . دوای كارەسـاتەكە جافـەر عەسـكەری گـوتـی: "نەبوونی سوپایەكی بەهێز بووە ئەگەری ئـەوەی چـەند چـەكدارێك بـەكاری تونـدو تیژی هەڵسن"[٩٠: ٩٢]. بـەهێزبوونی سـوپای عـێراقیش بەپلـەی یەكـەم بـەنیازی كـپ كردنەوەی بزاڤی نەتەوەیی كوردبوو ،كە هەموو توانایەكیان خستبووەگەڕ بۆ ئـەوەی نـەهێڵن بەعێراقیانەوە بلكێنن . بۆیە دەیانویست بوار نەدەن دەنگی شۆڕشگێڕەكان بگاتە هیـچ لایـەك . ئەمەش بەئاشكرا لەو بروسكەیەدا دەردەكەوێ كە پێشمەرگەی كورد بۆ وولاتە گەورەكان و كۆمەڵەی گەلانیان نارد، كەتیایدا دەیانگوت : "لـەمانگی ئایـاری ١٩٢٤ حكومـەتی ئینگلـیز هەموو جۆرە چەك و كەرەسـەیەكی جـەنگی دژی ئێمـە بـەكارهێنا .تەنانـەت ڕێگـای هـاوارو شكاتیشیان لێگرتین ، بەئامانجی داگـیركردنی كوردسـتان و بەسـتنەوەی بـەڕەوڕەوەی عـێراقی عەرەبیەوە" [ ٣٨ : ١٣٧] .

ئەژواری دیاریكردنی سنووری نێوان عێراق و توركیا ، كە دەیكرد دابڕینی بەشـێكی گرنگ لەباشوری كوردستان و دیاریكردنی سنووری ئەوپارچەیەی كـە بەعێراقـەوە لكێـنرابوو ،لە كۆنگرەی قوستەنتینیە كە لە ئایاری ١٩٢٤ گرێدرا بەئەنجام نەگەیشت ، بۆیـە بڕیاریان دا كێشەكە بدەن بەكۆمەڵەی گەلان ئـەو كاتـە بەمكوڕیـەوە بـیر لەوەكرایـەوە هێزەكـانی عـێراق فراوانتربكرێت و ژمارەی تۆپ و باڵە فڕو پیادە و سواریش زێتر بكرێت .هـەروەها هـەوڵێكی زۆریان دا بۆ ئەوەی پارەی پێویست بۆ ئەم مەبەسـتە دابـین بكـەن [ ١٧٣: ٤٣]. دوای ئـەوە كۆمەڵەی گەلان هەوڵیدا چارەسەریەكی وا بدۆزێتەوە كـە هـەردوولای نـاكۆك ڕازی بكـات . لە٣٠ ئەیلولی ١٩٢٤ بەتێكڕایی دەنگ لەسەر ئەوە ڕازی بوون كـەوا لێژنەیـەكی لێكۆڵینـەوە لەسێ ئەندام دیاری بكرێت بۆ ئەوەی زانیاری و پێشنیاری وا پێشكەش بكەن كە بیانگەیەنێتە بڕیارێك . بۆ ئـەم مەبەستەش ، لێژنەكـە دەسـت بەلێكۆڵینـەوەكانی خـۆی بكـات لـە خـودی

باشوری کوردستان. له ۳۱ تشرینی یەکەم راگەیەنرا کە لێژنەکە لەو سێ کەسە پێکهات :جوگرافی زانی بەناوبانگ و سەرۆکی مەجەری پێشوو پۆل تلکی ، هەروەها شالیاری سویدی (أ ی .أف .فرست) کە ماف پەروەریش بوو ، لەگەل سەرهەنگی خانەنشین لەسوپای بەلژیکی (أ.پولس) . [۱۱٦: ٥۲]. لەترسی ئەوەی ئەژواری‌روونەدا، هێڵێك پێشنیارکرا لەنێوان هەردوو وولاتدا ،کەدواتر بەناوی هێڵی برۆکسل ناسرا ، واتە بەناوی ئەو شارەی کۆبونەوەکەی تیاگرێدرا [ ۲۰۹: ۱۱۹] . شایەنی باسە دوای ئەوەی لێژنەکە هاتە کوردستان ، وەك ئەدموندز دەڵێ : "تەرازووی تاکتیك لەبەرژەوەندی هەڵوێستی ئێمەی نوێنەری بەریتانیاو عێراقدا بوو . هەموو دیاردە دەرەکی یەکان ئاماژەیان بۆ لاسەنگی تای تەرازووەکە دەکرد بەلای ئێمەدا . چونکە کارگێری لەبن دەسەلاتی ئێمەدا بوو ، لەناویشیاندا هێزی هەیتە ، بەمەش دەمانتوانی فشار بخەینە سەر هەموو کۆمەڵەو تایفەیەکی دانیشتوان، هەروەها دەمانتوانی دوازانیاری و ووردترینیمان بەدەست بگات"[ ۱۸٤: ۳٥۹] . دریغیشیان نەکرد لەوەی فشار بخەنە سەر خەڵك وکەسانێکی زۆریشیان زیندانی کرد . ئەمە سەرباری ئەوەی لێژنەکە بەهۆی سەختی و نەبوونی رێگاوبان نەگەیشتە زۆر شوێن و دەڤەری کوردستان لەگەڵ ئەوەش لێژنەکە گەیشتە ئەو بڕیارەی کەئەگەر بێت و بەرژەوەندی دانیشتوانی ناوچەکە ڕەچاو بکرێت کە بێگومان زۆربەی زۆری کورد بوون پێویستە حکومەتێکی کوردی دامەزرێت [۲۲۳]. کە ئەمەش بایەخێکی تایبەتی هەیە چونکە دان پیانانی لیژنەیەکی نێو دەوڵەتی بوو بەمافەڕەواکانی گەلی کورد. هەروەها لێژنەکە : "دوای ئەوەی گەڕایەوە سەر مێژوو نووس و جوگرافی زانە کۆنەکان ، گەیشتە ئەو بڕوایەی هیچ کاتێك عێراق لە هیت-تکریت ، یاخود ناوچەی چیای حەمرین تێنەپەڕیوە . هەموو ئەدەبیاتی جوگرافی ، هەر لەسەردەمی هێرشی عەرەبە موسوڵمانەکانەوە تا ساڵی ۱۹۲٥ ، ئەو زەویانەی ئێستا ناکۆکی یان لەسەرە ، رۆژێك لەرۆژان نەبەشێك بووە لە عێراق ،نەبەشێکیش لە عێراق سالوخدان کراوە" [ ۲۲۳: ۷۸] . کەچی لەدیماهیدا لەبەرئەوەی بەریتانیەکان باڵا دەست بوون ، لێژنەکە راپۆرتێکی پێشکەش کرد لە ۱۱۳ لاپەڕەی گەورەو ۱۱ نەخشە پێکهاتبوو ،تیایدا هاتبوو : "ئەگەر سەیری دۆزەکە بەگشتی بکەین و بەرژەوەندی خەڵکەکە رەچاوبکەین ، بەرای لێژنەکە واباشترە ئەو دەڤەرانەی ناکۆکی‌یان لەسەرە پارڤەنەکرێت ! لێژنەکە وادەبینێ بیانگەی گرنگ هەیە یارمەتی ئەوەدەدا هەموو دەڤەرەکە لە باشوری هێڵی برۆکسلەوە بە عێراقەوە بلکێنرێت . هەروەها پێویستە ئارەزووی کوردەکان رەچاوبکرێت بەدامەزراندنی فەرمانبەری کورد بۆ بەڕێوەبردنی وولاتەکەیان و رێکخستنی کاروباری نێودەوڵەتیی و خوێندن لەکاروباری رەسمیو قوتابخانەکاندا .لێژنەکە وادەبینێ ئەگەر زێرەڤانی کۆمەڵەی گەلان بۆماوەی چوار ساڵ تەواوبوو ، کەلە پەیماننامەی عێراقی - بەریتانی دا هاتووە وهیچ هەرێ یەك بەکورد نەدرا بۆ بەڕێوەبردنی خۆی، ئەوا هەموو خەڵکەکە حوکمی تورکی سەر پشك دەکەن

لەسەر حوکمی عـەرەبی [ ٢٠٥ : ٢٦] . ئـەوەی لـەو گاڤـەدا زێـتر يارمـەتی ئينگليزەكـانی دا لەكاتی تاوتوێ كردنی راپۆرتی لێژنەكە، دايسانی راپەڕينەكەی شێخ سەعيدی پيران بـوو. كـە پاڵپشتێك بوو بۆ داواكاريەكانی بەريتانيا، ئەوەی دەردەخست بۆ كـورد واباشـترە بەعێراقـەوە بلكێنرێت. چونكە ئەوان دەتوانن لەگەڵ عەرەب بژين ، هاوكات بەدرۆخستنەوەيەكی شـاندی توركیبوو لە لۆزان ، كەدەيانگوت : كەمينە موسڵمانەكان شادمانن بەچارەنووسيان لەسـايەی دەوڵەتی توركدا [ ١٤٢ : ١٨٦] . ئينگليزەكان بەهەمان لەگوين (عێراقی) يشيان دەترساند ، تارێكەوتننامەی جياوكی پەترۆليان لەگەڵ مۆربكات . كە ئەو ئاواتەيان بەئەنجام گەيشـت ، لـە ١٦ كانونی يەكەمی ١٩٢٥ كۆمەڵەی گەلان برياری دا كەهێڵی برۆكسل ،هێڵێكی لەبارە بـۆ ئـەوەی ببێتـە هێڵـی سنووری نێـوان عـێراق وتوركيـا [ ١٣٥ : ٢٦٦] . بەمــەش قۆنـاغی پارڤـەكردنی كوردسـتان بەشـێوەيەكی بنـەڕەتی ديمـاهی هـات، دوای ئـەوە ئــەو دەوڵەتانــەی كوردســتانيان بەســەرپارڤەكرا، كەوتنــە هــەوڵی لەيــەكتر نزيــك بوونــەوە و پتــەوكردنی پەيوەنديەكانيان، بۆ هاريكاری و يارمـەتيدانی يـەكتری، لـەپێناو سـەركوتكردن و داپلۆسـينی بزاڤی نەتەوايەتی كورد وتەنانەت سڕينەوەی ناسنامەی مرۆڤی كورد .

هەر لەوماوەيەشدا رەزاخان سيستەمی قاجاری وەلاناو سيسـتەمی پەهلـەوی دامـەزراند .چوار رۆژدوای ئەوە لە٤ تشرينیدووەمی ١٩٢٥ يەكێتی سۆڤيەت دانی پيانا، واتە تەنيا يەك رۆژ دوای ئەوەی بەريتانيەكان دانيان پيانان. بـەم چەشـنە سێ دەوڵـەتی داردەسـتی ئينگليز، عێراق و توركيا و ئێران لە دەڤەرەكەدا دامەزران. كە هەر لەو كاتەوە بـەرژەوەندیی لێـدان و سەركوتكردنەوەی كورد بەيەكەوەيانی بەستايەوە. كە ئەمە كاريگەيـەكی ترسـناك و تراژيـدی لەسەر چارەنووسی گەلی كوردو خاكی كوردستان هەبوو. وەك بەشكچی دەڵێت : "كوردەكان لەهيچ شوێنێك وەك كورد سـەير نـاكرێن، لـە توركيـا بـەزۆر دەكرێـن بـە تـورك، لـە ئـێران بەفارس، لە عـێراق و سـوريا بـە عـارەب. ئەمـەش وەكـو تـورك و فـارس و عـارەبی پلـە دوو" [ ١ : ٣٥].

بەم جۆرە ئەو ململانێ و ناكۆكيانەی دوای جەنگ لە نێوان زلهێزەكان هاتە ئارا، لەسەر پارڤە كردنی بەرژەوەنديەكانيان، بووە ئەگەری سەرهەڵدانی هێزی ناوچەيی نوێ. كە ئەمە زێتر يارمـەتی دان بـۆ پارڤـەكردن و دەسـت بەسـەرداگرتنی تـەواوی كوردســتان و هێشــتنەوەی ئەژواريەك لەو دەڤەرە، كە لـە هەسـتيارترين و سـەختترين كێشـەی رۆژهـەلاتی نـاڤين و بگـرە هەموو جيهان دەژمێردرێت. تا ئەمرۆش كورد بە دەستيەوە دەناڵێنێت و چارەسەری نـەكراوە، ئەمەش وای كردووە دەڤەرەكە ئارامی بەخۆيەوە نەبينێ.

## باسی دووەم : پەترۆل و شوێنی جیۆپۆلەتیکی کوردستان وەک دوو تەوەری ململانێ

لەگەڵ دیماهی هاتنی جەنگ و نەمانی مەترسی ئەڵەمانەکان، هەمدیس ناکۆکی کەوتەوە نێو ئەو رکابەرانەی ترسی ئەڵەمانەکان لەنێو یەك هاوپەیمانیەتی گردی کردبوونەوە . یەکێك لە ئەگەرەکانی ئەو ململانێ و ناکۆکیەش پەترۆل بوو . چونکە ئەنجامەکانی جەنگی جیهانی یەکەم ئەوەیان سەلماند کە باڵا دەستی سوپایی تەنیا بۆ ئەو لایەنە وەدی دێت، کە پەترۆل و سەرچاوەکانی تری سوتەمەنی هەبێت، ئەمە چ لەلایەنی بزاڤە سەربازیەکان، یاخود دۆزە سیاسیەکانەوە بێت . [١٠١:١٤٧] . زلهێزەکان لەو بڕوایە دابوون ، ستالین گوتەنی : "کێ زۆرترین پەترۆلی هەبێت ، ئەو چارەنووسی جەنگی ئاینده دیاری دەکات" [٩٧:٢٨] . بایەخی پەترۆل لە کاتی جەنگ و دوای جەنگیش تادەهات زێتر دەبوو . لەو ئاهەنگەی کە لە ٢١ تشرینی دووەمی ١٩١٨ بۆ دەستەی هاوپەیمانەکانی پەترۆل لە کۆشکی لانگستر هاوس سازدرا . کرزن ووتارێکی دەربارەی بایەخی پەترۆل پێشکەش کرد . تیایدا گوتی : "بەر لە جەنگ پەترۆل بە یەکێك لە پیشەسازیە هەرەگرنگەکان و کەرەستەیەکی نەتەوەیی دەژمێردرا . بەکارهێنانیشی بەمەبەستی ئابووری و گواستنەوە لە زێدەبووندا . وەلێ بە دەستپێکی جەنگ، پەترۆل و بەرهەمەکانی تری بووە ئەو هۆکارانەی جەنگی پێ درێژە پێ بدرێ و سەرکەوتنی تیا وەدەست بێت. چۆن دەتوانرا بەبێ پەترۆل ، گواستنەوەی کەشتیگەل و سەرباز و بزافی پیشەسازی تانك و تۆپ بەلەز بکرێت ؟ لە راستیدا بۆمان هەیە بێژین : هاوپەیمانان لەسەر پێلی پەترۆل رووەو سەرکەوتن چوون" [٣١:١٧١] . یاخود وەك هنری برانژە ، نوێنەری حکومەتی فەرەنگ لەو کۆنگرەیەی کە لە یەکی تشرینی یەکەمی ١٩١٨ لە (رۆما)ی پایتەختی ئیتاڵیا بۆ پەترۆل سازدرا ، گوتی : "پەترۆل لە جەنگ وەك خوێن وابوو ، ئەو سەرکەوتنە وەدەست نەدەهات ئەگەر ئەو خوێنە نەبوایە ، ئەویش خوێنی خاك بوو ، کە ئێمە پێی دەڵێین پەترۆل" هەروەها ژەنراڵ (لۆندروف)ی ئەڵەمانی لە یاداشتەکانیدا نووسیویەتی : "ئەگەر پەترۆل لای هاوپەیمانان نەبوایە ، سەرکەوتنیان وەدەست نەدەهێنا" [٧٢:٢٠٦] . کرزن راشکاوانەتر گوتی : "بەریتانیا لە رۆژهەلاتی ناڤین لە پێناو پەترۆل شەڕی کرد ، بەرژەوەندیەکانی ئیمپراتۆریەت هەرگیز لە بەرژەوەندیە پەترۆلیەکانی جوێ نابێتەوە" [٢٥٠:١٣٥] . وەك لە راپۆرتێکی بەریتانیشدا هاتووە : "گیانێکی زۆرمان لە جەنگی (١٩١٤-١٩١٨) کردە گوری ، ئامانجی

بنەڕەتیمان هەبوو ، ئەویش لەسەر ئەو بنەمایەی بواری هیچ دەوڵەتێکی دوژمن نەدرێت ، گەف لە ڕێگاکانی گواستنەوەی ئیمپڕاتۆریاکەمان بکات . هەروەها بەریتانیا بەرژەوەندیەکی ئابووری زۆر فراوانی لەو دەڤەرەدا هەیە ، گرنگترینیشیان کێڵگە پەترۆلیەکانی کەرکوکە" [٧٦:٢٠٧]

سەرباری بایەخی پەترۆل ، ئەگەر سەیری دەڤەرە پەترۆلیەکانی کوردستان بکەین ، کەوتۆتە سەر ئەو هێڵەی کە هەر لە کۆنەوە ڕێگای بازرگانی بووە . وەك ناوچەکانی کەرکوك ، خانەقین ، قەسری شیرین ، کرماشان . یەکێك لە نووسەرەکان نووسیویەتی : "ڕێگای هیند ، هەمان ڕێگای بیرە پەترۆلیەکانی ئاسیایە". [٢٢٨:٨٣] . کەئەمە بایەخی پەترۆلەکەی زێتر کردووە ، هاوکات پەترۆلەکەش کاری لە بایەخە جیۆپۆلەتیکیەی کردووە. هەرئەمەشە وای لە یەکێکی وەك ئۆلسن کردووە ، بنووسێ : "ڕووی ئیمپریالیستی و ستراتیژی و نەتەوەیی و سیاسی بۆ ئینگلیزەکان ، ڕەنگە هاوشانی دۆزی پەترۆلەکە بووبێت" [٢٣٥:٢٤]. لەبەرئەوەی زۆربەی کێڵگە پەترۆلیەکانیش لە باشوری کوردستان بوو ، بۆیە بەریتانیەکان زێتر بایەخیان بەو دەڤەرە دەدا ، ئەمەش لەبەر دوو ئەگەر بوو "پەترۆل و ئیمپڕاتۆریاکەیان" [٢٣١:٨٣] . بۆیە ئەگەر کێڵگە پەترۆلیەکانی باشوری ڕۆژهەڵاتی کوردستان ، بایەخی هەبوو بۆ ئەوەی پەترۆل بۆ کەشتیگەلی بەریتانی لەکەنداوی فارس ئامادە بکا ، ئەوا کێڵگەکانی کەرکوك ، مەڵبەندێك بوون بۆ ئامادەکردنی پەترۆل بۆ کەشتیگەلی بەریتانی لە دەریای سپی ناڤین. بەو پێیە دەبوایە هاوسەنگی هێزەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین لە بەرژەوەندی بەریتانیەکاندا بێت ، لەگەڵ ڕەچاوکردنێکی سادەی هەست و سۆزی ناسکی فەڕەنگەکان .

بایەخی کوردستان ، کە ببووە هۆکارێك بەرژەوەندیەکانی بەریتانیای بە هیندستان دەبەستەوە . هەروەها وەك بنکەیەك بۆ تەیارکردنی پەترۆل بۆ کەشتیگەلیەکانی بەریتانی لە کەنداوی فارس و دەریای سپی، تا دەهات زێتر بەرزدەبوەوە . بۆیە گرنگی کوردستان تەنیا لە سۆنگەی پەترۆلەکەیەوە نەبوو بۆ ئینگلیزەکان ، بەڵکو ئامانجی ستراتیژی خۆیان هەبوو، ئەگەر تا ڕواندز لە باکورەوە لەبن دەسەڵاتی ئەواندا نەبوایە ، ئەوا ئەو دەڤەرە گرنگە دەکەوتە دەست دەوڵەتێکی ترەوە ، کە دەبووە ناوبڕێك لەنێوان کەنارەکانی دەریای سپی و هیندستان . [٢٥٣:٨٨] . بۆیە هەندێك لەنووسەران چێ نەبوونی دەوڵەتی کوردی دەگەڕێننەوە بۆ دوو هۆی سەرەکی ، یەکەمیان شوێنی ستراتیژی کوردستان ، دووهەمیان دەوڵەمەندی کوردستان ، بەتایبەتی باشوری کوردستان . [١٤٢:٧٩] .

لەبەرئەوەی بەشێکی باشوری ڕۆژهەڵات بەر ئێران کەوتبوو ، ئەویش دەروازەیەکی تر بوو بۆ ئینگلیزەکان تا بەرژەوەندیەکانیان لەو دەڤەرە بچەسپێنن ، بۆیە بایەخێکی زۆریان بە ئێرانیش دەدا . کرزن پێیوابوو ئێران شوێنێکی ستراتیژی و گرنگ بوو ، ئەگەر ڕێگایان بدابوایە دوژمنان دەهاتنە ناوەوەی ، ئەمەش گەفی لە بەرژەوەندیەکانیان دەکرد ، وەك زۆرجاریش دەیگوت : "ئینگلیز بەشێوەیەکی ژیانی پشت بە پەترۆلی ئێران دەبەستێ" [٨٣:٩٦]. هەرچی دەربارەی باکوری کوردستان بوو ، ئەوا هاتنەکایەی سۆڤیەتیەکانیان بەمەترسیەکی ڕاستەخۆ دەزانی بۆ سەر بەرژەوەندیەکانیان . چونکە سۆڤیەتیش وەکو ڕوسیای بەری ، بەرژەوەندیە ستراتیژی و جیۆپۆلەتیکیەکانی هەرمابوو. "ڕاستە دەوڵەت گۆڕانیان بەسەردا دێت ، سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و بۆچوونی ئایدۆلۆژیان دەگۆڕێ ، وەلێ فاکتەری جیۆپۆلەتیك وەکو شتێکی گرنگ و کاریگەر لەژیانی دەوڵەتدا هەردەمێنێ" [٢٣:٥١] . بۆیە سەرهەڵدانی سۆڤیەت وایکرد ئینگلیزەکان زیتر ئێران لەباوەش بگرن . وەك لە یەکێك لەیاداشتنامە بەریتانیەکان دا هاتووە : "ئێمە خۆمان بە دەمڕاستی فارس نازانین ، وەلێ گەرەکمانە یارمەتی بدەین ، تا خۆی لەسەر پێ ڕادەگرێ . چونکە ئەگەر کەوتە هەمێزی ڕوسەکان ، یاخود بوو بە هاوپەیمانیان ، ئەوا شوێنمان لەڕۆژهەڵاتی ناڤین لەنگ دەبێ . بەجۆرێك پارێزگاری کردنی زۆری تێدەچێ " [٩:٢١٣] . بەشکچی لەم بارەیەوە ووردی بۆچووە کە دەڵێ : "لەگەڵ شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ دا جیهان بەشێوەیەکی توند گۆڕا ، لێرەوە دەبێ لەڕوانگەی تەرازووی هێزەکانەوە لەڕۆژهەڵاتی ناڤین و لەجیهانی دەرەوەیدا ، سەیری دۆزی کورد بکرێت" [١:٥٧] .

ئینگلیزەکان ماوەیەکی زۆر بوو لەکوردستان بوون و شارەزاییەکی باشیان تیاپەیدا کردبوو. باشوری کوردستانیش کە لەرووی ستراتیژی و ئابووریەوە گرنگترین بەشەکانی کوردستان بوو، بەشێکی پڕ بایەخی باشوری کوردستانیش، بەپێی پەیماننامەی سایکس -پیکۆ ، بەر فەڕەنگەکان کەوتبوو، وەلێ لەگەڵ وەستانی جەنگ و بەستنی ئاگربەست ، ئینگلیزەکان نەوەستان و هێزەکانیان بۆ باشوری کوردستان ئاژوا . تەنانەت بەر لەبەستنی ئاگربەستەکە ، شالیارگەی جەنگ بروسکەیەکی بۆ ژەنڕاڵ مارشال ، فەرماندەی هێزەکانی عێراق لێدا، کەهێزەکانی بەرەو باشوری کوردستان (ویلایەتی موسڵ) بازۆاو هێندەی دەتوانن زەوی دەستبخەن، هەروەها پێیانی ڕاگەیاند، کە دامەزراندنی ئەو هێڵە ئاسنەی لەئێرانەوە بۆ دەریای

قەزوێن دەچوو، گیرۆ نەبێ. [٢٥٠:٢٠٠] . بەم لەگوێنە ئینگلیزەکان بەشێك لەباشوری کوردستان (ویلایەتی موسڵ) یان خستە بن دەستی خۆیان . بۆ ئەم کارەشیان زۆر پاساودانیان دەهێنایەوە . تۆینبی پێی وابوو داگیرکردنی ئەو بەشەی باشور لەبەر بایەخی ستراتیژی بوو نەك پەترۆل [٢١٥:٢٧٢] . هەرچی ویلسن بوو دەیگوت ئینگلیزەکان لەبەر شکستەکەی (کوت) ئارەزوویان دەکرد شان و شکۆی خۆیان بەرز بکەنەوە . سەیر ئەوەیە دواتر ویلسن هەر خۆشی گوتی ئەو هەڵمەتە لەهەموو هەڵمەتەکانی تر زیتری تێچوو [١٤٤:١٢٩] . لازاریڤ رایەکەی تارادەیەك لەگەڵ تۆینبی یەکدەگرێتەوە . پێی وایە ئینگلیزەکان ئەو بەشەی باشوریان بۆ ئەوەبوو بیکەن بەپردێك ، لەوێوە فراوان خوازیە سیاسی و سەربازەکانیان بڵاوبکەنەوە رووەو رۆژهەڵات و رۆژئاوا و ئەودیو قەوقاز و دەریای رەش . بەریتانیەکان شوێنی خۆیان لەرۆژهەڵاتی ناڤین لەکن سەقامگیر نەدەبوو ، ئەگەر سەرپەرشتی ئەو ناوچە بەرز و ستراتیژی و دەوڵەمەند بەسامانی سروشتی لەبن دەسەڵاتی خۆیاندا نەبوایە، بۆیە لەکۆنگرەی ئاشتی دۆزی کورد بەگوێرەی ئەوان پلەی یەکەمی وەرگرتبوو ، بۆ ئەوەی بەزانایی بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەی سایکس-پیکۆ بەکاری بهێنن [٥٥:٢٥٥] چونکە ئامانجێکی گەورەی ئینگلیزەکان هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەی سایکس-پیکۆ و بن دەست کردنی کوردستان بوو لەژێر پەردەی دارشتنێکی یاسایییەوە . بۆیە کاتی کلیمانسۆ سەرۆك شالیارانی فەرەنگ لەکانونی یەکەمی ١٩١٨ سەردانی لەندەنی کرد . هەلێکی لەباربوو بوو ئینگلیزەکان ئەو ئاواتەیان بهێننە دی . لۆید جۆرج* لەم بارەیەوە نووسیویەتی : "کلیمانسۆ کەدوای جەنگ هاتە لەندەن ، هەموو ناوشاری لەگەڵ گەرام . جەماوەریش بەوپەڕی گەرمیەوە پێشوازیان کرد . کاتێ گەیشتینە باڵوێزخانەی وڵاتەکەی ، لێی پرسیم گەرەکتە چیت لە فەرەنگەکان دەست کەوێ ؟ دەم و دەست وەرامم دایەوە (ویلایەتی موسڵ) بخرێتە سەر عێراق و ... کلیمانسۆ بەبێ گفتوگۆ لەسەر ئەمە رازی بوو . هەرچەندە ئەو رێکەوتننامەیەمان لەهیچ شوێنێك تۆمار نەکرد.

---

* لۆید جۆرج (١٨٦٣-١٩٤٥) سیاسەتوانێکی ناسراوی ئینگلیز بوو . ئەندامی پارتی سەربەخۆ خوازەکان (حزب الاحرار) بوو . لەساڵی (١٨٩٠)ەوە چەند جارێك بۆ پەرلەمانی بەریتانیا هەڵبژێردرا . لەساڵی (١٩١٦-١٩٢٢) پلەی سەرۆك شالیارانی پێ سپێردرا . بەر لەمردنی بەماوەیەکی کەم نازناوی (لۆرد Lord)ی پێ بەخشرا . [١١٢:١٠٠] .

لەگفتوگۆکانی داهاتوو بەدڵسۆزیەوە پێیەوە پابەند بوو" [۱٥١:٢٣٧] . ئەگەرچی دواتر کلیمانسۆ لەناخیشەوە پەژیوان بوەوە ، وەك لەووتارێکیدا ئاماژەیبۆ کرد ، کەئەگەر بیزانیایە ئەو دەڤەرە ئەو هەموو پەترۆڵەی تیایە هەرگیز دەست بەرداری نەدەبوو [٥٦:٣٠] . بێگومان ئەمەش زێدەڕۆییەکی تیایە . چونکە فەرەنگەکان لەمێژبوو لەو ناوە بوون و شارەزای هەموو شتێك بوون . هۆی راستەقینەی ئەم هەڵوێستەی کلیمانسۆ ئەوەبوو دەیزانی ئەو دەڤەرە بەشێوەیەکی کرداری لەبن دەستی ئینگلیزەکان دابوو، ئامادەش نەبوون دەست بەرداری بن . لەوانەبوو لەسۆنگەی ئەمەش جەنگێك لەنێوان ئەم دوو دەوڵەتە بکەوێتەوە . بۆیە بەرلەوەی بەناخۆشی دەست بەرداری بن ، بەخۆشی وازیان هێنا . ئەم راگەیاندنەش وەك پاساودانێك بوو بۆ رازیکردنی رای گشتی. چونکە کلیمانسۆ پێی وابوو " دیاریکردنی مەرجەکانی پێکهاتنەوە ، لەبردنەوەی جەنگەکە ئەستەنگ تربوو" [٧٤:١٧٥] . بەم جۆرە ئینگلیزەکان بەدەست گرتنیان بەسەر باشووری کوردستان دوو ئامانجیان پێکا . لەلایەك پەترۆلیان کەوتەدەست ، لەلایەکی تر سوودی ستراتیژی پێویستیان دابینکرد بۆ بەرگری کردن لەئیمپراتۆریەکەیان" [٢٥٠:١٣٥] . لەراستیدا پەترۆل بەتەنیا لەباشووری کوردستان نەبوو کە بەئێران و میسۆپۆتامیاوە لکێنران ، بەڵکو لەتورکیاش ، گرنگترین کێڵگە پەترۆلیەکان دەکەوتنە کوردستان و لەنزیك ئامەد (دیاربەکر)ەوە بوون [٢٤:٢٥١] هەرچەندە ئەو کێڵگانە بەرهەمیان کەم بوو .

ململانێ لەسەر پەترۆلی کوردستان ، بەرایێ بەشێوەیەکی تایبەتی لەنێوان ئینگلیز و فەرەنگەکان دابوو. ئەمەریکاییەکان پێشتر ، لەکاتی جەنگ ، لەژێر پەردەی یارمەتیدانی ئەوانەی دوچاری برسیەتی هاتبوون لەئەرمەنی و ئاسوریەکان ، لێژنەیەکیان ناردە ئەو دەڤەرە ، کە بەلێژنەی ئێرانی دەناسرا . وەك یەکێك لەسیاسەتوانەکان گوتی : "ئەمەریکاییەکان شتێکی باشیان کرد فریاڕەسی برسیەکان کەوتن ، وەڵێ لێژنەکە لەکاتی گەڕانەوەی جیاوکی پەترۆلی لەگەڵ خۆی بردەوە !" [١٣٢:٩٥] .

کوردستان لەو کاتەدا کەوتبووە نێوان بەرداشی چوار هێزی سەرەکیەوە ، ئینگلیز و فەرەنگ و ئەمەریکایی و سۆڤیەتیەکان . ئەمە جگە لەهێزە ناوچەییەکان . ئەگەرچی سۆڤیەتی و ئەمەریکاییەکان بەناو مەترسیان زۆربوو ، بەتایبەتی لەماوە زووەکانی دوای جەنگ . کەچی لەراستەقینەدا لەئاستی دوو هێزەکەی تر نەبوون . بەپلەی یەکەمیش سۆڤیەتیەکان ، کەزۆر

جاران ئینگلیزەکان بۆ وەدیهێنانی ئامانجە سیاسیەکانی خۆیان لەسەنگی خۆیان زێتر بەرزیان دەکردنەوە چونکە ئەوان گەرەکیان بوو تاقە سواری گۆڕەپانەکە بن و هەموو شتێك لەبن دەستی خۆیاندا بێت . هەرچی فەڕەنگەکان بوون ، هەوڵیاندەدا دەستکەوتەکانیان بپارێزن و شوێنی خۆیان وەکو زلهێزێك لەململانێیەکە لەدەست نەدەن . لەپاڵ ئەمەش ئەو بەرژەوەندیانەیان وەدەست بێنن کەخوێنێکی زۆریان لەپێناو رشتبوو . ئەمەریکاییەکان بۆ ئەوەی زێتر شوێنی خۆیان لەو ململانێیەدا بگرن و وەك زلهێزێك خۆیان بنوێنن ، هەر لەکاتی جەنگدا ، ویلسن ، سەرۆکی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا چوارده خاڵەکەی راگەیاند ، کە لەلایەك وەك بەرپەچدانەوەیەکی راگەیاندنە ئاشتیخوازەکەی سۆڤیەت بوو ، لەلایەکی تر لەپێناو کەمکردنەوەی گرژی نێوان زلهێزەکان بوو . بەکۆتایی پێهێنانی دیپلۆماتێکی نهێنی. ئەو بەندانە* زۆر دەنگیان دایەوەو بووە سۆنگەی بەرزکردنەوەی رۆڵی وولاتە یەکگرتووەکان . هەرچەندە بەشێوەیەکی پراکتیکی زۆر لەو بەندانە پشتگوێ خران [١٧٥:٣٤٥] . لەراستیدا هاوپەیمانەکان ناچار بوون ئەو بەندانە بکەن بەبنەمایەك بۆ ئاشتی . چونکە لەیەکێ لەدانیشتنەکان نوێنەری ئەمەریکا گەفی ئەوەیکرد ئەگەر ئەو چوارده بەندە قبوولٚ نەکەن ، ئەوا وولاتەکەی ئامادەیە بەتەنیا رێکەوتننامەی ئاشتی لەگەڵ ئەڵمانەکان مۆربکات [١٤٣:١٠٠] . هەرچەندە هاوپەیمانان بەهەندێك خۆپارێزیەوە لەسەر ئەو بەندانە رازی بوون ، وەڵێ لەپاڵ ئەمەشدا بۆ هێنانەدی هاوسەنگیەك لە ٨ تشرینی دووەمی ١٩١٨ بەیاننامەی ئەنگلو – فەڕەنگیان راگەیاند . کە لەلایەك دەیانویست متمانەی نەتەوەکانی بن دەستی عوسمانیەکان بگەڕێننەوە ، کەدوای ئاشکراکردنی پەیماننامە نهێنیەکان لەلایەن سۆڤیەتیەکانەوە دوچاری بێ متمانەیی ببوون. ئەمەش هەراسانی کردبوون و زیانێکی زۆری بەبەرژەوەندیەکانی ئەنگلۆ – فەڕەنگی دەگەیاند . لەلایەکی تر وەك کرزن لەیەکێ لەکۆبونەوەکانی لیژنەی رۆژهەڵات ، کە لە ٥ کانونی یەکەمی ١٩١٨ گرێدرا ، گوتی : "بەیاننامەی ئەنگلۆ – فەرەنگی تاڕادەیەکی زۆر جێگەی رێکەوتننامەی سایکس – پیکۆی گرتەوە ، چەکێکی گرنگ بوو بۆ بەریتانیەکان لەکاتی چارەسەرکردنی ئەو رێکەوتننامەیە" [٣٨:٨٣] . لەگەڵ ئەوەش زۆر لە لێپرسراوانی ئینگلیز بەم راگەیاندنە رازی نەبوون. یەکێك لەوانە ویلسن، کەزۆر بەراشکاویەوە لەبروسکەیەکی بۆ شالیارگەی هیندستان گوتی : "ئەو بەیاننامە ، هێندەی پەیوەندی بەمیسۆپۆتامیاوە هەیە

---

* ئەو بەندانە لەشێوەی نامەیەك بوو ئاراستەی کۆنگریسی ئەمەریکی کرا ، لە ٨ کانونی دووەمی ١٩١٨ . هاوپەیمانان رەزامەندیان لەسەر دەربڕی و پاشان لەتشرینی دووەمی ١٩١٨ بووە ئەستوندەی رێکەوتن لەگەڵ ئەڵمانەکان . [٧٦:١٧٥] .

دوچاری ئەستەنگێکی گەورەمان دەکات . هەوڵی ئەوروپاییەکان دەخاتە لەرزە کەدەیانەوێ دامو دەزگایەکی جێگیر لەرۆژهەڵاتی ناڤین دامەزرێنن" [٣١٦:١٢٩] . دیارە ئەو ئاخاوتنەی ویلسن بەشێوەیەکی گشتی کوردستان دەگرێتەوە ، کە هەرگیز ئامادە نەبووینە هیچ بەڵێنێك بەکورد بدەن . هاوکات سیاسەتی ئینگلیزەکان لەرۆژهەڵاتی ناڤین دیاری دەکا ، کە نەئامادەبووینە و نەبیریان لێکردۆتەوە هیچ قەوارەیەکی کوردی دابمەزرێنن . ئەوان مەبەستیان تەنیا پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆیان بوو ، کە لەگەڵ دامەزراندنی قەوارەیەکی کوردی یەکی نەدەگرتەوە . بگرە کوردیان بەمەترسیەکی گەورەش دەزانی لەسەر بەرژەوەندیەکانیان ، لەسۆنگەی شوێنی ستراتیژی و دەوڵەمەندی وولاتەکەی و ئەو گەلە ئازاو جەنگاوەرەی تیایدا دەژیا . بۆیە بۆ لەناوبردنی ئەو مەترسیە کەوتنە دامەزراندنی چەند دەوڵەتێکی نەتەوەیی لەهەر چوار دەوری کوردستان و کوردستانیان بەسەر پارقە کرد . بۆ چاوترساندنی ئەو دەوڵەتانەش، تا هەمیشە وەکو ئەلقە لەگوێیەکی خۆیان بمێننەوە . ناوەناوە وایان نیشاندەدا کەهانی بزاڤی کورد دەدەن . یەکێك لەپەرلەمانتارە فەرەنگەکان ئەم راستەقینەی دەربڕی کاتێك گوتی : "سیاسەتی بەریتانیا گەرەکیەتی تورکیا بکاتە میسرێکی نوێ و قەلایەك لەسەر رێگای هیندستان . لەوەش زێتر چالاکی سیاسی و سەربازی کاریگەری خۆی لەکوردستان زێدە دەکاو چالاکی نەتەوەیی کورد جۆش دەدا" [٣٨:٢٨٠] . تەنانەت هەندێ لەسەرکردە کوردەکان خۆشیان هەستیان بەقووڵی ئەم ململانێیەو چاوتێبڕینی زلهێزەکان کردبوو . ئەمەش بە روونی لەو یاداشتنامە دەردەکەوێ کە ئەحمەد سورەیا بەدرخان لە ١٦ کانونی یەکەمی ١٩١٨ ، بەناوی پارتی سەربەخۆی کورد لەقاهیرە بەسەر نوێنەری دەوڵەتە بێگانەکانی دابەش کرد . کە تیایدا نارەزایی دژی چاوتێبڕینەکانی بێگانە و پارقەکردنی کوردستان دەربڕی [٥٩:٢٨٩] .

وەك ئاشکرایە بۆ چارەسەرکردنی ئەژواریەکانی دوای جەنگ ، سزادانی دۆڕاوان و رازیکردنی سەرکەوتوان ، لە کانونی دووەمی ١٩١٨ کۆنگرەی ئاشتی* لەپاریس گرێدرا، لەبن کۆنترۆلی چوارکەسە زلەکە Bigfor ، ویلسن و کلیمانسۆ و ئۆرلاندۆ و لۆید جۆرج . [١٦٧:١٢٧] . ئینگلیزەکان سەرباری ئەوەی لەم کۆنگرەیەدا و لەبواری دیپلۆماتیکیدا

---

*کۆنگرەی پاریس بۆ ئاشتی Paris Peace Conference کۆنگرەی بەیەکگەیشتنی هێزە یەکگرتوو هاوپەیمانەکان بوو Alied and Associated Powrs. . لە ١٨ کانونی دووەمی ١٩١٩ لەپاریس بەسترا . تا ٢٠ کانونی یەکەمی ١٩٢٠ خایاند ، بۆ ئەوەی بگەن بەچارەسەرێکی ئاشتیانە Peace Settment و ئەم پەیماننامەی بەخۆوە گرت ، Treatis ڤرسای و نیولی Neally و تریتان Trinan و سیڤەر Sevres . [١٦٧:١٢٧] .

بەگەرمی کەوتبوونە کارو هەوڵیاندەدا گەورەترین دەستکەوت وەدەست بێنن . لەبواری پراکتیزە و راستەقینەشدا ، لەبنەوە کارەکانی خۆیان ئەنجام دەداو هەوڵیاندەدا کێڵگە پەترۆلیەکانی کوردستان بەیەکتر ببەستنەوە . هەر لەدوای جەنگەوە درێژەیان بەکارەکانیان دا بۆ راکێشانی هێلی ئاسنی بۆ قورەتوو ، کە لە نزیك خانەقین بوو . لە کۆتایی ئایاری ١٩١٩ ئەم هێلە کەوتەکار. کە بایەخێکی ئێجگار گەورەی بۆ ئینگلیزەکان هەبوو . نەك لەبەرئەوەی یەکێك لەحەوزە پەترۆلیەکانی تیابوو، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەو خاڵەی هێڵەکەی تیا دیماهی دەهات تەنیا حەوت میل لە سنووری ئێرانەوە دووربوو . هەروەها دەکەوتە سەر ئەو رێگا بازرگانیەی کە دەگەیشتە کرماشان . وەك لە یەکێك لە راپۆرتەکاندا هاتووە : پلانی ئینگلیز بۆ ئەوەبوو رۆژئاوای ئێران ، –کەدەکاتە رۆژهەلاتی کوردستان– بە میسۆپۆتامیاوە ببەستێتەوە . دکتۆر کەمال مەزهەر پێی وایە پلانی ئینگلیز لەمەش دوورتر بوو ، ئەوان خەونیان بە رێگایەك دەدی کە بەغدا و باکۆ ، مەڵبەندی گشتی دەڤەرە پەترۆلیەکانی قەوقاز بەیەکەوە ببەستنەوە [٢٣٦ : ٥٦–٥٧] . بەم جۆرە بەریتانیەکان گەرەکیان بوو پەترۆل و سامانی کوردستان بە هەموو دەروازە دەریاییەکانی قەزوێن و کەنداوی فارس و دەریای سپی ناڤین ببەستنەوە .

هەر لە مانگی ئایاردا ، خاوەن بەرژەوەندیە پەترۆلیە ئەمەریکاییەکان یاداشتنامەیەکیان دا بە شاندی ئەمەریکی لە کۆنگرەی پاریس ، دەربارەی گرنگی پەترۆلی کوردستان و پێداویستی پشکداری کردنی کۆمپانیا ئەمەریکاییەکان لە وەبەرهێنانیدا . ئەندامانی شاندی ئەمەریکی لەو کاتەدا هەستیان بە دانوستانی پەترۆل کردبوو لە نێوان بەریتانی و فەرەنگەکاندا ، گەرەکیان بوو سروشتی دانوستانەکە بزانن ، وەلێ شالیارگەی هەندەرانی ئینگلیز و فەرەنگ توانیان نهێنی دانوستانەکە بپارێزن [٢٧٠:٣٥].

ئینگلیزەکان لەپاڵ ئەو هەوڵە ئابووریانە هەوڵی سیاسیشیان بەردەوام بوو ، بۆ ئەوەی پەیمانامەیەك لە نێوان دەوڵەتانی ناوچەکە گرێ بدەن تا رێگا لە تەشەنەکردنی نفوزی سۆڤیەتیەکان بگرن . بۆئەم مەبەستەش گەرەکیان بوو ئەو دەوڵەتانە لەیەکتر نزیك بکەنەوە . [٥١:١٩] . کە کوردستان یەکێك بوو لە گوریە زلەکانی ئەم سیاسەتەی بەریتانیا .

ململانێی نێوان ئینگلیز و فەرەنگەکان تا دەهات گەرمتر دەبوو . لە دوا دانیشتنی رۆژانی ٢١–٢٢ ئایاری ١٩١٩ ، وەك یەکێك لە پەرلەمانتارە فەرەنگەکان گوتی : گفتوگۆیەکی زۆر گەرم لە نێوان لۆید جۆرج و کلیمانسۆ روویدا ، کلیمانسۆ بە تووڕەیی بە هاوکوفەکەی خۆیگوت : "ئەگەر پێتگوتبام ، دەست بەردار بووغان لە باشووری کوردستان – ویلایەتی موسڵ – بە تەنیا دەست بەردار بوون نییە لە کێڵگەی پەترۆل ، بەڵکو دەست بەردار

بوونه له رووبەرێکی فراوانی زەوی ، هەر ئەو کاتە بڕیارم دەدا دەست لە باشوری کوردستان هەڵنەگرم" [٦٢:٢٧٩] . بۆیە هەر مانگێك دوای ئەوە لۆید جۆرجی گوتی : "من زۆر بەتوندی هەست دەکەم ئەو دۆزە سیاسیە گرنگانەی لە نێوان ئێمە و فەڕەنگەکاندا هەیە پێویستە لەگەڵ ئەو ڕێکخستنانەی دەربارەی پەترۆل کراوە و کۆمپانیا تایبەتیەکانی تێوەگلاوە تێکەڵ نەکرێت" [٢٧٤:٣٤٣] .

ئینگلیزەکان بەتەنیا نەیاندەویست ئەو هێزانە لەم دەڤەرانە دوور بخەنەوە ، بەڵکو ڕێگای زێدەبوونی نفوزی هیچ کەسێك ، یاخود هیچ لایەنێکی ناوچەیشیان نەدەدا . بۆیە کاتێك نفوزی شێخ مەحمود لە زێدەبووندا بوو، وایان لێکدایەوە ئەمە گەفێکە بۆ سەر ئاشتی لە هەموو دەڤەرەکە . وەك لە یەکێك لە یاداشتنامە بەریتانیەکان هاتووە : بە پێویستیان دەزانی بەهەموو جۆرێك ڕێگا لەزێدەبوونی شێخ مەحمود بگیرێ. بەتایبەتی لەو دەڤەرانەی ئینگلیزەکان تیایدا بەرهەڵستی حکومەتێکی * کوردیان دەکرد ، چونکە لەوانەبوو هەڕەشە لە ئاشتی ناوچەکە بکا . [٦٠:٢٧٦] . بێگومان مەبەستیشیان لەو دەڤەرانە ، دەڤەرەکانی خانەقین و کەرکوك و شوێنە پەترۆلیەکانی کوردستان بوو . ئەمەش ئەوە ڕووندەکاتەوە ، سەرباری سامانی کانزایی ، وەك شەمزینی دەڵێ : "کوردستان لە رووی ستراتیژیەوە گرنگیەکی تایبەتی خۆی هەبوو، کۆنترۆڵ کردنی مەرجێکی پێویست بوو بۆ دابینکردنی دەسەلاتی سیاسی و پاراستنی ڕژێمەکانی دوو ڕۆژهەلاتی نزیك و ناڤین. مستەفا کەمال بەخۆڕایی نەیگوتووە ئەگەر بارودۆخی جەنگ لە ڕۆژهەلاتی نزیکدا هاوسەنگ بوو ، ئەو لایەنەی دەست بەسەر کوردستان دادەگرێ سەرکەوتن بۆخۆی مسۆگەر دەکات" [١٨:٢٨] .

بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆیان ئینگلیزەکان هەوڵیاندەدا پشتێنەیەك بەدەوری کوردستان بکێشن، ئەویش لەڕێگای دامەزراندنی چەند دەوڵەتێك و دروستکردنی چەند حکومەتێکی دەسکەلای خۆیان. بەمەش لەلایەك ڕێگا لە پەرەسەندنی نفوزی سۆڤیەت بگرن ، لە لایەکی تر لە ڕێگای ئەوانەوە بتوانن ئامانجەکانی خۆیان لە کوردستان و ڕۆژهەلاتی ناڤین وەدەست بێنن و بەرژەوەندیەکانیان جێگیر بکەن . بۆیە کەوتنە ئەوەی چەند ڕێکەوتننامەیەك

---

• لە راستیدا ئینگلیزەکان بەرهەڵستی دامەزراندنی حکومەتی کوردیان دەکرد لە هەموو کوردستان . وەلێ سەرەتا کەهاتنە باشوری کوردستان بۆ پتەوکردنی نفوزی خۆیان چەند کارگێڕیەتیەکی ناوچەییان پێکهێنا ، بەمەش بۆ ماوەیەك ئەرکەکانی سەرشانی خۆیان سووکتر کرد. دواتریش هەر خۆیان کەوتنە لێدانی ئەو کارگێڕیانە .

لەگەڵ ئەو دەوڵەتانە ببەستن . شوێنی ستراتیژی ئێرانیش ، لە سۆنگەی ئەوەی بەشێك لە کێڵگە پەترۆلیەکان لەبن دەسەلاتی ئەو دابوو ، هاوکات سنووری کێڵگەکانی تریش بوو . ئەمە سەرباری ئەوەی سنووری باکوریان بە سنووری سۆڤیەتیەکانەوە بوو بایەخێکی تایبەتی هەبوو . بۆیە شاندێکیان بە نوێنەرایەتی هنری کۆکس (Henry cox) کەیەکێك بوو لە دیپلۆماتە هەرە زیخەکانی ئینگلیز و پسپۆریەکی تەواوی لە کاروباری رۆژهەلاتی ناڤین هەبوو ، لەلایەن (کرزن)ەوە پشتگیری دەکرا ، ناردو لەگەڵ ئێرانیەکان دەستیان بە دانوستان کرد . کە ٩ مانگی خایاند و لەئاکامدا رێکەوتننامەی ٩ ئاب مۆرکرا. ئەو رێکەوتننامەیەی بەرهەڵستیەکی زۆری کرا لەناوەوە و دەرەوەی ئێران . [١٧١:١٦٥] . کرزن مکوڕبوو لەسەر ئەو رێکەوتننامەیە ، پاساودانی بەوە دەکرد کە لە رێگای ئەو رێکەوتننامەیەوە دەسەلاتی بەریتانیا لە میسۆپۆتامیا تا ئەو رادەیە جێگیر دەبێت وەك بەشێك لە خاکی بەریتانی لێ بێت . لەو سۆنگەیەش بوو بەگوێرەی بەندی یەکەمی ئەو رێکەوتننامەیە دەبوایە سەربەخۆی و سەروەری خاکی ئێران رێزی لێ بگیرێت [٣١٦:١٣]. رۆژنامەی لەتانی (Letani) نیمچە رەسمی فەرەنگسی لە ژمارەی ١٧ ئابی ١٩١٩ ، واتە ٨ رۆژ دوای مۆرکردنی رێکەوتننامەکە نووسی : "کاتێك حکومەتی ئێران بەگوێرەی ئەو رێکەوتننامەیە بەڕێوەبردنی سوپاکەی دەداتە دەست ئەفسەرە بەریتانیەکان ، بەم کارەی واز لە ئازادی خۆی دێنێ . واز لە هەموو ئامرازێك دێنێ کە واژەی پێ لە سەروەرێتی خۆی بکات" [٢٢٧:٦٩]. هنری برانژە کە پسپۆرێکی پەترۆلی فەرەنگ بوو ، لە یاداشتنامەیەکی بۆ کلیمانسۆ ، باسی ئەوەی دەکرد کەوا سیاسەتی ئینگلیز لە ئاسیای بچووك و قەوقاز و تا هیندستان ، هەروەها لە ئێران و میسۆپۆتامیا بەتەنیا لە روانگەی نفوز و دەسەلاتداریێتی نیە ، بەڵکو سیاسەتی پەترۆلیشە . [٣١٤:٢٥-٢٦] . بۆیە فەرەنگەکان بە دڵەڕاوکێوە پێشوازی ئەم رێکەوتننامەیان کرد . هەروەها لە ئەمەریکاش هەندێك لە ئەندامەکانی ئەنجومەنی پیران ئەوەیان درکاند کە نیازی بەریتانیا هەرچیەك بێت لە راستەقینەدا ئەو رێکەوتننامەیە ئەوە دەگەیەنێ کەوا ئێران بۆ کاتێکی نادیار لەبن پاراستنێکی دەمامك کراوی بەریتانیەکان دەمێنێتەوە [٢٦٤:٢٧] . ئەمەریکاییەکان پێ یان وابوو ئەم رێکەوتننامەیە لەگەڵ پڕەنسیپەکانی دەروازەی والاَدا ناگونجێت، بۆیە دژی وەستان . لەم بارەیەوە شالیارانی هەندەرانی ئەمەریکا رایگەیاند کەوا وولاتەکەی بە هیچ شێوەیەك باوەڕی خۆی ناداتە ئەم رێکەوتننامەیە. چونکە ئێرانیەکان لەبن فشاری بەریتانیەکان ئەمەیان کردووە

[٤٠:١٩٦] . فەڕەنگەکانیش بۆ شکست پێ هێنانی ئەم ڕێکەوتننامەیە ئامادەیی خۆیان نیشاندا یارمەتی شاندی ئێران بدەن لە کۆنگرەی ئاشتی . بۆیە پرسی کۆکس (Percy cox) بۆ (کرزن)ی نووسی : "ئەمە پلانێکی هاوبەشە لە نێوان ئەمەریکی و فەڕەنگەکان دژی حکومەتی **وثوق الدولة** * " [٢٤:٣١٤] . لە ڕاستیدا فەڕەنگ و ئەمەریکاییەکان وا لەو ڕێکەوتننامەیە دەگەیشتن ، کەوا ڕێگای گەیشتن بە ئێران هەر لە ڕوس و ئەڵەمانەکان ناگرێت ، بگرە ئەو ڕێگایە لەوانیش دەگرێت . [٧٠:٣١٩] . باڵوێزی ئەمەریکا لە لەندەن ڕایگەیاند کەوا بەریتانیەکان لەم ڕێکەوتننامەیە بەلایەنی کەم کۆنترۆلی ئابووریان لە ئێران وەدەست هێناوە . ناوبراو بۆ شالیاری هەندەرانی بەریتانی نووسی : "هەر مکوڕبوونێکی بەریتانیەکان ، ئەو هەستە لای بەرژەوەندیدارە پەترۆلیە ئەمەریکاییەکان زیتر دەکا کەوا مامەڵە کردنێکی ناڕەوایان لەگەڵ دەکەن. بە تایبەتی لە ڕۆژهەڵاتی نزیکدا"[١٦٥:٩٥] . هاوکات ئەمەریکاییەکان پڕوپاگەندەی ئەوەیان دەکرد کە لەوانیە لەچەند ساڵێکی کەمی داهاتوودا بیرە پەترۆلیەکانیان ووشك بکات . ئەمەشیان کردە پاساودانێك بۆ ئەوەی ژمارەیەك لە پسپۆڕە پەترۆلیەکانیان بنێرنە کۆمسیاریەکانیان لە دەرەوە . لە ١٦ ئابی ١٩١٩ شالیاری هەندەران داوای لەو کۆمسیاریانە کرد ، ئاگاداری هەموو شتێکیان بکەنەوە کە پەیوەندی بە پەترۆلەوە هەبێت. لە سەرچاوەکان و جیاوکەکانی پەترۆل لە دەڤەرەکانیاندا . هەروەها داوای کرد یارمەتی ئەو هاو وولاتیانە بدەن کە گەرەکیانە ئەو جیاوکانە وەدەست بێنن [٣٤:٢٧٠] . شایەنی باسە سۆڤیەتیەکانیش دەربارەی ئەو ڕێکەوتننامەیە بەیاننامەیەکی دوور و درێژیان بۆ کرێکاران و زەحمەتکێشانی ئێران بڵاوکردەوە . بە زمانێکی توند هێرشیان کردە سەر بەریتانیە ئیمپریالیستەکان و نۆکەرانیان لە ئێران . دەسەڵاتدارانی ئێرانیان بە چەوسێنەر و بەکرێگیراو و کۆیلەی ئینگلیز ناوزەند کرد. هەروەها ئەوەی تیابوو کە حکومەتی سۆڤیەت دان بەو ڕێکەوتننامەیەدا نانێت [٨:٢١٣] .

---

* وثوق الدوله ، سەرۆکی حکومەتی ئێران ١٩١٩ ، بەریتانیەکان هێنایان بۆ ئەوەی ئەو ڕێکەوتننامەی پێ مۆربکەن ، زۆر لە سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە یەکە پیاوی ئینگلیز بووە لە ئێران ، ئینگلیزەکان بۆ ئەوەی شا ڕازی بکەن ، کابینەی حکومەت بە وثوق الدوله ڕاسپێرێ مانگانە ١٥ هەزار تۆمەنیان بۆ بڕیەوە . [٢٢:٣١٤] .

له ڕاستیدا کورد و خاکی کوردستان یەکێك بوو لە گوریەکانی ئـەم هەوڵـە سیاسـی و دیپلۆماتیکیەی ئینگلیزەکان. جگە لەوەی کـە بـەگوێرەی بـەندی یەکـەمی ئـەو ڕێکەوتننامەیـە دەبوایە ڕێز لە سەروەرێتی و سەربەخۆیی ئـێران بگـیرێ . کـە واتـای بـن دەسـت هێشتنەوەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو بـۆ ئێرانیـەکان. "ئینگلیزەکـان هـەرگیز نـەیاندەتوانی لایـەنگیری و پشـتگیری کوردسـتانی یـەکگرتوو بکـەن" [٥١:٢٧٦]. بۆیـە هـەر لەسـەرەتاوە داوایـــان لـە کوردەکانی ڕۆژهەڵات کرد "وەکو هاو وولاتیەکی دڵسۆزی ئێران بمێننەوە"[٥١:٢٧٦] .

نـارەزایی دژی ئـەو ڕێکەوتننامەیـە ئینگلیزەکـانی ترسـاند . بۆیـە هـەوڵیاندا لـەزی لـە کارەکانیـاندا بکـەن و هـەموو دەڤـەرە پەترۆلیـەکان بەیـەکتر ببەستنەوە لـە ئـابی ١٩١٩ لـە بروسکەیەکی شالیارگەی هیند هـاتووە : "پێویـسـتە هێڵـی ئاسـنی نێـوان قزلرِبـات و کفـری و کەرکوك ، بەلەزی و لەسەر بنەمایەکی ستراتیژی دابمەزرێت. سوودی دیماهی هەرچیەك دەبێـت گرنـگ نیـە، چونکـە بـە شـتێکی بنـەڕەتی دەزانـین بـۆ هێورکردنـەوە و هێشتنەوەی باشـــوری کوردستان لەبن دەستی خۆمـان " [٢٠٠:١٣٠] . مەبەسـت لـەو هێورکردنـەوەش ئـەوەبوو تـا دەوڵەتە رکابەرەکانیان دۆزی کورد نەکەنە بیانگەیەك بۆ ئەوەی خۆیان لە کاروباری ئەو دەڤەرە هەڵقورتێنن و کۆسپ لەبەردەم بەرژەوەندیەکانی ئینگلیز چێبکەن . لەلایەکی تـر ئینگلیزەکـان هەوڵیاندەدا ، فەڕەنگەکان لەو دەڤەرەدا بـە تـەواوی ئومێـد بـڕ بکـەن . لـە ١٥ ئـەیلول شـیان باشوری کوردستان بەئێجگاری لەبن دەستی فەڕەنگەکان دەربێنن . بەرامبەر ئـەو داواکاریانـەی خوارەوە ، فەڕەنگـەکان هـەندێك سـەرمایەیان لـە پـەترۆلی ئـەو دەڤـەرە – ویلایـەتی موسـڵ – دەستکەوێ بە هەموارکردنی ڕێکەوتننامەی ١٧ ئایاری ١٩١٦ . هاوکات پشتگیریەکی ڕەهای فەڕەنگەکان بکەن لەهەموو بەرهەڵسـتیەکی ئەمەریکاییـەکان. لەگـەڵ ئەمـەدا ئەگـەر سیسـتەمی مـاندات بڕیـاری لەسـەردرا ، ئـەوا دیمەشـق و حەلـەب و ئەسـکەندەروونە بکەونـە بـن مـانداتی فەڕەنگسی[٨١:٢٠٧].

ئەم پێنگاوانەی ئینگلیز تا دەهات ترسی ئەمەریکاییەکانی زێتر دەکرد . لە ٢١ تشرینی یەکەمی ١٩١٩ دا پسپۆڕێکی ئەمەریکایی یاداشتنامەیەکی دا بەکۆنگرەی ئاشتی لـە پـاریس ، تیـایدا دەیگـوت : "مونوپـۆل کردنـی کەرەسـتەکانی پـەترۆلی کوردستان (ویلایـەتی موسـڵ) کێشەیەك نیە بەتەنیا کار لە پیشەسازیەك بکات کە بـەگرنگترین پیشەسازیەکانی ئەمـەریکایی

دەژمێردرێت . بەڵکو کاریگەری لەسەر هەموو چارەسەریەکی گونجاو دەبێت ، بۆ هەموو ئەو کێشانەی لە ئەنجامی لەباریەك هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتیی عوسمانی و کۆلۆنیالە ئەڵەمانیەکان لە باشوری ئەفەریکاوە دێتە ئارا . هاوکات سیاسەتی دەروازەی والا هەڕەشەی لێ دەکرێت بەم مونۆپۆلەی کە بەریتانیەکان گەرەکیانە بەسەر کێڵگە پەترۆلیەکانی کوردستانی بسەپێنن . لەپاڵ ئەمەش ، مەترسیەکی راستەقینەی بۆ سەر پەیوەندی باشی نێوان ئەمەریکایی و بەریتانیەکان هەیە" [١٩٩:٢٠٠].

لەگەڵ ئەم ململانێیەدا ، تادەهات کەرەستەی نوێ و زێتر لە کوردستان دەدۆزرایەوە ، کە ئەمە رۆژ بە رۆژ رکابەری بۆ ئینگلیزەکان زێتر دەکرد . لە ٢ کانونی یەکەمی ١٩١٩ بریکاری فەرمانڕەوای مەدەنی ، راپۆرتێکی دەربارەی ئەو سەردانە نووسی ، کە لە رێگای ئاسمانەوە بۆ هەولێر و سلێمانی کرد . تیایدا دەیگوت: "ئەو راپۆرتە جیۆلۆجیانەی دەربارەی ئەو دەڤەرە دێت ، توانای زۆر لەوە گەورەتر وەدەردەخات کە چاوەڕوان کراو بووە" [١٩٤:٣٣] . لەگەڵ زێدەبوونی بایەخی پەترۆلی کوردستان ، پێ بەپێ بایەخی جیۆستراتیژی کوردستان زێتر وەدەردەکەوت . بۆیە بۆ خۆلادان لەو مەترسیانەی دەهاتنە ئارا ، ئینگلیزەکان لەدێو جامەیەك دەگەڕان رکابەرەکانیانی پێ فریو بدەن . هاوکات بیکەن بەبیانگەیەکی یاسایی بۆ ئەوەی لەکۆڕو کۆنگرە نێو دەوڵەتیەکان دەستی پێوە بگرن . باشترین چارەسەریش وەك ئاماژەی پێکرا دامەزراندنی چەند دەوڵەتێکی دەسکەلای خۆیان بوو . لەم بارەیەوە کرزن گوتی : "پەترۆل هی بەریتانیا نیە ، بەڵکو هی ئەو دەوڵەتە نوێیەیە کە لە میسۆپۆتامیا دادەمەزرێ !" [١٩٩:٢٤٩] . بەم جۆرە هەوڵدان بۆ دامەزراندنی چەند دەوڵەتێکی دەسکەلا ، جگە لە ململانێی پەترۆلەکە ، خاڵێکی گرنگ و بەرچاو بوو لە بایەخی جیوپۆلەتیکی کوردستان .

دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق ، واتای دابڕینی باشوری کوردستانی دەگەیاند ، هەمان راستی بۆ پارچەکانی تریش گونجاوە . بۆیە بەدڵنیاییەوە دەشێین بێژین ، بایەخی کوردستان کرۆکی زۆربەی ململانێیە گرنگەکان بوو لە رۆژهەلاتی ناڤین . هەر ململانێیەك لە ئارادابوایە بە شێوەیەك لە شێوەکان کوردستانی دەگرتەوە . بۆ وێنە ئەگەر کێشەی سنوور بوایە ، ئەوا لەبەر ئەوەی کوردستان بەسەر زۆربەی وولاتانی ئەو دەڤەرە پارڤە کرابوو ، بۆیە سنوورەکانیان لەنێو خاکی کوردستاندا بوو ، ئەگەر کێشەی ئاو هەبوایە هەمدیس کوردستانی دەگرتەوە .

ئەگەر شلەژانی ئاسایش و تێکچوونی باری ناوەخۆ بوایە ، ئەوا لە سۆنگەی بوونی کورد و بزاڤی نەتەوایەتی کورد بوو . ئەمە سەرباری ئەوەی سنووری باکوری کوردستان ، بەهۆی خەباتی نەپساوەی کورد ، دەروازەیەك بوو بۆ دزەکردنی کۆمۆنیستەکان .

ستراتیژیەتی بەریتانیا بە دامەزراندنی ئەو دەوڵەتانە زەبرێکی پشت شکێنی لە کوردستان و دۆزی کورددا . کرزن لە ٢٨ شوباتی ١٩٢٠ بەراشکاوی گوتی : "ئینگلیزەکان دوای ئەوەی پەترۆلی باشوری کوردستان (ویلایەتی موسڵ)یان وەدەست هێنا ، ئامادەن دانیشتوانەکەی لە دەست درێژی دەرەکی بپارێزن"[١٧٩:٢٥٥] . لە یەکێك لە دانیشتنەکانی ئەنجومەنی گشتی بەریتانی لۆید جۆرج گوتی : "حکومەتەکەی هەرگیز واز لە باشوری کوردستان ناهێنێ . تا ئەگەر ئەو داگیرکردنە زۆریشی تێبچێ". بیانگەشی بۆ ئەمە ئەوەبوو کەوا کێڵگە پەترۆلیەکانی توانایەکی زۆریان هەیە ، ئەمە سەرباری ئەوەی ، لۆید گوتەنی ، هەندێك کەرەستەی سروشتی وای تیابوو لە هەموو شوێنێکی تری جیهان زۆرتربوو . پاشان گوتی : واز هێنان لە باشوری کوردستان ، واتای زڤرینەوەی هۆڤیەتی و ئاژاوەیە . ئەمە جگە لەوەی ئەگەر بەریتانیا واز لەو دەڤەرە بهێنێ ، ئەوا دەوڵەتێکی تر جێگای دەگرێتەوە . ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە باری ئێستا بەردەوام دەبێ ، یاخود خراوتر دەبێت .[٢٠٣:١٩٩] . لەو سۆنگەیەش بوو کاتێك فەرەنگەکان داوایان کرد پاراستنی فەرەنگسی – بەریتانی لەسەر کوردستان رابگەیەنرێ ، ئینگلیزەکان قبوڵیان نەکرد ، پاساودانیشیان ئەوەبوو کە ئارەزوویان نیە خۆیان لە کاروباری کوردستان هەڵقورتێنن .[٥٣:٢٨٣] . کەچی لە راستەقینەدا گەرەکیان نەبوو کەسی تر پشکداری ئەو دەستکەوتەیان بکات . ئەمە وایدەکرد ئەو کۆبونەوانەی لەم بارەیەوە گرێ دەدران هەرگیز نەگەنە ئەنجام . لەو کۆبونەوەی کە لە ١٣ نیسانی ١٩٢٠ لەژێر ناوی کوردستان و میسوپۆتامیا گرێدەدرا ، کرزن دەربارەی ئەم دۆزە گوتی: "ئەم کۆنگرەیە سێ چوار کۆبونەوەی تایبەت بە کوردستانی ئەنجامداوە ، بەدرێژایی رێگا گەیشتونەتە ئەنجامی ناکۆك و دژ بەیەك . ئەمەش لە هەڵەی کۆنگرەوە سەرچاوەی نەگرتووە ، بەڵکو لەسۆنگەی ئەو گۆڕانە بەلەزانەیە کە بەسەر کاودانەکە دادێت" [٩٣:٢٨٤] . وەڵێ سەرباری ئەو ناکۆکیانە ، لەو کۆنگرەیەی کە لە شاری (سان ریمۆ)ی ئیتالیا لە ١٩–٢٦ نیسان گرێدرا ، کە نوێنەرانی فەرەنگسا و بەریتانیا و ئیتالیا و ژاپۆن بەشداریان کرد ، لەگەڵ زێرەڤانێکی ئەمەریکی [١١٦:٢٣٧] . رێکەوتننامەیەکی پەترۆلی لە نێوان ئینگلیز و فەرەنگەکان گرێدرا. سەیر

لەوەدایە کاتێك بەریتانی و فەڕەنگەکان بە نهێنی کاریان بۆ گرێدانی ئەو ڕێکەوتننامەیە دەکرد، دەربارەی پەترۆڵی کوردستان ، هاوکات بەریتانیەکان لەسەر هەمان بابەت بەنهێنی نامەیان لەگەڵ ئیتاڵیەکان دەگۆڕیەوە ! بۆیە ئیتاڵیەکان سەرسام بوون ، کاتێك هەواڵی ڕێکەوتننامەی (سان ڕیمۆ)یان لە نێوان ئینگلیز و فەڕەنگەکان ژنەوت ، هەستیان کرد ئەو ڕێکەوتننامەیە دەبێتە ئەگەری دابینکردنی نیوەی پەترۆڵی جیهان بۆ ئینگلیز و فەڕەنگەکان . بۆیە ڕایانگەیاند کە ئەم ڕێکەوتننامەیە نەك تەنیا دژی خاڵەکانی (کۆمەڵەی گەلان)ە ، بەڵکو هەڕەشەیەکی توندە بۆ سەر دابینکردنی سەرچاوەکانی پەترۆل بۆ ئیتاڵیا . نووسینگەی هەندەرانی بەریتانی بەنهێنی ئەوەی درکاند کە لە باوەڕەدایە داواکاریەکانی ئەمەریکا بۆ هاوبەش بوون لە بەرژەوەندیەکان ، وایکردووە ئیتاڵیا ئەم داواکاریانە پێشکەش بکات . [٣٣٩:١٤٨-١٤٩] . هاوکات لە کۆنگرەی گەلانی ڕۆژهەلاتیش لە باکۆ دەنگیان بەرزکردەوەو نارەزاییان دەربڕی ، کەوا ئینگلیز هەموو بیرە پەترۆلیەکانی میسوپۆتامیا ، تاکە سامانێك کە عەرەبی میسوپۆتامیا هەیانە ، بۆ خۆیان بردووە!!![٢٢٧:٦٦-٦٧] .

شایەنی باسە هەر لە (سان ڕیمۆ) سیستەمی ماندات بڕیاری لەسەر درا ، کە بەگوێرەی ئەو سیستەمە بەشێکی زۆری کوردستان کەوتە بن منداتی ئینگلیزی _ فەڕەنگسی . لە ڕاپۆرتی ساڵانەی بەریتانیەکان بۆ ساڵی ١٩٢٢-١٩٢٣ دا هاتووە: "کاتێك خاوەن شکۆ ڕەزامەندی لەسەر منداتی میسوپۆتامیا دەربڕی ، لەو کاتەدا پەیماننامەی سیڤەر ، درا بە شالیارگەی هەندەرانی تورکی " [٢٦٧:١٨٥] . لە ڕاستیدا سیستەمی ماندات وەك (کیرك) دەڵێ : "تەنیا درۆیەکی بەئەدەبانە بوو بۆ ڕازیکردنی سەرۆك ویلسن و ئەو تیورانەی (کۆمەڵەی گەلان) داینابوو " [١٥٧:٢٠٠] . بەپێی سیستەمی ماندات ، بەشێکی ڕۆژئاوای کوردستان کەوتە بەر منداتی فەڕەنگەکان . کە ئەو ناوچانە وەك (کینان) دەڵێ : ڕاست یان چەوت وادەزانرا پەترۆلیان تێدایە، ئەمەش دەبووە ئەگەری ئەوەی فەڕەنگەکان کاریگەریان لەسەر چاڵە پەترۆلیەکانی نزیك موسڵ و کەرکوك هەبێت [٣٤٢:٢٣] .

لەم کاودانەدا هەواڵی ڕێکەوتننامەی (سان ڕیمۆ) گەیشتە ئەمەریکاییەکان . نوێنەری کۆمپانیای ستاندارد نیوجرسی ، توانی بەنهێنی دانەیەکی ئەم ڕێکەوتننامەیە دەست بخاو پاشان لە ڕۆژنامەدا بلاوی کردەوە . بۆیە هەستی دژ بە بەریتانیەکان بزواو بەوە تاوانباریان کرد کە گیانی سەربازی و دەست بەسەرداگرتنی کێڵگە پەترۆلیەکانی ئاسیایان هەیە . هەردوو

حکومەت زۆر یاداشتنامەی توندیان ئالوگۆڕ کرد، ململانێیەکی دیپلوماتیکی وایان لە نێوان دایسا ، کە بە توندترین ناکۆکی دادەنرێ لە مێژووی ئیمپریالیزمی ئابووری. تەنگژەکەی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە گەیشتە ئەو رادەیەی خەڵك باسی جەنگیان دەکرد. تەنانەت لە ئەنجومەنی گشتی بەریتانی گفتوگۆ لەسەر کەشتیگەلی بەریتانی کرا ، لەگەڵ باری کەشتیەکان بەگوێرەی کەشتیگەلی ئەمەریکایی . ئەمەریکاییەکان لەم ململانێیەدا پێیان لەسەر دەروازەی والا (الباب المفتوح) دادەگرت . [٣٧:٢٧٠] . دەربارەی ئەم هەڵوێستە توندەی ئەمەریکی رۆژنامەکانی فەرەنگ و ئینگلیزەکان نووسیان: "چڕی خوێن لەئاو زێترە ، وەلێ وادیارە لای ئەمەریکاییەکان پەترۆل چڕی لەخوێن زێترە" [١١٧:٢٣٧] . بەریتانیەکان بۆ چارەسەرکردنی ئەم تەنگژەیەو خۆ دەربازکردن لەو ململانێیەدا ، هانی (فەیسەڵ)یان دا سەردانی عێراق بکات و خۆی وەکو پاشایەك بخاتە روو . دوای ئەوە هیچ ناڕەزاییەك دەربارەی هەڵبژاردنی نەوروژێنرێ ! [٢١٣:١٨٨] . ئەمەش ئەوە رووندەکاتەوە ، ئینگلیزەکان زیرەکانە کاودانەکەیان هەڵدەسەنگاند و بەردەوام کاریان بۆ چێکردنی ئەو پشتێنەیە دەکرد کە لەچوار دەوری چاڵە پەترۆلیەکانی بکێشن . بۆیە دەبینین دوای ئەم پێواژۆکە ، وورده ووردە چەند دەوڵەتێکی ناوچەیی ، وەکو تورکیا و ئێران و عێراق لەسەر گۆڕەپانە سەریان بەرزدەکەنەوە و رۆڵیان زێتر دەبێت . لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٠ حکومەتێکی کاتیان لە عێراق دامەزراند و هەر لەو ماوەیەشدا باڵوێزی بەریتانی بە مستەفا کەمالی گوت ؛ "لە تواناددا هەیە چارەسەریەکی گونجاوی دۆزی کوردستان و ئەرمەنستان و ئەزمیر بکرێت !!!" [٤٣:٢٦١] . هاوکات لە ئێرانیش رێگایان بۆ هاتنی رەزاخان خۆشکرد. وەك چەرچل دوای شانزەساڵ گوتی : "ئێمە خۆمان هێنامانە سەرتەخت و خۆشمان لاماندا !" [١٢٣:٩٦] . لەگەڵ بەرزبوونەوەی ئەو دەوڵەتانەش ، کێشەی باشوری کوردستان ، کە بە کێشەی موسڵ ناوزەند دەکرا ، بەرزبووەوە ، چونکە ، وەك لەمەوبەر ئامازەی پێکرا ، باشوری کوردستان بە گوێرەی ستراتیژی و بەرژەوەندی بەریتانیەکان بایەخێکی تایبەتی هەبوو . بۆیە لە پەیمانی (سیڤەر)یش شوێنێکی پاشکۆیی پێدرابوو ، ئەمەش سیاسەتی راستەقینەی بەریتانیەکانی دەردەخست ، کە هەرگیز ئامادە نەبوون دەست بەرداری ئەو بەشە گرنگەی کوردستان بن .

شایەنی ئامازە پێکردنە ، بەندەکانی ٣١٠- ٣١٥ لە پەیماننامەی سیڤەرتایبەتن بە پەترۆل ، بەتایبەتی پەترۆلی کوردستان . بۆ وێنە لە بەندی ٣١١ دا هاتووە : "ئەو کۆمپانیایەی بەر لە تشرینی یەکەمی ١٩١٤ جیاوکی پەترۆلیان بەرێگایەکی یاسایی وەرگرتووە ، رێگایان

پێدەدرێ هەموو مافەکانی خۆیان بپارێزن . ئەو مافانەشیان بۆ دابین بکرێ کەپێشتر لەسەری ڕێکەوتبوون" [٨٢:٢٧٥] . ئەم بەندە زێتر بەریتانی و فەڕەنگسیەکانی دەگرتەوە ، بەپلەی یەکەمیش بەریتانیەکان . کەواتە ئەوەی خۆی بە بەشخوراو دەزانی ئەمەریکاییەکان بوون . لەو نامەیەی کە لە ٢٠ تشرینی دووەمی ١٩٢٠ بۆ شالیاری هەندەرانی بەریتانیایان نارد تیایدا دەیانگوت : "ناتوانین نکوڵی لەوە بکەین کە هەواڵ و دەنگ و باسی سەرچاوەکانی پەترۆل لە کوردستان – ویلایەتی موسڵ – وەکو بابەتێکی ململانێی ئابووری ، ڕای گشتی وولاتە یەکگرتوەکان و بەریتانیا و وولاتانی تری خەریك کردووە . بەم پێودانگە ، ئەم سەرچاوانە بوونە دۆزێکی ئابووری هەڵپەسێرراو، کە سیستەمی مانداتی لە پێناو دانراوە . ئەو تاقیکردنەوەیە دەوەستێتە سەر نیازپاکی ئەو نەتەوانەی ڕەزامەندیان لەسەر ئەم پرەنسیپە دەربڕیوە" [٩٢:٢٣١] . لەپاڵ ئەمەدا ئەمەریکاییەکان هەوڵیاندا لە دەروازەیەکی ترەوە خۆیان بخزێننە نێو ململانێیەکەوە . لە تشرینی دووەمی ١٩٢٠ واشنگتۆن ئامادەیی خۆی نیشان دا قەرزێك بداتە ئێران . تابتوانێ بەرەنگاری فشاری دارایی و ئابووری بەریتانیەکان بێتەوە . بارتەقای ئەمەش ، ئێران جیاوکی پەترۆل بداتە کۆمپانیا پەترۆلیەکانی ئەمەریکایی . کە ئەمە بەگوێرەی ئەمەریکاییەکان دۆزێکی زۆرگرنگ بوو . پێویستی بە سەرلەنوێ دارشتنەوەی سیاسەتێکی بەرفراوان هەبوو ، لە سۆنگەی سیاسەتی بەریتانیەکان لە ئێران . [١٠٧:٩٥] . ئەوەی زێتر یارمەتی ئەمەریکاییەکانی دەدا لەو دەروازەیەوە بێنە ژوورەوە ، کزبوونی هەڵوێستی بەریتانیەکان بوو لە ئێران دوای ڕێکەوتننامەی ٩ ئابی ١٩١٩ . ئێرانیەکان خۆشیان ئارەزووی ڕاکێشانی دەستی ئەمەریکاییەکانیان هەبوو . بۆ ئەم مەبەستەش نێردەیەکیان نادرە واشنگتۆن، تا بۆ وەبەرهێنانی پەترۆلەکانی ناوچەکانی باکور ، لەگەڵ کۆمپانیا ئەمەریکاییەکان ڕێکەوێ و هاوکات هەندێك قەرز وەدەست بێنن . [١٤٤:٢٣٥]. کۆمپانیای ئەنگلۆ – فارسی بەتوندی بەرهەڵستی ئەو پێنگاوەی کرد. سۆڤیەتیەکانیش لەلای خۆیانەوە دژی وەستان ، بۆیە ئێرانیەکان ناچاربوون ئەو جیاوکانە بکێشنەوە . [١٥٣:١٢٢] . ئەمە ئەوەی نیشاندەدا کە ئەمەریکاییەکان ڕۆژ بەرۆژ ڕۆڵیان زێتر و مەزنتر دەبوو لە گۆڕەپانی ململانێی نێو دەوڵەتی لەسەر پەترۆلی ڕۆژهەلاتی ناڤین بەگشتی و پەترۆلی کوردستان بە تایبەتی . بۆیە ئینگلیزەکان گەرەکیان بوو پلانەکانی خۆیان بەلەزی ئەنجام بدەن . وەك یەکێك لە نوسەرە بەریتانیەکان نووسیویەتی : "سیاسەتی پەترۆلی کۆمپانیای پەترۆلی ئەنگلو –

فارسی و سیاسەتی هەندەرانی بەریتانیای مەزن ، پێویستیان بەوەهەبوو شانشینی عێراق لەو سنوورەیدا دابمەزرێ" [٥٤:٢٥٥]. هاوکات لە ڕێگای هێنانی فەیسەڵ ، دەیانویست ئەژواریەکان لە خۆیان دووربخەنەوە . سەرباری ئەو هەولانەش ، وەك دواتر لە گۆڤاری (النیوز پیلك) هاتبوو ، شالیارگەی هەندەرانی ئەمەریکا بۆ هاوکوفە بەریتانیەکەی روونکردەوە، کە "ناشێ وولاتە یەکگرتوەکان لە دەرەوەی وەبەرهێنانی کێڵگە پەترۆلیەکانی باشوری کوردستان بهێلرێتەوە" [٢٨٨:٢٢٣] . ئەمە تارادەیەك ئینگلیزەکانی خاترجەم کرد ، کە ناتوانن دیماهی بەو ئاژواریانە بهێنن ، تا ئەمەریکاییەکان بەشداری لە پەترۆلی کوردستان نەکەن [٤٧:٢٧٠-٤٨] . بۆیە کەوتنە هەولی خۆنزیك کردنەوە لێیان. لە سالی ١٩٢٢ کۆمپانیا پەترۆلیەکانی ئەو وولاتەیان بانگهێشت کرد بۆ ئەوەی بەشداری لە کۆمپانیای پەترۆلی تورکی بکەن . وەلێ دەستەی کۆمپانیا ئەمەریکاییەکان N.E.D.C لەسەر ئەوە مکوڕ بوو کە ئەویش سایەی کۆمپانیای ئەنگلو – ئێرانی و کۆمپانیای رویال دویچ R.Dutch – Shell Company و کۆمپانیای پەترۆلی فەرەنگسی پێویستە پشکداریەکی تەواو بکەن . کە ئەمەش دەبووە سۆنگەی ئەوەی گۆڕان لە چۆنیەتی پارڤەکردنی پشکەکانی کۆمپانیای پەترۆلی تورکی روودات . بۆیە لە دیماهیدا گەیشتنە ئەو بڕیارەی کە کۆمپانیای ئەنگلو – ئێرانی ، پێویستە دەستکاری بکرێت [٢٣١:١٠٠-١٠١].

ئەمەریکاییەکان لە ئابی ١٩٢٢ نێردەیەکیان بە سەرۆکایەتی ئابووری زان (**ئارپەر** میلیسوگ) ناردە ئێران ، تا یارمەتی ئێرانیەکان بدەن لە رێکخستنەوەی باری دارایی و سوپاکەیان . رەزاخان شێگیرانە پاڵپشتی ئەو نێردەیەی دەکرد . تەنانەت کاتێك بوو بە سەرۆك شالیاران ، هەموو ئەو شالیارانەی لادا کە دژی نێردەکە بوون . شایەنی باسە نێردەکە داوای ئەوەی دەکرد کە پێویستە پشکی ئەمەریکی لە کۆمپانیای ئەنگلو – فارسی زێدەبکرێ . [١٥٣:١٢٢]. دوای ئەوە ، کاتێك لە تشرینی دووەمی ١٩٢٢ کۆنگرەی لۆزان دەستی پێکرد، لە چوارەم رۆژی کۆبونەوەکەدا ئەمەریکاییەکان خۆیان تێ هەڵقورتاند و داوای ئەوەیان کرد گفتوگۆ لەسەر پەترۆلی کوردستان – ویلایەتی موسل – بکرێت. ئەو خۆتێ هەڵقورتاندنەش لەبەرژەوەندی تورکەکان دابوو . بۆیە رازی نەبوون جیاوکی کۆمپانیای پەترۆلی تورکی نوێ بکەنەوە . بۆ ئەوەی هەلێك بۆ ئەمەریکاییەکان برەخسێنن ، تا پشکێك لەو کۆمپانیایە وەدەست بێنن و لەم ململانێیەدا بۆ خۆیانی رابکێشن [٢٧٦:٣٢-٣٣]. لەو

کاتەدا تورکەکان سیاسەتی ئەوەیان بەرامبەر هاوپەیمانان پیادە دەکرد ، کە وازی بە کارتی ئەمەریکی بکەن . بە تایبەتی بەهۆی بەرژەوەندیە ئابووری و پێویستیە پەترۆلیەکانی ئەمەریکاییەکان [١١٤:٣٣٦].

ئەو هەولانە مەترسی بۆ ئینگلیزەکان و دەسکەلاکانی لە ناوچەکەدا هەبوو . بۆیە لەو کاتەدا لێپرسراوە بەریتانیەکان رایانگەیاند کە پەترۆل هیچ پەیوەندیەکی بە داواکانی بەریتانیا نیە بۆ لکاندنی باشوری کوردستان بە میسۆپۆتامیا . بەڵکو تەنیا لەبەر بەڵێنێکە ئینگلیزەکان بە کۆمەڵەی گەلان و شا فەیسەڵ و خەڵکی عێراقیان داوە ! [٢١٦:٣١٤] . نەك بەریتانیەکان بەڵکو رۆژنامە عەرەبیە عێراقیەکانیش تەنگەتاو بوون . رۆژنامەی (العاصمە البغدادیە) لە سەرووتاری ژمارەی ٧ کانونی یەکەمی ١٩٢٢ نووسیبوی : "واباشە ئێمە ووتەیەك ئاراستەی هاوپەیمانان بکەین لە کۆنگرەی لۆزان ، ئەوان هەڵەیەکی گەورە دەکەن گەر لەو بڕوایە دابن بە رێکەوتن لەگەڵ مستەفا کەمال و حکومەتەکەی بیرە پەترۆلیەکانی عێراق پارڤەبکەن . چونکە عێراقیەکان جیاوازی ناکەن لە نێوان تورکیا و خەڵکانی تر بەرامبەر ژیان و بەرژەوەندیەکانی تری عێراقیەکان . ئەوەی دەست درێژی بکاتە سەر بیرە پەترۆلەکان ، عێراقیەکان بە دوژمنێکی سەرسەختی خۆیانی دەزانن ، جیاوازیش لەمەدا نیە لە نێوان مستەفا کەمال و هاردنگ و کرزن و پوانکاری"[٢٩٤:١٩٩]. دیارە ئەو نووسینانەی رۆژنامەکانی عێراق بە فیتی ئینگلیزەکان بووە ، کە دەیانویست هەموو گومانێك لە خۆیان دووربخەنەوە و خۆیان وەك داکۆکی کەرێك لە گەلێکی خاوەن ماف نیشان بدەن !

ئەو ئەژواری و ناکۆکیانە ، ئەوە دەردەخەن کەوا دۆزی باشوری کوردستان دۆزێکی سەخت و ئاڵۆز بوو . پلان و دەست تێوەردانی زۆری لە دواوە بوو . بەپلەی یەکەم لە نێوان ئینگلیز و فەرەنگەکان ، دواتر لە نێوان ئینگلیز و ئەمەریکاییەکان . بەشێوەیەکی ناراستەوخۆش پەیوەندی بە سۆڤیەتیەکانەوە هەبوو . کە بە هەموو جۆرێك پشتگیری تورکەکانیان دەکرد بۆ گەڕاندنەوەی باشوری کوردستان . [٢٣٠:١٠٧] . وەلێ ئینگلیز و فەرەنگەکان چارەسەری کێشەکانی نێوان خۆیان کرد . بۆیە کاتێك تورکەکان لە کۆنگرەی لۆزان هەوڵیاندا فەرەنگەکان بۆ لای خۆیان رابکێشن ، وەرامیان دانەوە کەباشتر وایە لەگەڵ ئینگلیزەکان رێکەون. ئەگینا هەر ناکۆکیەك لە نێوان تورك و ئینگلیزەکان بێتەئارا ، ئەوان لایەنگری ئینگلیزەکان دەکەن [١١٩:٣٣٦]. سیاسەتوانانە ئینگلیزەکان توانیان تارادەیەك

ئیتاڵیەکانیش فریو بدەن ، لە ١٩٢٢/١٢/١٦ کرزن رایگەیاند کە دوای یەکلایی کردنەوەی دۆزی موسڵ ، ئیتاڵیا لە سوود و بەرژەوەندیە پەترۆلیەکانی ئەو دەڤەرە بەشدار دەبێت . پاشان مۆسۆلینی داوای کرد بەشداری ئیتاڵیا لە پەترۆلی کوردستان مسۆگەر بکرێت . هەروەها داوای کرد عێراق رازی بکەن بۆ ئەوەی زەویان بۆ ئەم مەبەستە بۆ تەرخان بکات . کرزن ئەو دەمە بەراشکاویەوە گوتی : "موسولینی پیاوێکی سیاسی نیە" [٣٣٩:١٥٧-١٥٨] . لەپاڵ ئەمەدا ئینگلیزەکان هەوڵیاندەدا حکومەتە دەسکەلاکەی خۆشیان لە عێراق رازی بکەن بۆ ئەوەی دەست بەرداری ئەو پشکە بێت کە لە کۆنگرەی (سان ریمۆ) بڕیاری لەسەر درابوو . پێیان گوتن : "داننان بە سەروەریێتی عێراق لە باشوری کوردستان ئەم گوریە دەهێنێ ، عێراق قازانجی لەوەدایە زێتر بایەخ بە سەروەریێتی بدات نەك بە پشکی پەترۆل" [٢٧٠:٦٠] . وەلێ وادیاربوو ئەمەریکاییەکان لەوە زۆرزانتر بوون بە ئاسانی فریو بخۆن و بەکەم رازی بن . لە ٢٣ کانونی دووەمی ١٩٢٣ ، شاندی ئەمەریکا بەیاننامەیەکیان خستە بەردەم لێژنەی سەربازی و هەرێمی ، تیایدا ناڕەزاییەکی توندیان دەربارەی وەبەرهێنانی سامانەکانی باشوری کوردستان دەربڕی و داوای پیادەکردنی سیاسەتی دەروازەی والآیان کرد [٢٧٢:٢٤٠] . هەرچی تورکەکان بوون ئەگەرچی لەناو هۆڵی کۆنگرە رکابەری ئینگلیزەکان بوون ، بەنهێنی هەوڵیاندەدا دەمی کۆمپانیا ئینگلیزیەکان چەور بکەن . کرزن کە ئاگاداری هەموو شتێك بوو ، لە دانیشتنێکا ئەندامانی کۆنگرەی دوچاری حەپەسان کرد ، کاتێك بەراشکاوی گوتی : "لە کاتێکدا کۆنگرە دەربارەی کێشەی موسل دانیشتنەکانی خۆی ئەنجام دەدا ، شاندی تورکی لە دواوە نوێنەری دەنێرێتە لەندەن ، بۆ ئەوەی سەودا لەگەڵ خودانی جیاوکەکانی کۆمپانیای پەترۆلی تورکی بکەن، بۆ ئەوەی جیاوکی تریان لە پەترۆلی موسڵ بدەنێ ، کە هی خۆیان نیە !!!" [٢٠٠:١٧-١٨].

داوی ئەوەی قۆناغی یەکەمی کۆنگرەی لۆزان نوشستی هێنا ، تورکەکان هەمدیس ویستیان سوود لە بەرهەڵستی و داواکاریەکانی ئەمەریکاییەکان وەربگرن . لە ١٠ نیسانی ١٩٢٣ ئەنجومەنی بالآی نەتەوایەتی تورك باوەڕی خۆیدا بە جیاوکی چیستەر [٢٧٠:٦٢] . بە جۆرێك کە سێ بەقەدەر جیاوکە بنەڕەتیەکە بوو[٢٧٢:٢٤٢] . شایەنی باسە فەڕەنگەکان بۆ قبووڵ کردنی جیاوکی چیستەر ، داوایان کرد ئەو جیاوکانەیان بدرێتەوە کە بەر لەجەنگ لەو دەڤەرە وەدەستیان هێنابوو [٣١٤:٢٠٣]. ئەمەریکاییەکان کە ئەم هەڵویستەیان بینی ، بەخ بوون و زێتر پێیان لەسەر سیاسەتی دەروازەی والآ داگرت .

ئینگلیزەکان جگە لەوەی بەنهێنی کاریان بۆ ئەوە دەکرد لە ئەمەریکاییەکان نزیک ببنەوە ، هەوڵیاندەدا لە تورکەکانیش بچنە پێش . لەو کاتەدا جافەر عەسکەری بە ئینۆنۆی گوت : "هەڵویستی توندی تورکەکان وادەکا ئەوان زێتر بچنە هەمێزی ئینگلیزەکانەوە . وەڵێ ئەگەر تورکەکان نەختێك نەرمی بنوێنن ، ئەوا هەرگیز چاکەیان لەیاد ناکەن" [٧٣:٩٠]. لە راستیدا بێ ئەگەر نەبوو تورکەکان ئەو هەڵوێستە توندەیان دەنواند بەرامبەر دۆزی باشوری کوردستان . کاودانە نێو دەوڵەتیەکە تارادەیەك لە بەرژەوەندی ئەواندا بوو . لە روخسارەوە ، وادیاربوو ئینگلیزەکان بەتەنیا لە گۆڕەپانەکە دەمێننەوە . ئەمەریکاییەکان لەسەر داواکانی خۆیان مکوڕبوون . فەڕەنگەکان کە لەو کاتەدا هەرێمی (روهەر)ی ئەڵەمانیان داگیر کردبوو، لە هەڵوێستی نادۆستانەی ئینگلیزەکان بەرامبەر ئەم داگیر کردنە زویر ببوون . بۆیە کاتێ کرزن وێنەیەکی لە رێکەوتننامەی ئاشتی دا بە تورکەکان و مۆڵەتی دانێ کە بۆ ماوەی پێنج رۆژ قبووڵی بکەن ، مسیو رومپارد M.Rompard نوێنەری فەڕەنگ، چاوی بە عیسمەت پاشا کەوت و تێی گەیاند کەوا حکومەتەکەی هیچ لاریەکی نیە ئەگەر تورکیا داوای هەمموارکردنی شێوازی ئاگادارکردنەوەکە بکات ، بۆیە کاتێك ماوەی دیاریکراو بەسەرچوو ، عیسمەت ئاگادارکردنەوەکەی رەتکردەوە . [١٧١:١٢٩].

ئینگلیزەکان دەبوایە لە دوو بەرەوە بجەنگن . بەرەی نێو دەوڵەتی و پتەوکردنی بەرەی ناوەخۆ ، کە بەهۆی بەردەوامی راپەڕینەکانی کورد هەمیشە لە شلەژان بوو . بۆیە سیاسەتی قامچی و کێکیان پیادە کرد ، لەلایەك هەوڵیاندا هەڕەشە لە بەرژەوەندیەکانی فەڕەنگ و ئەمەریکاییەکان بکەن ، لەلایەکی تر ویستیان دەمیان چەوربکەن . ئەوەبوو شالیاری کۆلۆنیالەکان گوتی : "فەڕەنگ و ئەمەریکاییەکان ناتوانن زۆر لە عێراق بکەن واز لە مافەکانی خۆی بێنێ لە بەشداربوونی کۆمپانیای پەترۆڵی تورکی ، ئەگەر لایەنگیری عێراق نەکەن لە کێشەی باشوری کوردستان - کێشەی موسل - [٢٧٠:١١٧-١١٨] . هەرچی دەربارەی بەرەی ناوەخۆ بوو ، کوشتاری ئاسوریەکانیان لە کەرکوك قۆستەوە ، کە لە ئایاری ١٩٢٤ لە کەرکوك روویدا و ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك کوژرا ، بۆ ئەوەی کەرکوك ، شاری دەوڵەمەند و مەڵبەندی پەترۆڵی کوردستان ، بەشێوەیەکی راستەوخۆ بخەنە بن بەڕێوەبەرایەتی حکومەتی عێراق . [٢٩:٢٠٨] . هاوکات بڕیاری دەرکردنی شێخ مەحمودیان دا لە سلێمانی . دوای ئەوەی لە ١٩ ئایار کۆنگرەی قوستەنتینە دەستی پێکرد ، فڕۆکەکانی ئینگلیز بەیاننامەیەکیان

فرێدایە ناوشاری سلێمانی و داوایان لە شێخ مەحمود کرد تا رۆژی ۱۹۲٤/٥/۲۲ بەبێ دواکەوتن یان بچێتە کەرکوك یا بەغدا . [۳۸:۱۱٤] . هەروەها سەرباری ئەو ئەستەنگە دارایبانەی رووبەڕوویان دەبوەوە، هەوڵیاندا هەموو دەڤەرەکە بە تۆڕێکی هێڵی ئاسنی بەیەکتر ببەستنەوە . بۆیە لەو یاداشتنامەیەی سکرتێری کۆمیساری باڵا لە ۲٤ تشرینی دووەمی ۱۹۲٤ بۆ سکرتێری ئەنجومەنی شالیارانی ناردووە ، تیایدا دەڵێ : "کۆمیساری باڵا فەرمانی پێکردم پێتان رابگەینم ، لە کاتی سەردانەکەی بۆ سلێمانی ، بینیویە راکێشانی هێڵەکە بۆ کەرکوك کاریگەریەکی گرنگی لە هەموو باشوری کوردستان هەبووە. وای لە خەڵکەکە کردووە گومانیان نەمێنێ کۆمەڵەی گەلان ئەو ناوچەیە بە میسۆپۆتامیاوە دەلکێنێ . وەڵێ ئەگەر کارەکە بەهۆی ئەژواری داراییەوە پەکی بکەوێ ، ئەوا کاریگەریەکی پێچەوانەی دەبێ!". لەسەر ئەو بنەمایە لە کانونی یەکەمی هەمان ساڵدا ، ئەنجومەنی شالیارانی عێراق ، بڕیاریدا پێویستە هەر چۆنێك بێت لەزی بکرێت لە راکێشانی ئەو هێڵە بۆ کەرکوك . [۵۸:۲۳٦]. دوای ئەوەی ئینگلیزەکان ئەم کارانەیان ئەنجامدا، بێباك بوون لە هەڵوێستی نێو خۆو نێو دەوڵەتیی .

لەو کاتەدا کۆمەڵەی گەلان لیژنەیەکیان پێکهێنا بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەی باشوری کوردستان (ویلایەتی موسل) . لیژنەکە لە ۲۷ کانونی دووەمی ۱۹۲۵ دەستی بەڕاپرسی خەڵکەکە کرد . حکومەتی عێراق ئەوەی بۆ دەرکەوت ئەگەر جیاوکی پەترۆل نەداتە کۆمپانیای پەترۆلی تورکی ، ئەوا کۆمەڵەی گەلان رێگا نادات باشوری کوردستان وەك بەشێك لە عێراق بمێنێتەوە . [۲٤۹:۱۸٦] . هەروەها وەك لەو نامەیەی کۆمیساری باڵا، کە لە ۱۷ شوبات بۆ شالیارگەی کۆلۆنیالەکانی ناردووە، هاتووە : "ئەو راستیەی ئاشکرابوو ئەوەیە ، کەوا پۆلس، یەکێك لە ئەندامانی لیژنەکە بەرلەوەی بەغدا جێبهێڵێ بە شالیاری دارایی راگەیاندووە هەر لایەك جیاوکی پەترۆل بداتە کۆمپانیای پەترۆلی تورکی ، باشوری کوردستان بۆ ئەو دەبێت. منیش بەراشکاوی گوتم: ئەگەر حکومەتی عێراقی لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی کەم و کوڕی بنوێنێ!!! بەنەزانیەوە پێ لەسەر رەتکردنەوەی ئەم جیاوکە دابگرێ ، واچاوەڕوان دەکەم لەم کاودانەدا بەریتانیا بایەخی بەدوارۆژی عێراق گوم دەکا ، ئەرکەکانی خۆی لەسەر چەند مەرجێکی بچووك دەهێڵێتەوە کە رێکەوتننامەی عێراقی - بەریتانی لەسەری چەسپاندووە" [٤٤:۳۱۱] . لە راستیدا ئەمە زێتر بۆ ترساندنی حکومەتی عێراقی بوو ، لەلایەکی تر گەرەکیان بوو لایەنە ستراتیژیەکەی کوردستان بشارنەوە ، ئەگینا وەك زۆر سەرچاوە ئاماژەی

پێدەکەن ، لەو کاتەدا تورکیا ئامادەیی خۆی نیشاندا کە ئەگەر باشوری کوردستانی بدرێتێ ، ئامادەیە دەست بەرداری هەموو جیاوکێکی پەترۆلی بێت ، هەروەها رایگەیاند کە ئەوان بە تەنیا کوردیان گەرەکە !

پلانی بەریتانیەکان بۆ ترساندنی حکومەتی عێراقی سەرکەوتنی وەدەست هێنا ، حکومەتی عێراقی رازی بوو، و جیاوکەکەی واژۆ کرد. کاتێکیش رەخنە لە حکومەتەکەی یاسین هاشمی گیرا دەربارەی ئەم کارەی ، گوتی : "رەتکردنەوەی ئەم جیاوکە دەبووە سۆنگەی ئەوەی کۆمپانیا پەترۆلیە خاوەن نفوزەکان پشتگیری تورکەکان بکەن لە داواکردنی ویلایەتی موسڵ" [٢٥٧:١٨٦] . تەنیا حەوت رۆژ دوای واژۆ کردنی جیاوکەکە ، هێزی ئاسمانی بەریتانی دەستی بە هێرشێکی بەرفراوان کرد بۆ سەر لایەنگرانی شێخ مەحمود . بۆ ئەوەی کاودانێکی لەبار بۆ کۆمپانیاکە بێتە ئارا ، تابتوانێ چالاکیەکانی خۆی ئەنجام بداو خاوەن بەرژەوەندیە پەترۆلیەکانیش لەسەرمایەکانیان دڵنیا بکاتەوە" [١٢١:٢٧٠] . هاوکات شالیاری کۆلۆنیاکان و شالیاری فرۆکەوانی ، سەردانی موسڵ و کەرکوك و سلێمانیان کرد . کاتێك لە دانیشتنی ٩ نیسانی ئەنجومەنی گشتی بەریتانی ئەم سەردانە بووە جێگەی مشت ومڕو گفتوگۆ ، لە وەرامدا گوتیان : "ئەو گەشتە بۆ گەڕان بوو بەدوای مەڵبەندێکی بەرگری سیاسی لەو شوێنە ، لەگەڵ هەندێك ئەژواری تر کە زۆر پێویست بوون و جێگای بایەخی حکومەتی بەریتانیایە" [١١٨:٢٠١-١١٩] . بەم جۆرە ئینگلیزەکان سەودایان لەگەڵ تورکەکان کرد . کە ئەوان کوردەکانی باکور بدەنە تورکەکان ، بارتەقای ئەمەش ئەوان واز لە باشوری کوردستان بێنن بۆ عێراق ، لە هەمان کاتدا رێگا بە هێزە رۆژئاواییەکان بدەن بنکەی سەربازی لەناو خاکی تورکیا دابمەزرێنن بۆ پارێزگاری کردنی پەترۆل لە مەترسی کۆمونیستەکان ! [١٤:٢٣٩] .

دوای ئەوەی باشوری کوردستان بە میسۆپۆتامیاوە لکێنرا ، ململانێیەکە هێور بووەوە ، وەلێ دیماهی نەهات. هەڵقولانی پەترۆلی بابەگوڕگوڕ لە ١٥ تشرینی یەکەمی ١٩٢٧ ململانێی سەر پەترۆلی کوردستانی چڕتر کردەوە . هەر لەم ماوەیەدا لیژنەیەکی فەڕەنگسی نەخشەیەکی رۆژهەڵاتی ناڤینی کێشا ، ناوچەکانی کوردستان و عەرەبستان کە دەکەوتنە ناو چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیەوە ، بە هێڵی سوور کێشا ، نیازی فەڕەنگەکانیش لەمەدا ئەوەبوو یەك دەنگیەك چێبکەن لەو جیاوکە پەترۆلیە نوێیانەی لەو چوارچێوەیەدا وەدست دەهات . دوای

دانوستانێکی زۆریش گەیشتنە ئەوەی دەروازەی سیاسەتی دەروازەی والآی ئەمەریکاییەکان دابخەن . [۱۱۷:۱٦۱] . ئەو رێکەوتننامەیەش بە رێکەوتننامەی هێلی سوور ناسرا . ئەمەریکاییەکان توانیان ۲٤ پارچە زەوی لە دەڤەرە پەترۆلیەکانی کوردستان وەدەست بێنن ، کە روبەری هەر یەکێکیان (۱۳کم$^{2}$ ) بوو . [٤۹:۲۷٥] . وەڵێ چوونی ئەمەریکاییەکان بۆ ناو رێکەوتننامەی هێلی سوور، رێگای لەوە نەگرت بەرەو رووی هەوڵە تاکرەویەکانی ئینگلیز بووەستن . ئینگلیزەکانیش بۆ ئەوەی هاوسەنگیی تەرازووی هێزەکان رابگرن، هەوڵیاندا رکابەری تر بۆ ئەمەریکاییەکان پەیدا بکەن و بە نەهێنی هێزی تر بێننە ناو تۆڕی ململانێیەکەوە. لەو کاتەشدا ئیتاڵیەکان بۆ ئەم سیاسەتەی ئینگلیزەکان لەبار بوون، کە ئارەزووی وەدەست هێنانی جیاوکی پەترۆلیان هەبوو، بۆیە داوایان لە کونسوڵی ئیتاڵی کرد لە بەغدا کە لەگەڵ بنەماڵەی نەوتچی زادە لە کەرکوك و بنەماڵەی شێخ مەحمود لە سلێمانی رێك بکەوێ . بۆ ئەوەی بەپێی چەند مەرجێك ئەم بنەماڵانە دەست بەرداری زەویە پەترۆلیەکانیان بن بۆ ئیتاڵیەکان. هەروەها ئیتالیەکان لەم بارەیەوە رای نمایندەی (کۆمپانیای پەرەپێدانی پەترۆل)ی بەریتانیشیان وەرگرت. بۆ ئەوەی بزانن هەلی سەرکەوتنی ئەو دوو بنەماڵەیە چەند دەبێت ، ئەگەر کێشەکەیان بدەن بەدادگای نێو دەوڵەتی لە لاهای[ ۲۷۰:۲٥۸]. لە پاڵ ئەمە هەوڵیاندا بەرژەوەندی ئەڵەمانەکانیش بکێشنە ئەو دەڤەرە . لە تشرینی یەکەمی ۱۹۲۸، (۱۱) زانای ئەڵەمانی پسپۆڕ لە جیوفیزیك گەیشتنە کەرکوك ، تا کار بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەی تری پەترۆل بکەن بۆ بەرژەوەندی کۆمپانیای پەترۆلی تورکی . [٤۱:۲۲۹].

هاوکات ململانێ لە نێوان فەڕەنگ و ئینگلیزەکان لەسەر رێگای لولەی پەترۆلەکان گەرم ببوو. ئینگلیزەکان پێیان باش بوو لوولەکان بچنە سەر بەندەری حەیفا. کەچی فەڕەنگەکان بە باشیان دەزانی بچێتە سەر بەندەری تەرابلوس لە سوریا. شا فەیسەڵ لەو کاتەدا گوتی : "حکومەتی عێراق لای باشترە کە پەترۆلەکەی لەبن خاکدا بمێنێتەوە نەك لە رێگای سوریاوە بچێتە دەریای سپی " [۱۹۸:۲٥۲]. هەریەکەیان لەپەنای ئەمەشدا ، سەرباری لایەنە ئابوریەکە ، مەبەستی سیاسی خۆیان هەبوو . بەریتانیەکان کۆمپانیای پەرەپێدانی پەترۆلی عێراقیان دامەزراند بوو ، بۆ ئەوەی گەفی پێ لە بەرژەوەندیەکانی فەڕەنگ بکەن . وەڵێ لەبەر ئەوەی هەموو پشکەکانی ئەو کۆمپانیایە هی بەریتانیەکان بوو ، کە ئەمەش لادانێك بوو لە

سیاسەتی دەروازەی والاّ و سەرئێشەی بۆ لەگەڵ ئەمەریکاییەکان دەگۆراندن ، وایان بە باشزانی بیکەن بە کۆمپانیایەکی نێو دەوڵەتی کە بەرژەوەندی بێگانەی تر بەخۆوە بگرێ . بەتایبەتی بەرژەوەندی ئیتاڵی و ئەڵەمانی ، بۆ ئەوەی لەلایەك دەنگی ئەوانەش مسۆگەر بکەن بۆ ئەوەی عێراق بە ئەندام لە کۆمەڵەی گەلان وەربگیرێ، هاوکات رێگای ئەوەشیان لێ بگرێ کە پەترۆل لە روس بکرن [١٩٦:١١٩] . شایەنی باسە نوری سەعید لەو پێواژۆکەدا دەرکی بەوەکردبوو کە دۆزی پەترۆلی کوردستان تا چ رادەیەك پەیوەندی بە بەرژەوەندی دەوڵەتە گەورەکانەوە هەیە لە دەڤەرەکەدا . بۆیە لە ئەیلولی ١٩٣٠ رایگەیاند : "ئەگەر دۆزی پەترۆل لە سیاسەت دامالرێ ، چارەسەری دۆزەکە زۆر ئاسانە" [١٩٨:٢٤٦] . ئەمەش ئەوە روونده‌کاتەوە کە ململانێیەکە بە تەنیا لەسەر خودی پەترۆلەکە نەبووە ، بەڵکو لەسەر چۆنیەتی پەیداکردنی بالاّ دەستی بووە لەسەر رۆژهەلاّتی ناڤین. کەواتە ناتوانرێ پەترۆلەکە لە بایەخی شوێنە ستراتیژیەکەی کوردستان جوێ بکرێتەوە و هەردوولا تەواوکەی یەکترن .

ئەم هەوڵ و سیاسەتەی بەریتانیەکان کاریگەری نەك بەتەنیا لە دادۆشین و بەتالاّن بردنی پەترۆلی کوردستان هەبوو ، بەڵکو کاریگەریەکی ترسناکی لەسەر کوردستان و بزاڤی نەتەوایەتی کورد هەبوو . لە سۆنگەی شوێنی ستراتیژی و ئەو پەترۆلە بوو، کەوا کوردستان بەم شێوەیە پارڤەکرا، کە تا ئەمرۆش بەدەستیەوە دەناڵێنی .

# بەشی چوارەم

# هێزە ناوچەییەکان و ململانێیان لەسەر کوردستان

## باسی یەکەم : ململانێی دەسەڵاتداری ناسیونالیستی تورک لەسەر کوردستان

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، تورکە ناسیونالیستەکان کەوتنە پیادەکردنی بیروباوەڕی تورانچیەتی*، دوای ئەوەی بۆ ماوەیەك لەگەڵ گەلانی تر، لەژێر پەردەی کۆمەڵەی "ئیتیحادو تەرەقی" پەرای ئەم بیرۆکەی خۆیانکرد.

دوای کودەتاکەی ١٩٠٨، رۆشنبیران و سیاسەتوانانی تورك، پەردەیان لە رووی خۆیان هەڵماڵی. "حوسێن موجاهید" کە سەر نوسەری رۆژنامەی "**طنین**"ی زمان حاڵی ئیتیحادیەکان بوو، لە نووسینەکانیدا ناواخنی تورکە ناسیونالیستەکانی دەردەبڕی. سێ مانگ بەسەر کودەتاکە تێنەپەڕی بوو کاتێك نووسی : "پێشان و ئێستاش، هەر نەتەوەی تورك لە ئیمپراتۆریای عوسمانی دەسەڵاتدار بووینە. لەبەر ئەوەی تورکەکان فاتح بووینە ماف و جیاوکی بەرزیان هەیە، کەوابێ بواری ئەوە نابێ دان بەیەکسانی مافەکان بنرێ لەگەڵ رەگەزە ناتورکەکان" [١٤٨:٩٦]. لە نووسینێکی تریدا نووسی : "پێویستە وولاتمان لە رەگەزی ناتورك پاك بکەینەوە"[٢٥٩:٢٧٨]. هەر ئەو "حوسێن موجاهید"ەش بوو ناوی لە کوردستان نا

---

* بزاڤی تورانیزم رێبازێك بوو هەوڵیدەدا سەروەریەکانی تورکەکانی بەرایێ زیندوو بکاتەوە. هەروەها دەیویست تورکە نوێیەکان بە کەلتووری شارستانی کۆنی خۆیان گرێ بداتەوە. لەهەمان کاتدا هزرو ویژەی تورکی، لە کاریگەری فارسی و عەرەبی پاك بکاتەوە. سەیر لەوەدایە سەرەتای ئەم رێبازە لە سەرچاوەیەکی ناتورکیەوە هاتووە، ئەویش لە رێگای نووسینەکانی رۆماننوسی فەرەنگسی بەناوودەنگ لیون کاهون Leon Chaun، کە بابەتی شەڕو کوشتاری مەغۆلەکان، وەك "جەنگیزخان" و "تەیمور لەنگ"ی دەکردە کرۆکی چیرۆکەکانی بۆ ئەوەی لاوە فەرەنگەکان کاتی پێ بەسەر بەرن. لە چارەگی سێیەمی سەدەی نۆزدەهەم، کاتێ ئەو چیرۆکانە وەرگێردرانە سەر زمانی تورکی کاریگەری زۆریان لە دەروونی تورکەکان هەبوو [٢٥٢:٢٥٨].

ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات، بۆ ئەوەی ناوی کوردستان بسڕێتەوە. ئیتر لەو کاتەوە ووشەی کوردستان لەسەر نەخشەی دەوڵەتی عوسمانی سڕایەوە [٢٥:١٧٦].

سەرباری ئەوەی کەوا لە ڕوانگەیەکی نزمەوە، سایەی هەموو نەتەوەکانی تری بن دەستی عوسمانیەکان سەیری کوردیان دەکرد، دەیانویست وەکو نەوەکانی تری بەر لە خۆیان، کورد فریو بدەن. بۆ ئەم مەبەستەش بە بەردەوامی لەژێی عوسمانچیەتیان دەدا. لە ژمارە ١٢ ڕۆژنامەی پەیمان هاتووە : "لەمڕۆوە گزیر یەکن، ئاغایەتی و عەشیرەتگەری نیە، ئێستا هەموو میللەت یەك عەشیرەتن. ئەویش عەشیرەتی عوسمانلی‌یە، بۆیە وەکو پێشان لەسەربازی مەرەڤن، سەربازی فەرزی جیهادە، کرمانج بۆ عەشیرەتی دەچنە شەڕێ، دەڵێن مردن هەیە زڤرین نیە. ئەو بۆ شەیتانە، وەلێ سەربازی بۆ خوایە، بۆ پاراستنی ناموس و ئایین و میللەت و نیشتمانە" [٣٢:٦٤]. هەمدیس لەو هەنگاوەیان سەرکەوتنیان وەدەست هێنا، کورد بەژمارەیەکی زۆر لە شەڕەکانی باڵکان شەڕی بۆ کردن، ئەوان دەجەنگان و لەپێشەوەی سوپاکان دەچوونە ناو شارەکانەوە، تورکەکان فیزیان پێ لێدەداو ووتارو دروشمی بریقەداریان بەناوی خۆیان دەخوێندەوە ! [٦٥].

جەنگی جیهانی یەکەم هەلێکی لەبار بوو بۆ ئیتحادیەکان، تا خەونی دامەزراندنی دەوڵەتە تورانیەکەیان بهێننە دی. وەلێ لەبەر ئەوەی لە جەنگ دۆڕاندیان، چەك کران و ئەو ئاواتەیان نەهاتە دی.

هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی عوسمانی کۆمەڵێك ئەژواری و تەنگ و چەڵەمەی وای چێکرد مەترسی بۆ هەموو ڕۆژهەڵاتی ناڤین هەبوو. سەر لە نوێ پارڤە کردنەوەی جیهان پێویستی بە ووردبینیەك هەبوو، بۆ ئەوەی هاوپەیمانەکان و بە پلەی یەکەم ئینگلیزەکان، بتوانن لەم دەڤەرەدا بەرژەوەندی گەورە وەدەست بێنن و لە ڕێگای دارشتنێکی سیاسیەوە ئەو دەستکەوتانەیان بپارێزن. تورکەکانیش دەیانویست بەهەر جۆرێك بێت وولاتەکەیان لە پارڤە بوون رزگار بکەن. بۆیە حکومەتی سوڵتان کەوتە دانوستان لەگەڵ ڕێکخراو و کۆمەڵە کوردیەکان. کە لەدوای جەنگدا چالاکانە کەوتبوونە کار بۆ وەدیهێنانی ئاواتە نەتەوەییەکانیان. هوشیاربوونەوەی گەلانی بن دەستی عوسمانیەکان لەلایەك و هەوڵدانی تورکەکان بۆ هێشتنەوەی گەورەترین پارچەی ئیمپراتوریاکەیان لەبن دەستی خۆیان لەلایەکی تر، ئەژواریەکی گەورەی چێکرد. تورکە ناسیونالیستەکان کەوتنە خۆیان، مستەفا کەمال لە ١٥ ئایاری ١٩١٩ ئەستانەی جێ هێشت. نیازی وابوو بچێتە سامسۆن، کەچی چووە ئەزمیر. کەشتی ئەنیپۆلی کە

مستەفا کەمالی تیا بوو، لەبەندەری ئەزمیر لەنێوان کەشتیگەلی ئینگلیزی و پاپۆڕەکانی یۆنانی وەستا. مستەفا کەمال دابەزی و چووە ناو شارەوە![١١٦:٢١١]. وەك خۆی لەیاداشتەکانیدا دەڵێ : لە شەوی ٢٢/٢١ حوزەیرانی ١٩١٩، خاڵە بنچینەییەکانی بزاڤی ناسیونالیستی تورکی نووسی، لەوانە سەربەخۆیی گەل، لەبەر ئەوەی سەربەخۆیی گەل لە مەترسی دابوو، پێویست بوو دەنگیان بگەیەننە گشت جیهان و هەموو توانایەکیان بخەنە کار بۆ رزگارکردنی گەل لەهەموو بەشەکانی ئەناتۆلیا. سیواس گرنگترین مەڵبەند بوو کۆنگرەی تیا ببەستن. لەپێناو ئەم ئامانجانەدا بڕیاریاندا هەر ویلایەتێك سێ نوێنەری خۆی بنێرێت، کە لە لایەن گەلەوە پشتگیری بکرێت. ئەمەشیان بەنهێنییەك دانا کە پێویست بوو بپارێزرێ [٣٣٤ :٢١-٢٢] . لە ڕاستیدا سیاسەتی مستەفا کەمال تەواوکەری سیاسەتی ئیتحادیەکان بوو، دەربارەی هەڵوێستی کەمالیستەکان، داماد فەرید پاشا، سەرۆکی حکومەتی عوسمانی، لەچاوپێکەوتنێکدا بەڕاشکاوی گوتی : "ئەوانە کۆمەڵێك ئەفسەرن، بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان لە ئەناتۆلیا بلاوبوونەتەوە، هەوڵیانداوە ئەم بزووتنەوەیە چێ بکەن. بۆ ئەم مەبەستەش پارەیەکی زۆریان خەرج کردووە، کە لەکاتی جەنگدا پاشەکەوتیان کردبوو ! بزووتنەوەی ئیتیحادو تەرەقیش پەنجەی ئاشکرای لەم کارەدا هەیە، بۆیە ئەم بزاڤە بوژانەوەی ئیتیحادیەکان دەگەیەنێت بەشێوەیەکی فراوانتر [٨٨:٣٣٧].

مستەفا کەمال بۆ ئەنجامدانی پلانەکانی، بەشێوەیەکی بنەڕەتی، لە رووی زەمینی و مرۆییەوە پشتی بە کوردستان بەستبوو، چونکە ئەو ناوچانە تا ڕادەیەك دوور بوون و وەك ناوچەکانی تر نەکەوتبوونە بن دەستی هێزەکانی هاوپەیمانەکان، مستەفا کەمال "دەست بەسەر داگرتنی دەسەڵاتی بە پێداویستیەکی ژیانی دەزانی"[٢١:٣٣٤] بۆ هێنانە دی ئامانجەکانی. بۆیە دەبوایە لە دوو بوارەوە کار بکات. لە لایەك کوردەکان بۆ لای خۆی رابکێشێ، لە لایەکی تر بزاڤی نەتەوایەتی کورد کپ بکاتەوە و رێگا لە هەموو پەرەسەندنێکی بگرێ. بۆیە خۆی بەرزگار کەری کوردستان نیشاندا، کە داکۆکی لەخاکی موسڵمانان دەکرد دژی دیانەکان. بانگەوازی موسڵمانان، واتە کوردەکانی کرد هێزەکانیان یەکبخەن تا داگیرکەران لە زێدی موسڵمانان دەربکەن، بە ئاگاداریەوە ناوی تورکی نەدەهێنا، پێی لەسەر برایەتی کوردو تورك دادەگرت [١٩:١٠٥]. ئەگەرچی بیرۆکەی ناسیونالیستی تورکی بە بنەڕەتێك دەزانی بۆ دارشتنەوەی ناسنامەی دەوڵەتی نوێی تورکی، کە بایەخێکی گەورەی هەبوو لە سەرەتادا

بۆ بەرەنگاربوونەوەی دامەزراندنی دەوڵەتی تر کە یەکپارچەیی ئەناتۆلیای تێکدەشکاند، مستەفا کەمال دەیگوت : "کامەرانە ئەوەی خۆی بە تورك سالوخدان بکات" [٢٢٤ :١١-١٢].

کەمالیستەکان هەر بەمەشەوە نەوەستان، بەڵکو کەوتنە هاندانی کورد بۆ راپەڕین دژی هاوپەیمانەکان. لەوانەش عەلی ئیحسان پاشا زۆر بەگەرمی بۆ ئەم کارە کەوتبووە خۆ، چەك و ئازووقەی بەکورد دەبەخشی و دژی بێگانەکان هانی دەدان. وای دەردەخست کار بۆ سەربەخۆی کوردستان دەکات. کەچی لە راستەقینەدا ئامانجی شلەژاندنی نفوزی هاوپەیمانەکان بوو، بەهیوای ئەوەی رێگا لە داگیرکردنی کوردستان بگرێ و بیگەڕێنێتەوە باوەشی دەوڵەتی عوسمانی [٢٩٦ :٩-١٠]. ئەمەش ئەوە دەردەخا کەوا تورکەکان، چ لایەنگرانی سوڵتان، چ کەمالیستەکان، بنەمای ستراتیژییان بەرامبەر کوردستان یەك بوو، گەرەکیان بوو بەهەر نرخێك بێت لەبن دەستی خۆیانی بهێڵنەوە. لە راستیدا کاریگەری کەمالیستەکان لەسەر کورد زۆر بوو، تا ئەو رادەیەی زانای بەناوبانگ سەعید نورسی، لەگەڵ (٧٦) زانای ئایینی و (١١) زانای ترو (٣٥) پەرلەمانتاری تر، فتوایەکیان دەرکرد بۆ لایەنگری کردنی بزاڤی کەمالیستەکان [٢٠١:٤٦]. بەم جۆرە دوای جەنگیش هەمدیس ئایینیان وەکو چەکێك بۆ فریودانی کورد بەکارهێنا، ئەوەی زێتر یارمەتی سەرکەوتنی ئەم پلانەی دەدا، راپەرینی ئەرمەنەکان بوو، کە ناو جەرگەی کوردستانیان بەخاکی خۆیان دەزانی. ئەمەش مەترسیەکی گەورەی خستبووە دڵی کورد، تورکەکانیش زانایانە لە ژێی ئەو مەترسیەیان دەدا، لەگەڵ ئەوەش دۆزی ئایین دوو ڕووگەی هەبوو، بەشێکیان سوڵتان نوێنەرایەتی دەکرد وەکو خەلیفەی موسڵمانان، بەشەکەی تریش مستەفا کەمال، کە بەتەواوی دەرکی بە بایەخی موسڵمانچیەتی کردبوو، بۆ بەکارهێنانی وەکو ئامرازێکی خەبات، بۆیە هەر لە یەکەم ڕۆژیەوە پێی لەسەر بانگەوازی برایەتی موسڵمانان و خەبات دژی گاوران داگرت [٣:١١٧]. تەنانەت بۆ فریودانی گەل بەگشتی و کورد بەتایبەتی، مستەفا کەمال وێنەیەکی زۆری لەگەڵ پیاوە ئایینیەکان گرتبوو. بۆیە خەڵکێکی زۆری ساکار باوەڕیان پێکردو لە دڵەوە پشتگیریان کرد. هەندێك لە کەسایەتیە دیارەکان پڕوپاگەندەیان بۆ مستەفا کەمال دەکرد و وایان نیشان دەدا، کە ئەو سەرکردەیە کە دەتوانێ خەلافەتی ئیسلام لە چنگی زلهێزەکان و وولات لە داگیرکاری بێگانە رزگار بکات، لەو کاتەوە هۆزە کوردەکان کەوتنە رکابەری یەکتر بۆ ئەوەی هەموو تواناو هێزەکانی خۆیان بخەنە بن دەسەڵاتی ئەوەوە. مستەفا کەمالیش زۆر خەڵات و دیاری پێ دەبەخشین، کە بریتی بوو لە تفەنگی ماوزەر، دەنەخشێنراو ناوی ئەو کەسەی لەسەر دەنوسرا کە پێشکەشی دەکرا[١٧٦: ٦٠-٦١].

کورد گەلێکی موسڵمان بوو، زۆر دەستیان بە ئایینەوە گرتبوو، و لەو بڕوایەدا بوون مستەفا کەمال لە پێناو خەلیفە تورکیا لە بێگانان رزگار دەکا. بە جۆرێك کە "کەژاوەی مستەفا کەمال تێدەپەڕی، هەندێك لەوان هاواریان دەکرد بژی سوڵتان !" [٤٦:١٠٢].

مستەفا کەمال بایەخی گەورەی جیۆپۆلەتیکی کوردستانی دەزانی، بۆیە کاری بۆ ئەوە دەکرد رێگا لە گەشەسەندن و پێشوە چوونی بزاڤی نەتەوەیی کورد بگرێ، لەو بروسکەیەی کە لە ١٥ حوزەیرانی ١٩١٩ بۆ جێگری والی "دیاربەکر"ی ناردووە، تیایدا دەڵێ : "پێویستە دەست بەجێ هەموو رێکخراوێك هەڵوەشێنرێتەوە کە دەیەوێ تۆوی دوو بەرەکی لەم وولاتەدا بچێنێ. ئەم جۆرە هەنگاوانە ئەرکێکی نیشتمانییە، بۆیە بەتەواوی لەو رەفتارانە رازیم کە بەرامبەر یانەی کوردی ئەنجامتان دا" * [١٢:٢٤٩]. کەمالیستەکان بە ئەرکی خۆیان دەزانی شەڕی ئەو یاخیگەرانە بکەن، کە بە ووتەی خۆیان "حکومەتی ئەستانە پشتی دەگرتن" بۆ ئەوەی نفوزی خۆیان لەو ناوچانە بچەسپێنن کە نەکەوتبووە ژێر چەپۆکی داگیرکردن [١٠٤:٣٣٧]. وەلێ لەگەڵ ئەوەش، لە سۆنگەی کاودانە نێو دەوڵەتی و ناوچەییەکەدا نەیاندەتوانی بە ئاشکرا شەڕی کورد بکەن، بۆیە دەیانویست کورد بەشتی لابەلاوە خەریك بکەن، "هەوڵیاندەدا دەرەبەگە کوردەکان دژی بزاڤی رزگاریخوازی ئەرمەن بەکاربهێنن" [١٢:٢٤٩].

شایەنی باسە حکومەتی ئەستانەش، بەگەرمی کاری بۆ ئەوە دەکرد کوردستان بگەڕێنێتەوە بن دەستی خۆی. لە ١٧ حوزەیرانی ١٩١٩، لە کۆنگرەی ئاشتی رایگەیاند : "زنجیرە چیای تۆرۆس تەنیا هێلێکی جیۆلۆجییە. هەرچەندە ئەو ناوچانەی دەکەونە دواوەی، لە دەریای سپی ناڤینەوە تا دەریای عەرەب، هی خەڵکێکە بە تورکی ناخێون، وەلێ پەیوەندیەکی پتەویان بە ئەستانەوە هەیە، کە لە پڕەنسیپی نەتەوە زۆر قووڵترە بۆ ئەو خەڵکانەی لە هەردوو دیوی چیای تۆرۆس دەژین. لەمەدا هاوپەیمانیەتیەك چێ بووە کە ئەگەر دارما، ئاشتی لە رۆژهەلاتی ناڤین دوچاری کارەسات دەبێت" [٢٥٥ :١٥٢-١٥٣].

ئاشکرایە هەر لەدوای جەنگ، زۆر کۆمەڵەو رێکخراوی سیاسی لە کوردستان سەریان هەڵدا. کە بەمەبەستی شێواندنیان بە لێژنەکانی بەرگری کردن لە ویلایەتەکانی رۆژهەلات ناوزەند دەکرێن، ئەم رێکخراوانە لە پێناو دۆزی رەوای گەلەکەیان خەباتیان دەکرد،

---

* مەبەستی لەیانەی دیاربەکرە .

کەمالیستەکان و حکومەتی سوڵتان، بەهەموو شێوەیەك هەوڵی لەناوبردنی ئەو ڕێکخراوانەیان دەدا، لەو نامەیەی مستەفا کەمال لە ١٨ حوزەیرانی ١٩١٩، بۆ جافەر تاربیگی نارد، کە فەرماندەی سوپای یەك بوو لە ئەدرنە، نووسیبووی : "بەسەرکەوتوویی روو بەڕووی ئەو پڕوپاگەندانە بووینەوە کە ئامانجی دامەزراندنی کوردستانی سەربەخۆ بوو. لایەنگرانی ئەم بزاڤە پارڤە بوون و کوردەکان خۆیان بەگەڵ تورکەکاندا" [١٩:٢٨٧]. هەرچەندە کورد بەشێکی زۆری دژی کەمالیستەکان بوون و کاریان بۆ دۆزی رەوای خۆیان دەکرد.

مستەفا کەمال بەرگی "غەزا"ی پۆشیبوو ! دەیویست ئەوانە لەبن دەستی سوڵتان دووربکاتەوە کە بەشداری یانە کوردیەکانیان کردبوو، بۆ ئەم مەبەستەش کەوتە نامە گۆڕینەوە لەگەڵ ئەو کەسایەتیە کوردیانەو بانگهێشتی کردن تا لە کۆنگرەی ئەرزەڕۆم بەشداری بکەن. لە راستیدا هەڵبژاردنی ئەرزەڕۆم وەکو جێگایەك بۆ بەستنی کۆنگرە، سەرباری شوێنی ستراتیژی، کە لە کوردستانی ناو جەرگەی خەباتدا بوو، لە دەسەڵاتی خەلیفەش دوور بوو. جێگای ئاماژە بۆ کردنە، کە ماوەیەك بەر لەو کاتەش، ڕێکخراو و کەسایەتیە دیارەکانی کورد کۆنگرەیەکیان تیا گرێدابوو، لەسەر ئەوە ڕێکەوتبوون پەیوەندی بە "مستەفا کەمال"ەوە بکەن تا لەسەر خەباتی هاوبەش لە ئایندەدا باخێون. بۆیە لەو شوێنە بۆ مستەفا کەمال ئاسانتر بوو پەیوەندی بە کوردەکانەوە بکات. بەشێکی زۆر لە نوێنەرانی کورد بە خۆشحاڵیەوە پێشوازی بانگهێشتەکەی مستەفا پاشایان کرد. (٣٥) * نوێنەر لە ویلایەتەکانی ئەرزەڕۆم و بەدلیس و سیواس و تەڕابزۆن و وان و مەلاتیە و دیاربەکر بە پیر بانگهێشتەکەوە هاتن [٨٥:٥١] ئاشکرایە کە ئەو ناوچانە لە ئەرمەنەکان نزیك بوون، بۆیە داواکانی ئەرمەن کاریگەری راستەوخۆی لەسەر ئەم ویلایەتانە هەبوو، ئەمەش ئەوە رووندەکاتەوە کە کێشەی نێوان ئەرمەن و کورد تا چ رادەیەك رۆڵی خۆی لەم دۆزەدا دەگێڕا، کەمالیستەکانیش بە وریاییەوە ئەو مەترسیەیان دەقۆستەوە، لەو کاتەدا کە رۆژنامەکانی ئەستانە چاوپێکەوتنیان لەگەڵ مستەفا کەمال دەکرد و دەربارەی ئەو ناوچانە پرسیاریان لێ دەکرد، دەیگوت : "ئەوان لە دەرەوەی سنووری دەوڵەتی عوسمانی پێشوازی لە ئەرمەنستان دەکەن" [٨٩:٣٣٧]، کەچی سەرباری ئەو هەوڵانەی کەمالیستەکان، بەشێکی زۆر لە کورد، دەستیان بە بیرۆکەی کوردستانی ئازاد

---

* هەندێك سەرچاوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن ژمارەی نوێنەرانی کورد ٥٤ کەس بووە [١٠٥].

وەگرت و بەشداری کۆنگرەیان نەکرد. لەوانە تێکۆشەرانی یانەی دیاربەکر، ئەمەش لەو نامەیەدا دەردەکەوێ کە خەلیل بەگ، فەرماندەی تیپی ۱۳ دیاربەکر، بۆ کاپتن عابدینی نارد، کە ئەفسەری سوارە بوو لە مەلاتیە، لەو نامەیەدا هاتبوو : "راگەیاندنەکەی ئەکرەم جەمیل پاشا لە مانگی حوزەیراندا، کاتێك مێژۆر نوئیل گەیشت، دواتریش راکردنەکەی بۆ حەلەب، هەروەها رەتکردنەوەی دیاربەکریەکان لە بەشداری کردنی کۆنگرەی ئەرزەرۆم، ئەوە روونەدەکاتەوە، کەوا راستەقینە لە کوێ دایە، بۆیە کە والی نوێ هات، مەغزای رووداوەکانمان بۆ شیکردەوە، ئەویش یانەی دیاربەکری داخست [۲۸۰:٤۰]. هەر بەم بۆنەیەوە کۆمیساری بالاّی بەریتانی، لە بروسکەیەکدا، کە لە ۱۰ و ۱۱ تەموز بۆ شالیاری هەندەرانی وولاّتەکەی ناردووە، دوای ئەوەی ئاماژە بۆ داخستنی یانەی دیاربەکر دەکات نوسیویەتی : "وا دیارە لە سۆنگەی چالاکیەکانی مستەفا کەمالەوە، سەرۆکە کوردەکان دوچاری دڵەڕاوکێیەکی زۆر هاتوون. دەیانەوێ رای ئێمە بزانن دەربارەی هەر کارێك دژی مستەفا کەمال ئەنجامی بدەن ؟ پێیان راگەیەنرا، هەر کارێك ئەگەر لە لایەن دەسەلاّتی تورکەوە دانی پیانەنرێت دژی مستەفا کەمال ئەنجام نەدرێت! [۱۹٤:۲٥]. بەمەدا دەردەکەوێت، کەوا ئینگلیزەکان هەر لەو پێواژۆکەدا نەیانویستووە لە کەمالیستەکان بدرێت. هەروەها ئەوە نیشان دەدا کە تا چ رادەیەك ململانێی نێو دەوڵەتی رۆڵی خۆی لەم رووداوانە گێڕاوە. هەر لەو کاتەشەوە مستەفا کەمال هەنگاوەکانی ئایندەی دیاری دەکا ! کە ئەمانە جێگای هەڵوەستەکردن و سەنگرینەوەیە ! بۆ وێنە یەکێك لە هاوڕێ نزیکەکانی مستەفا کەمال لە یاداشتەکانی خۆیدا نووسیویەتی : کەوا لە کازێوەی ۱۹۱۹/۷/۷، مستەفا کەمال گازی کردوەو بەنهێنی پلانەکانی خۆی بۆ روونکردۆتەوە، کە بریتی بووە لە دامەزراندنی دەوڵەتی کۆماری تورکیاو لادانی خەلیفە و لادانی سەرپۆش لەسەر ئافرەتان [۳۰٤:۷۳۲] هاوکات لەگەڵ ئەمەدا مستەفا کەمال دەربارەی هێزی هاوپەیمانان دەیگوت : "چۆن هاتن ئاواش دەگەڕێنەوە"[۳۳٥:۷۳۰].

جێگەی سەرنجە لەو دەمەدا حکومەتی ئەستانەش، کە لەسەرەوە هەوڵی دانوستانی لەگەڵ کورد دەدا، لەبنەوە کاری بۆ بەتورك کردنی کورد دەکرد، مێژۆر نوئیل، لە ۱۰ و ۱۱ تەموزی ۱۹۱۹ بروسکەیەکی بۆ نوێنەری سیاسی بەریتانی نارد، تیایدا دەیگوت : "حکومەتی تورکی فەرمانی پەرتەوازەکردن و پەڕاگەندەکردنی کوردەکانی لە وولاّت دەرکردووە، بە جۆرێك کە لە هیچ شوێنێك لە ٥٪ دانیشتوان تێپەڕ نەکەن مەبەستیشیان ئەوەیە بەلەزی لەنێو دانیشتووە

تورکەکانیان بتوێننەوە، لەهەمان کاتدا هەموو شتێك دەکەن بۆ ئەوەی ڕێگای گەڕانەوەی کوردستانیان لێبگرن" [٢٢:١٩٤]. ئەمەش هەماهەنگی تورکەکان دەنوێنێ، کە سەرباری دوژمنداری و جیاوازی ئایدیۆلۆژیان لە هەنگاوەکانیان بەرامبەر کورد و کوردستان ڕێك و تەبا بوون.

کۆنگرەی ئەرزەڕۆم کە لە ٢٣ تەموز تا ٧ ئابی ١٩١٩ گرێدرا "بەیەکەمین سەرکەوتنی سیاسی مستەفا کەمال دەژمێردرێت" [١٠٠:٣٢٥]. لە بەیاننامەی کۆتایی ئەم کۆنگرەیەدا ڕایانگەیاند : "ویلایەتەکانی ئەرزەڕۆم و سیواس و ئامەدو خارپوت و وان و بەدلیس، بەشێکن لە ئیمپراتوریای عوسمانی و لێی جوێ ناکرێنەوە، لەژێر هەر بیانگەیەك بێت نابێ پارچە بکرێ، یا لە دەوڵەتی عوسمانی داماڵرێ. تایبەتمەندێتی ڕەگەزی و کۆمەلایەتی، بۆ هەر کۆمەڵەیەك لەو موسڵمانانەی لەسەر ئەو زەویانە نیشتەنین بەوە دەژمێرێ کە نەتەوەی لێ پێك دێت. بەم جۆرە ئەم ڕەگەزانە هەموو خۆیان بە برای یەکتر دەزانن کە لە یەك دایك و باوك بووینە" [١٠٥:١٥٦]. شایەنی ئاماژە پێکردنە ئەو لێژنەیەی سەرپەرشتی کۆنگرەکەی دەکرد لە هەشت کەسیان سیانی کورد بوون، ئەوانیش "شێخ فەوزی" سەرۆکی تایفەی نەقشبەندی لە ئەرزنجان و دەرسیم، "سعدالله بەگ" کە خەڵکی سیرت بوو، هەروەها سەرۆك عەشیرەتی ناسراو "حاجی موسا بەگ میرزا زادە" [٨٤:١١١].

بەیاننامەی ئەرزەڕۆم خاڵێکی وەرچەرخان بوو لە پەیوەندی نێوان کوردو کەمالیستەکان. زۆر لە سەرۆکە کوردەکان نیازی ڕاستەقینەی کەمالیستەکانیان بۆ ئاشکرا بوو. کە کاری کردە سەر ڕادەی هوشیار بوونەوەی گەلی کورد، بێگومان ئەمەش بەدڵی ئینگلیزەکان نەبوو. کە لەو کاتە بە کوردەکانیان دەگوت : "دژی مستەفا کەمال مەوەستن !" [١٨١:٢٥٥] لەهەمان کاتیشدا ڕێگایان بە سوپای سوڵتان نەدەدا هێرش بەرێتە سەر کەمالیستەکان، بەو بیانگەی بەگوێرەی ئاگر بەستی "مودروس" حکومەتی سوڵتان دەبێ سوپاکەی هەڵوەشێنیتەوە نەك بەیەکەوەی بنێ ! کاتێك سوڵتان داوای لە ئینگلیزەکان کرد خۆیان هێز بۆ لێدانی کەمالیستەکان بنێرن، گوتیان ئەوان نایانەوێ دەست بخەنە کاروباری ناوەخۆی تورك ! [١٢٨:٢١١].

هەموو لایەنەکان بە ووردی زێرەڤانی بزاڤی نەتەوەیی کوردیان دەکرد، وەك هەسرەتیان دەڵێ : "مستەفا کەمال هەر لە سەرەتای تەموزەوە ئاگاداری ئەوە بوو کەوا کورد خۆیان بۆ ڕاپەڕینێك تەیار دەکەن، بۆیە ئاگاداری فەرماندەی سوپای ١٣ ئامەدی کردەوە

زێرەڤانی ئەو کەسایەتیە کوردانە بکات کە لە ئەستانە دێنە مەلاتیەو، لەکاتی گەیشتنیان بەبێ ئاژاوەو هەراو هوریا بیانگرێ" [٢٦:٢٤٨] لەبەر ئەوەی ئینگلیزەکان نەیاندەویست بزاڤی کورد بەهێزبێت، هاوکات گەرەکیان نەبوو کەمالیستەکان دوچاری ئەژواری بن، دوور نیە هەر خۆیان ئەو زانیاریانەیان دابێتە کەمالیستەکان !. مستەفا کەمال بۆ ئەوەی رێگا لە دایسانی راپەرینەکە بگرێ، لەگەڵ هەندێك لە سەرۆکە کوردەکان کەوتە گفتوگۆ، بەو نیازەی لەو راپەرینە دووریان بخاتەوە کە کاری بۆ دەکرا [٢٩:٢٤٨] هاوکات لە ئابی ١٩١٩ دەقی بریارەکانی ئەرزەرۆمی بۆ هەندێك لە دەرەبەگە کوردە بەدەسەڵاتەکان نارد، تیایدا داوای لێدەکردن دژی جوجوڵەکانی ئەرمەن و دوژمنەکانی تر بوەستن، یەکێك لەوانەی نامەی بۆ ناردرا عەبدولرەحمان ئاغای شەرناخی بوو. مستەفا کەمال بۆی نووسیبوو : "هەموو جیهان ئاگاداری گوێرایەڵیتانن بۆ فەرمانەکانی تاج و خەلیفە. ئەمەش زۆر روون و ئاشکرایە کە تۆ هەرگیز رازی نابی "ئەرمەنەکان" خاکی پیرۆزی نیشتمانتان گڵاو بکەن. لەبەر ئەوەی لە هەموو کەس زێتر ئاگاداری رەوشتی بەرزو هەڵس و کەوتی تۆم، دڵنیام بەم زوانە بەسەرکردایەتی ئەو رۆڵە نیشتمان پەروەرانە دەتبینم کە خۆیان لە رێگای نەتەوەو نیشتماندا دەکەنە گوری" [٢٨:٧٤].

جێگای داخە، هەرچەندە کۆنگرەی ئەرزەرۆم پەیمانێکی ناسیونالیستی لێ هاتە ئەنجام، هەموو کوردستانی عوسمانی خرایە نێو سنووری ناسیونالیستی تورکەوە، بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە مافێك بۆ کورد دیاری بکرێت، لەگەڵ ئەمەشدا کورد چ بەپارەو چ بە چەکدار یارمەتی مستەفا کەمالیان دا. هەر لەو کۆنگرەیەدا، کورد سەد هەزار لیرەی زێری عوسمانیان بۆ مستەفا کەمال کۆ کردەوە [١٤:٨٨]. هاوکات لەگەڵ ئەمەدا، حکومەتی ئەستانە هەوڵی بچووك کردنەوەی دۆزی کوردی دەدا بەو نیازەی بیکاتە کێشەیەکی ناوەخۆ، زانیاری بروا پێکراو هەیە کەوا حکومەتی ئەستانە، شاندێکی کوردی بانگهێشت کردبوو، کە لە پیاوە دیارەکانی کورد پێکهاتبوون، بۆ ئەوەی باسی چاڵاکی حزبی کوردی بۆ بکەن. لەکاتی گفتوگۆکان، شالیارەکان ئەوەیان دوپات دەکردەوە کە ئەو کێشەیە کێشەیەکی ناوەخۆیەو دەروازەی باڵا ئۆتۆنۆمیەکی بەرفراوان دەدا بەکورد [٥٠:٢٨١]. بێگومان نە حکومەتی ئەستانەو نە کەمالیستەکان بەرامبەر بە کورد راستگۆ نەبوون، بەڵکو هەموو هەوڵێکیان بۆ ئەوەبوو کورد بۆ ماوەیەك هێور بکەنەوەو بزاڤەکەی گیرۆ بکەن، تا لەو تەنگژەیە رزگار دەبوون، کە لە ئەنجامی دۆڕاندنیان لە جەنگ دوچاری هاتبوون.

مستەفا کەمال بۆ ئەوەی جێ پێی خۆی پتەوتر بکات، بریاری دا بۆ ئەوە کاربکات کۆنگرەیەکی گشتی لە سیواس ببەسترێت. ئەوە بوو لە ٤-١٢ ئەیلولی ١٩١٩ کۆنگرەی

سیواس لەژێر دروشمی رزگارکردنی وولات لە پارڤە بوون گرێدرا، ئەفسەرو فەرمانبەرو ماف پەروەرو توێژی رۆشنبیری ئەستانە بەشداریان تیا کرد، لە پاڵ ژمارەیەکی زۆر لە دەرەبەگ و سەرۆك خێڵ و بازرگان و پیاوی ئایینی و ووتار بێژ [٢٩:١١٤]. لە راستیدا رزگارکردنی وولاتیش لە پارڤە بوون، تەنیا هێشتنەوەی کوردستان لەبن دەسەڵاتی تورکی دەگرتەوە، چونکە زۆربەی ناوچەکانی تریان بەشێوەیەکی کرداری لەبن دەستدا نەمابوو. لەکاتی بەستنی کۆنگرەی سیواس بەدرخانیەکان و ژمارەیەکی تر لەگەڵ مێژۆر نوئیل بە کوردستان دا دەگەران.
هاوکات، وەك ئاماژەی پێکرا، کورد لە مەلاتیە خۆیان بۆ راپەڕین ئەیار دەکرد. ئەوە بوو مستەفا کەمال هێزی ناردە سەریان و ئەو هەوڵەی سەرکوتکردەوە. لە بروسکەیەکدا کە لە ١١ ئەیلولی ١٩١٩ بۆ حکومەتی فەرید پاشای نارد، بەوە تاوانباری دەکرد کەوا دەستی کردووە بە پارڤە کردنی وولات. بەو پێیەی یارمەتی بزاڤی جوێخوازی دەدا لە کوردستان [١٢٩:٢٥٥].
لەهەمان کاتدا داوای لە رەشید پاشای والی سیواس کرد ئەو کوردانەیان بۆ گاز بکا کە پڕوپاگەندەیان بۆ بەرژەوەندی دەوڵەتی کوردی دەکرد، تا دیدەنیان لەگەڵدا بکات، ئەو هەنگاوەی بۆ ئەوەبوو کۆسپ بخاتە رێگای کوردەکانی دەرسیم، تا نەدەنە پاڵ راپەڕینەکە.
لەهەمان مانگدا، واتە لە ئەیلول، نوێنەرە کوردەکانی قوچگیری و سەرۆکی قەزای ئومرانیا چوونە دیدەنی مستەفا کەمال. کە داوای لێکردن لە چالاکی ئەندامەکانی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان ئاگاداری بکەنەوە. عەلی شان بەگ وەرامی دایەوە : "بەگوێرەی ووتەکانی ویلسن مافی کورد رەچاو ناکرێ و کوردستان دەدرێ بە ئەرمەنەکان. بۆیە ئەوان هەوڵدەدەن ئۆتۆنۆمی لەژێر سایەی سوڵتان وەدەست بێنن". مستەفا کەمال وەرامی دانەوە کەوا لێرە پرەنسیپەکانی ویلسن ناخوا، هەروەها پێشنیاری کردن وەکو نوێنەری دەرسیم بەشداری کۆنگرە بکەن، پێی گوتن : ئەو لەو بڕوایەدایە کورد لایەنگیری پلانەکانی سوڵتان ناکەن کە دژ بە نیشتمانەو لە کۆنگرەی ئەرزەرۆمیش باوەڕی خۆیان بەو داوە، بۆیە ئەو نوێنەری ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتە [٢١:٢٤٩]. لەگەڵ ئەمەشدا لە ١٠ ئەیلولی ١٩١٩ فەرمانی دا راوی سەرکردە کوردەکان بنێن و بیانگرن. هەموو رێگایەکیش بگرنە بەر بۆ ئەوەی هیچ یارمەتیەك نەگاتە جوێخوازان، هەروەها فەرمانیدا "تۆفیق بەگ"ی سەرۆکی هێزی ژاندارم بکرێ بە موتەسەریفی مەلاتیە و "شۆڕشگێڕێکی" تورکیش بکرێ بە والی خارپوت، بۆ ئەوەی رێگا لەوانە بگرن کە دەیانەوێ زیان بە نەتەوەو نیشتمان بگەیەنن [٣١:٧٤]. ئەو هەنگاوانەی مستەفا کەمال وایکرد ژمارەیەکی زۆری کورد بەشداری کۆنگرەی سیواس نەکەن، بۆیە مستەفا کەمال و رەئوف بەگ و خوجەرائف ئەفەندی و بەکر سامی بەگ، خۆیان نوێنەرایەتی کوردستانیان کرد. ئەستەنگیش

نیە بڵێین ئەوانە چۆن بەرژەوەندی کوردیان دەردەبڕی ! سەرباری بەیاننامەی کۆنگرە لە ١١ ئەیلول ڕاگەیانرا کە دژی ئیمپریالیزمن، وەلێ گیانی نەتەوە پەرستی پێوە دیار بوو، مافی هەموو کەمینەکانی پشتگوێ خستبوو، بەتایبەتی مافی کورد [١٥٦:١٠٦]. لە کۆنگرەی سیواس، وەکو کۆنگرەی ئەرزەڕۆم پێیان لەسەر ئەوە داگرت، ئەو زەویانەی لە چوارچێوەی مەرجەکانی ئاگر بەستی مودروس، لەنێوان هاوپەیمانان و دەوڵەتی عوسمانی دیاری کرابوو، یەك پارچەیەو لەیەکتر جوێ نابێتەوە. زۆربەی خەڵکی ئەو زەویانە، هەستی هاریکاری و ڕێزیان بەرامبەر یەکتر هەیە، بۆیە پێویستە وەك برای راستەقینە سەیر بکرێن[٢٥٥:١٣٣].

سەرباری ئەو هەموو هەڵوێستەی دژ بە کورد، کەمالیستەکان بە ووریاییەوە مامەڵەیان دەکردو مەوڵیاندەدا هاوسۆزی کورد لە دەست نەدەن، بۆیە خۆیان وەك لایەنگرێکی دۆزەکەیان نیشاندەدا، بەپێی بڕیاری کۆنگرەی سیواس، دوو لقیان بۆ "کۆمەڵەی داکۆکی کردن لە مافەکان" لە ئەناتۆلیاو کوردستان کردەوە، لەو نامانەی مستەفا کەمال بۆ سەرۆکی لقی دیاربەکری نارد، هاوسۆزی خۆی لەگەڵ کورد نیشاندەداو مکوڕبوونی خۆی لەسەر دۆزی کورد دەخستە روو، رایدەگەیاند کە دۆزی کورد دۆزێکی ژیانیە بۆ کوردو تورکەکان، لەیەکێ لەنامەکانیدا هاتبوو : نیازی وایە دوای پاك کردنەوەی وولات لە داگیرکەرە بێگانەکان، هەموو مافە نەتەوەییەکان بداتە برا کوردەکانی [١٧٦:٥٨]. ئەم هەڵوێستانە کاریگەری گەورەیان لەسەر کورد هەبوو. وەك لە یەکێك لە راپۆرتەکانی لقی کۆمەڵەی "عەهد" لە موسڵ، کە لە ٨ تشرینی دووەمی ١٩١٩ نوسرابوو، هاتووە : "ئەگەر جۆرە هیوایەکی رزگاربوون هەبێت لە ئینگلیزەکان، ئەوا لە مستەفا کەمالی چاوەڕوان دەکەن، مستەفا کەمال بۆتە ناوێکی گەورە لەم وولاتەدا" [٢٣٨:٥٢].

دوای کۆنگرەی سیواس، کەمالیستەکان تیورە ناسیونالیستیەکەی خۆیان، تا رادەیەك ئاشکراتر پیادە دەکرد. مێژوو نوئیل لە یاداشتەکانی مانگی ئەیلولدا نووسیویەتی : "زەقترین هۆی بێزاری لە تورکەکان ئەوەیە عەقل زبرو لووت بەرزو عەنات زلن، بە سووکی سەیری هەموو ناتورکێك دەکەن" [٤٩:٣٣]. هەروەها لە ١٧ تشرینی یەکەمی ١٩١٩، فەرماندەی سوپای بیست نامەیەکی بۆ مستەفا کەمال نارد، تیایدا دەیگوت : "تاکە رێگا بۆ چارەسەرکردنی دۆزی نەتەوەکان لە تورکیا ئەوەیە کەوا نیشتەنی و زەوی لەنێوان تورکیاو هاوسێکانی ئاڵوگۆڕ بکرێت، لەسەر حکومەت پێویستە تورك و موسڵمانەکان – مەبەستی لە کورد بوو – لەیەکتر جوێ بکاتەوە. هەرچی دەربارەی کەمینەکانی تر بوو، پێی وابوو تەنیا ژیانی سەرۆکەکانیان و موڵك و ماڵیان دابین بکرێ [٢٥٥:١٣٩]. بێگومان رووداوەکانی

ناوەخۆی تورکیاش کاریگەری لەسەر ئەم لایەنە هەبوو، هەر لەم کاتەدا حکومەتی فەرید پاشا لە کارخراو عەلی ڕەزا کابینەی پێکهێنا. ئەمەش بۆ کەمالیستەکان بەسەرکەوتنێك دەژمێردرا. مستەفا کەمال نامەیەکی بۆ عەلی ڕەزا نارد، تیایدا نووسی : "حکومەتی پێشتر، بە ئامانجی لەناوبردنی ئەو شاندانەی بۆ کۆنگرە دەهاتن، لە ویلایەتی خارپوت پەنای بۆ چەتەو ڕێگران برد" [١٢٢:٢٥٥] بەم جۆرە مستەفا کەمال بزاڤی نەتەوەیی کوردی بە چەتەو ڕێگر ناوزەند دەکرد.

بە سوود وەرگرتن لە ئایینی ئیسلام و ئەو پڕوپاگەندانەی لەو لایەنەوە بۆ مستەفا کەمال دەکران، کاریگەریەکی ئێجگار زۆریان هەبوو. تەنانەت مستەفا کەمال لە ڕوانگەی زۆر لە موسڵمانەکان، ببووە ڕزگارکەری ئیسلام، "ئەو شمشێرە بوو کە پێغەمبەر ناردبووی بۆ ڕزگارکردنی بیرو باوەڕی ئیسلام"[٩٩:٣٥] ئەمەش پێداویستیەك بوو بۆ مستەفا کەمال، تەنانەت لە بەرژەوەندی هاوپەیمانەکانیش بوو، بۆ ئەوانیش سەرکەوتنێکی گەورە بوو، چونکە دەیکردە تێکشکاندنی دەسەڵاتی گیانی سوڵتان و خەلیفەی موسڵمانان، ئەو لایەنەی مەترسیەکی زۆری لای هاوپەیمانەکان هەبوو، ئەمە یاریدەدەرێکی باش بوو بۆ ئەوەی ئەو پڕوپاگەندانە بەلەزی بڵاو ببنەوەو تەشەنە بکەن، وەك سورەیا بەدرخان، سکرتێری کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان، لەو نامەیەی کە لە ٢٢ مارتی ١٩٢٠ بۆ سەرۆکایەتی کۆنگرەی ئاشتی و لێپرسراوی دەوڵەتی فەڕەنگسی نارد، دەیگوت : "کۆنگرەی ئاشتی کەوتۆتە ژێر پڕوپاگەندەکانی مستەفا کەمال" [٩٤:٢٤٥]، ئەمە لە پاڵ ئەوەی چواردەوری خۆی دابوو بە نزیکەی ٦٠ لە سەرۆکە کوردەکانی ئەو ناوچانەی ئەرمەنەکان چاویان تێ بڕیبوو" [٢٦٩ :٦ -٧].

کەمالیستەکان ئامادە بوون دەست بەرداری هەموو شتێك بن بۆ لێدان و خامۆش کردنەوەی ڕاپەڕینەکانی کورد، بۆیە کاتێك ڕاپەڕینی قۆچگیری دایسا، مستەفا کەمال بە پێویستی زانی بەشێك لە هێزەکانی لە بەرەکانی یۆنان بکشێنێتەوە و شەڕی کوردیان پێ بکات. بەلەزی لیوای سیانزەی سوارەو تیپی چواردەی سوارەی بۆ سیواس نارد، سەرباری ئەمە هێزێکی زۆری نارده خارپوت و ئەرزنجان. بە ئامانجی کۆسپ خستنە بەر پێشوەچوونی کورد لە باکورو ڕۆژهەڵات [٩:٢٤٩:٣٤]. کەمالیستەکان بەر لەوەی بەکاری سەربازی هەڵسن، کەوتنە پڕوپاگەندە کردن بۆ لەیەکترازاندنی ڕیزی شۆڕشگێران. بۆ ئەم مەبەستەش سەرلەشکری

خارپوت بەناوی مستەفا کەمالەوە، بەناو خەڵکدا بڵاوی دەکردەوە کە "مچۆ ئاغا" و "دیاب ئاغا" کە دوو سەرۆکی بەناوبانگی کورد بوون، کراون بە نوێنەری دەرسیم لە ئەنجومەنی باڵای نەتەوایەتی تورکیا. هەروەها دەیانگوت، سەرۆکە کوردەکان، لە هەموو لایەکەوە بەرەو ئەنقەرە دەچن. بەم زوانە داواکاریەکانی کوردستان بە تێکڕایی جێبەجێ دەکرێ [٣٧:٧٤] لە ژێرەوەش سوپایان بۆ سەر کوردستان تەیار دەکرد. لە ١٥ مارتی ١٩٢١ باری ئابڵووقەدانیان لەسەر ویلایەتەکانی سیواس و خارپوت و ئەرزنجان ڕاگەیاند، بۆ ئەوەی نیازی کوردەکانیش بزانن، بروسکەیەکیان بۆ سەرۆکەکانی دەرسیم نارد، تیایدا داوایان لێکردن، دەربارەی هەڵوێستی ڕاستەقینەی خۆیان ئاگاداریان بکەنەوە، کە ئایا لەسەر درێژە پێدانی خەبات مکوڕ دەبن یا نا ؟ سەرۆکەکانی دەرسیم وەرامیان دایەوەو گوتیان : "تا ئێمە لەوە خاترجەم بین کەوا حکومەتی تورکی گەڕەکیەتی کورد لەناو بەرێت، هەروەك چۆن پێشتر ئەرمەنی لەناو برد، بەردەوام دەبین لە خەبات و داکۆکی لەمافە نەتەوەییەکانی خۆمان دەکەین" [١١٢:١٥٦]. شایەنی باسە لەو کاتەدا گۆڕانە نێو دەوڵەتیی و ناوچەییەکانیش لە بەرژەوەندی کەمالیستەکان دا بوو. وەك لەنامەیەکی سەرۆك شالیارانی ئەنقەرە کە ماوەیەك بەر لەو کاتە بۆ هاوکوفی خۆی لە ئەستانەی ناردبوو، هاتبوو : "سیاسەتی پۆزەتیڤانەی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان بەرامبەر تورکیا، لەم دواییەدا لە زیدەبوون دایە. ئەمەش بەرهەمی مکوڕ بوون و گوێڕایەڵی گەلە، ڕەتکردنەوەی پەیمانی سیڤەر لەلایەن ئەنجومەنی باڵای نەتەوایەتی تورك کاودانێکی نوێی هێناوەتە ئاراوە"[٣٨٦:٣٣٤]. لەهەمان کاتدا تورکەکان لەبەرەکانی یۆنانیش سەرکەوتنیان وەدەست دەهێنا. لە ٣١ مارتی ١٩٢١ توانیان لە شەڕی ئینۆنۆی دووەم بەسەر یۆنانیەکان زاڵ بن و ناچاری پاشەکشەیان کردن لەو شوێنانەی کە پێشتر داگیریان کردبوو، بەم جۆرە ئەو هیوایەیان توایەوە کە پابەندی ئەو هێرشانەیان کردبوو. ئەمەش بووە سۆنگەی بەهێزبوونی هەڵوێستی کەمالیستەکان و وورەی بەرز کردنەوە [٤٦:٢٦١]. بۆیە توانیان بە ئاسانی بەگژ ڕاپەڕیوەکانی قوچگیری دابچنەوە. هەر دوای سەرکەوتنەکانیان بەسەر یۆنان، هارنگتون، فەرماندەی هێزەکانی هاوپەیمانان دەسەڵاتێکی فراوانی بەخشی، بۆ هاریکاری کردن لەگەڵ مستەفا کەمال، وەڵێ شێوەو جۆری ئەم هاریکردنەی باس نەکرد [١٧٣:٢١١]. هەر لەو کاتەدا فەڕەنگسیەکانیش هەوڵیاندەدا خۆیان لە کەمالیستەکان نزیك بکەنەوە، لە ٩ حوزەیرانی ١٩٢١، "فرانکلین بویون"یان ناردە لایان، دوای ئاخاوتنێکی زۆر ڕایگەیاند هاتنەکەی

کەسی‌یەو بۆ ئەوەیە تا لەسەر بنەمای پەیمانی سیڤەر لەگەڵ تورکەکان ڕێکەوێ [١٢٣:٩٢].
ئەو هەڵوێستەی فەڕەنگەکان، کەمالیستەکانی بەهێزتر کرد، بۆیە بەگەرمی کەوتنە خۆو خۆیان لەکاروباری باشووری کوردستان - ویلایەتی موسڵ - هەڵقورتاند، بۆ ئەم مەبەستەش یۆزدەمیریان ڕەوانەی ڕواندز کرد، کە یەکێك بوو لە پیاوە زیخ و چاڵاکەکانیان.
ئینگلیزەکان وایان نیشانده‌دا ئەمە مەترسیەکی زۆری بۆ سەر بەرژەوەندیەکانیان هەیە، بۆیە بەر لەوەی شێخ مەحمود بگاتەوە سلێمانی بەماوەیەك سلێمانی‌یان چۆڵ کرد. لەو کاتەدا، یۆزدەمیر نامەیەکی بۆ شێخ قادری برای شێخ مەحمود نارد، لە خاڵی پێنجەمی ئەم نامەیەدا یۆزدەمیر دەیگوت : "شێخ ، دەبێ باش بزانن لیستی ئەو خاکانەی کە لە پەیمانی میللی "**میثاقی میللی**"مان دانراوە، نابێ لەژێر چنگی بێگانەدا بمێنێتەوە. من بۆ ئەوە هاتوومەتە کوردستان ئەم ڕاستەقینە لە برا خۆشەویستەکانی ئێمەو هاوپەیمانەکانمان بگەیەنم، تاوەکو کوردەکانی برای دین و دۆستی دێرینمان نەبنە گوری سیاسەتی ئینگلیزە ناپاکەکان و بەهاندانی ئەوان کۆسپ و تەگەرە نەخەنە ڕێگامان" دوای ئەوە دەیگوت : "لەبەر ئەوە سەرپاکی وولاتی موسڵ خراوەتە ناو پەیمانی میللی تورکەوە، هێزێکی ناپاکی وا بەبیرا نایەت لەناو سنوورەکانی میللی ئێمەدا فەرمانڕەوایی بکا. تا ئیمڕۆ لەشکرە گەورەکانی تورك لە بەرەکانی تردا خەریکی لەشکرەکانی دوژمن بوون، نەدەپرژانە سەر ئەم هەرێمانە، ئەوا بە یارمەتی یەزدان بەرەکانی ڕۆژئاوا لە دوژمن پاك کرایەوە، لەبەر ئەوە لەم کاتژمێرەوە دەست دەکەین بە پاك کردنەوەی ئەم هەرێمەو پشت بەخوا زۆری پێ ناچێ هەرچی ناپاکێك هەیە لە کوردستان، لەگەڵ دوژمنەکان، پاکیان دەکەینەوە" [٢١:٥٩٥].

"چەرچل" پێش کەسانی تر لە حکومەت، هەستی بە پێویستی ڕاگرتنی دەست تێوەردانی تورکەکان کرد لە کوردستان. بۆیە لەسەرەتای ئابی ١٩٢١، لە پەرلەمان ڕایگەیاند کەوا ئارامی لە کوردستان پەیوەستە بەوەی ڕێکەوتنێك لەگەڵ تورکەکان ئەنجام بدرێت [٢٥١:٢٥٥] هەروەها ژەنراڵ تاوزەند، کە لە شەڕی "کوت" لە جەنگی جیهانی یەکەم بەدیل گیرا، ڕای وابوو " پێویستە پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ تورکەکان ببەسترێ. چونکە ڕێکەوتننامەی ئەڵمانی - ڕوسی کە لەو کاتەدا بەسترا، هاوسەنگی ئەوروپای تێکدا"[٨١:٥٢٤]. لەهەمان کاتدا، فەڕەنگسیەکانیش ڕێکەوتننامەیان لەگەڵ کەمالیستەکان مۆر کرد، کە سەرکەوتنێکی گەورەی سیاسی و سەربازی بوو بۆ تورکەکان، چونکە

فەڕەنگەکان بەڵێنیان بە تورکەکاندا هەموو توانایەکیان بخەنە کار بۆ وەدەست هێنانی سەربەخۆییان [١٢٣ :٩٥-٩٦] ئەمە سەرباری ئەوەی نزیکەی (٨٠) هەزار سەربازی تورکی لەو بەرەیە رزگاریان بوو، توانیان بەچەك و تەقەمەنیەوە بۆ بەرەکانی یۆنانیان بنێرن [٢٣٣ :٦٩٢-٦٩٣]. کەمالیستەکان هاوکات لەگەڵ ئەم هەنگاوانە لە ئێرانیەکانیش چوونە پێش، وەك لە رۆژنامەی پێشکەوتنی رۆژی ٢٤ تشرینی دووەمی ١٩٢١ هاتووە : "کۆمیساری کەمالیستەکان لە تاران وا رادەگەیەنێ ئەو ئاخاوتنەی لەنێوان تورکیاو ئێران لە ئارادابوو، بەباشی دوایی هات و هەردوولا رێك کەوتن" [٨١:٣٧٥] وەلێ بەداخەوە خاڵەکانی رێکەوتنامەکەی روونەکردۆتەوە. هەر بۆیە کاتێك شەڕ لەنێوان یۆنانی و تورکەکان گەرم ببوو، ئێرانیەکان داوایان لە کۆمەڵەی گەلان کرد هەوڵبدەن ئەو شەڕە رابگرن، هەروەها گوتیان رای گشتی لە ئێران سەرسام ماوە کەوا بۆچی کۆمەڵەی گەلان، هیچ هەنگاوێکی نەناوە بۆ راگرتنی ئەم شەڕە، کە لەوانەیە جەنگێکی جیهانی لێ بکەوێتەوە [٣٢٢:٩٧].

ئەو سەرکەوتنە جەنگیی و دیپلۆماتیکیانە، باڵا دەستی رەگەزی تورکی کردە شتێکی سەپێنراو، هەروەها شەڕی سەربەخۆیی بووە سۆنگەی باڵا دەستی سیاسی و سەربازی و دیموگرافی رەگەزی تورک [٣٠١:٣٤] لەو دەڤەرەدا، هەر لەگەڵ کۆتایی هاتنی ساڵی ١٩٢١ کێشەی بن دەستکردنی باکوری کوردستان لەلایەن کەمالیستەکانەوە یەکلاکرایەوە. توانیان بەندەکانی سیڤەر رەتکەنەوە. لەم کاتەوە کەوتنە هەوڵی گەڕاندنەوەی باشوری کوردستان. لەپێناو ئەم ئامانجەشیاندا، لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٢ ژمارەیەك لە ئەفسەرانیان نارده سنووری زاخۆ، هەروەها تۆپێك و دوو مەترالۆزیشیان چەسپاندو ناوچەی رۆژهەڵاتی دیجلەو جزیرەیان بەناوچەیەکی جەنگی حسێو کرد. لە مانگی شوبات، بەهێزێکی تر کە لە (١٠٠) چەکدار پێکهاتبوو، پاڵپشتی ئەو هێزەیان کرد [٩١:٤٤] هاوکات لەگەڵ ئەمەدا هەوڵیاندا پەیوەندیەکانیان لەگەڵ شێخ مەحمود فراوانتر بکەن. بۆ ئەم مەبەستەش زۆر بەڵێنیان پێدا، وەلێ وەك لە راپۆرتی ١٩٢٢-١٩٢٣دا هاتووە : "لەگەڵ شێخ مەحمود دەستپاك نەبوون، دەیانویست بیکەنە داردەستێك بۆ جێبەجێکردنی مەبەستەکانی خۆیان" [٣٦:١٢٠]. هەر بۆ فریودانی رای گشتیش، وەك کۆمیساری باڵای بەریتانی لە ئەستانە لەسەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراوەوە گێڕایەوە، لە ٢٩ مارتی ١٩٢٢، لەنێو ئەنجومەنی باڵای نەتەوایەتی تورکی، گفتوگۆ لەسەر دۆزی کورد کرا. دەربارەی لیستێکی (لائحە) یاسایی کارگێڕیەتی تورك بۆ کوردستان.

که بەندی تایبەتی تیابوو بۆ ئەوەی کورد خۆی بەڕێوەبەرێ و زمانی کوردی ببێتە زمانی فێرکردن. بەو مەرجەی نەبێتە بنەمایەك بۆ ئەوەی کورد لە ئایندەدا داوای سەربەخۆیی تەواو بکەن [٣٤٩:٢٧٦]. کەمالیستەکان ئەو پێنگاوە دیماگۆگیانەیان دەنا، لەکاتێکدا بە بەردەوامی تێکۆشەرانی کوردیان لە سێدارە دەدا، وەك لە ژمارە ٩٤ رۆژنامەی پێشکەوتن دا هاتووە، کە لە رۆژنامەی بۆ سفۆری تورکی وەریگرتووە، لە ئامەد (دیاربەکر) رەزا بەگ و عەلی غالب نمایندەی قوماندان، یەکێك لە شاعیرانی کورد بەناوی فەرەج و مستەفای کۆرەی کورد لە میلاك، لەسێدارە دراون [٤١٩:٨١].

دوای سەرکەوتنی تورکەکان لە بەرەی یۆنان * ، سەرکردەکانی تورك خەریکی یاداشت گۆڕینەوە بوون بۆ هەڵسەنگاندنی هێزو توانایان لەپێناو هەڵسان بە هێرشێکی بەرفراوان لەبەرەی رۆژهەڵات و جزیرە بۆ سەر باشوری کوردستان، - ویلایەتی موسڵ - تا ئەو هێزانەی تورك کە لە ناوچەی رواندز بوون پاڵپشتیان بکەن. لەگەڵ ئەم گۆڕانانەی، کە لەسەر ئاستی ناوچەیی و نێو دەوڵەتیدا روویاندا، لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ کۆنگرەی لۆزان بەسترا. بەماوەیەکی کەم دوای ئەوە، مستەفا کەمال لە ئەنجومەنی باڵای نەتەوایەتی تورك بەراشکاویەوە رایگەیاند : "ئەو دەوڵەتەی ئێستا گوراندومانە، دەوڵەتێکی تورکییە !" [٢١:١٠٥]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەوا کەمالیستەکان هەموو خاکی کوردستانیان بەهی تورك زانیوە. بۆیە هەرگیز نەیاندەویست دۆزی کورد لە کۆنگرە نێو دەوڵەتیەکان بەرزبکرێتەوە. یۆزدەمیر لەو نامەیەی لە ١٩٢٢/١١/٣ بۆ شێخ مەحمودی ناردووە، نووسیویەتی : "بۆ ئەوە هاتووین و تێدەکۆشین کە تا سنوورەکانی شاخی حەمرین بگرین، ئەو جێگایانە داگیر دەکەین کە بە وڵاتی تورك دەژمێردرێت و لە دەستوری میللی تورکدا نیشان دراوە [٥٩٩:٢١]. سەیر لەوەدایە، لەلایەك تورکەکان باشوری کوردستانیان بە بەشێکی جوێنەکراوە لە دەوڵەتی تورك دەژمارد، لەلایەکی تر، عەرەب و ئینگلیزەکان، بە بەشێکی

---

* دەربارەی ئەو سەرکەوتنانە، عەبدولقەدیم زەلوم پێی وایە لەو شەڕەدا یۆنانیەکان سەرکەوتنیان وەدەست هێنابوو، بەڵام لەبەر ئەوەی بەریتانیا و فەرەنگساو ئیتالیا داوای ئاگر بەستیان کرد، شەڕیان وەستاندو هێزەکانیان کشاندەوە. واتە کشانەوەی یۆنانیەکان وەك زۆر لەمێژوونوسان باسی دەکەن و کەمالیستەکان پێیەوە دەنازن، لە ئەنجامی شەڕێکی یەکلایی کەرەوە نەبووە، بەڵکو بەناچاری و لە ئەنجامی جەختێکی نێو دەوڵەتی بووە. بەو بەڵگەیەی ئەوان خۆیان داوای ئاگر بەستیان کردووە، ئەوە بوو ئاگر بەستی مودانیایان مۆرکرد [١٦٦:٢١١].

جوێنەکراوەیان دادەنا لە میسۆپۆتامیا ! مەبەستی تورکەکانیش لەم هەوڵانەدا خودی کورد خۆی بوو. وەك حوسێن ڕەئوف بەگ سەرۆك شالیارانی تورك لەکاتی کۆنگرەی لۆزان * گوتی : "هۆی سەرەکی لە داوا کردنەوەی تورکەکان بۆ گەڕاندنەوەی ئەو ویلایەتە، نە ئابووری و نەستراتیژیە، بەڵکو سیاسیەو بەتەواوی بە کوردەوە بەندە، چونکە تورکەکان دەیانەوێ کورد لەنێو قەوارەی خۆیان بتوێننەوە" [٢٤٨:٢٥٥]. لە کۆنگرەی "لۆزان"یش، وەك لە باسەکانی تر ئاماژەی پێکرا، تورکەکان گفتوگۆیان هێنابووە سەر ئەوەی کەوا کوردو تورك یەك ڕەگەزن ! ئینگلیزەکان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان وەرامیان دەدانەوە و دەیانگوت کورد تورك نین. کرزن لەم بارەیەوە گوتی : "کورد نایانەوێ بچنە پاڵ تورکەکان، ئەمەش لەبەر ئەوەی کورد لە ڕەگەزی تورانی نین وەك عیسمەت دەڵێ، بەڵکو وەك هەموو لەسەری ڕێکەوتوون، کورد لە ڕەگەزێکی ترن. داب و نەریت و زمانی خۆیان هەیە، کە لەداب و نەریت و زمانی تورك جیایە". کرزن خۆی لەنێو کوردان ژیابوو، بۆیە گوتی : "من دەتوانم جیاوازی لەنێوان کوردو تورك بکەم، وەك جیاوازیەکانی هەر ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی هەفتە، تەنیا ئەگەر کوێر بم !" [٢٣٦:٢٧٢].

کەمالیستەکان ئەگەر لەسەرەتای سەرهەڵدانیان تا مۆرکردنی پەیمانی لۆزان هەوڵیاندابێ کورد لە خۆیان نزیك بکەنەوە، ئەوا دوای لۆزان، کەوتنە وێزەی و دەستیان کرد بەکوشتن و تواندنەوەی. لە ٣ مارتی ١٩٢٤، واتە هەر لەو ڕۆژەی خەلافەتیان تیا ڕەتکردەوە، بڕیاری داخستنی هەموو خوێندنگا کوردیەکانیان دەرکرد [٢١:١٠٥]. لەمەش جۆرە سەوداکردنێك بەدی دەکرێت لەنێوان کەمالیستەکان و هاوپەیمانەکان، کەمالیستەکان خەلافەت لابەرن، بەرامبەر بەمەش هاوپەیمانان چاو لەهەڵوێست و ڕەفتارەکانیان بەرامبەر گەلی کورد بپۆشن ! وەك ئاماژەی پێکرا، هەر لە کۆنگرەی لۆزان، هاوپەیمانەکان ڕێگای پیادەکردنی ڕەگەزپەرستیان بۆ کەمالیستەکان کردەوە . وەك یەکێك لە دۆستە نزیکەکانی مستەفا کەمال گوتی : "مستەفا کەمال مرۆڤێکی پایە بەرزە، وەڵێ ئەم بیروڕایانەی بەشێوەیەکی شێگیری و کت و پڕ نەهێناوە !"[٧٧:١٣٩]. هەر دوای ئەمەش کەوتنە هەنگاونان بۆ سڕینەوەی هەموو شوێنەوارێکی

---

* هەندێك لە نوسەران ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە نوێنەری تورك لە لۆزان عیسمەت ئینونۆ، لەگەڵ حاخام "حاییم ناحوم" بووە. کاتێك دانوستان لەنێوان کرزن و عیسمەت تەنگژەی تێکەوت، ناحوم لەو کاتەدا لەگەشتێکدا بووە بۆیە بروسکەیەکی نارد کە دەگەڕێتەوە، لەو بروسکەیەدا هاتبوو : "عیسمەت دۆستمە، لەژێر فەرمانی مندایەو ووشەیەکم ڕەت ناکاتەوە ! " [٧٣٤:٣٠٤].

نەتەوەیی کورد، رۆژنامەو چاپکراوەکان داخران، ناوی کورد لەکتێبە مێژوویی و فەرهەنگیەکان سڕایەوە. بۆ سوکایەتی پێکردن نازناوی "تورکی کێوی‌یان" بەسەر کورد بڕی، نیازیشیان لەمە ئەوە بوو لە رووی کولتووری و کۆمەڵایەتیشەوە بیکەن بە تورک [٢٣:١٦١]. لەم بارەیەوە نورەدین زازا لە یاداشتەکانیدا باسی ئەوەی کردووە چۆن لە خوێندنگاکاندا هەوڵیانداوە ئایدۆلۆژیای کەمالیستیان فێر بکەن. نووسیویەتی : "پێیان دەگوتین ئێوە کورد نین، کورد هۆڤینە، نژدن و لە چیاکان دەژین" [٣٩:٢٦٩].

حکومەتی ئەنقەرە لەساڵی ١٩٢٤، هەوڵیدا هەموو ناوچە سنووریەکانی عێراق و سوریا لە رەگەزی ناتورك چۆل بکا. بەجۆرێك هەر شارو گوندێك لەم دەڤەرانە، یەك رەگەزی ناتورك بەرامبەر (١٠٠) رەگەزی تورك بهێنێتەوە [٥١:١٠٢]. مستەفا کەمال خۆی دانی بەم راستەقینە نا کاتێك گوتی : "عەرەبەکان زۆرن و زمانەکەیان زمانی قورئانە، بۆیە ناتوانین بیانکەین بە تورك، وەڵێ بەگوێرەی رەگەزە موسڵمانەکانی تر جیایە، بەتورك کردنی ئەوانە ئەستەنگ نیە. سەرباری ئەمەش ئەوانە لە ئەناتۆلیا دەژین، بۆیە بە تورك کردنیان پێداویستیەکە بۆ دابینکردنی یەکێتی وولاتی تورك، لەبەر هەموو ئەمانە، لەسەر دەوڵەت پێویستە بەبێ وەستان کار بکا بۆ بە تورك کردنیان[٣١٩:٢٦٨]. تورکەکان ئەم هەنگاوانەیان وەك بەشکچی دەڵێت : "بە پێشکەوتووخوازو دیموکراسی پێناسە دەکرد !" [٦٤:١]. نەك تورکەکان، بەڵکو سۆڤیەتیەکانیش، کە رۆڵێکی دیاریان هەبوو لە یارمەتیدان و بەهێزکردنی کەمالیستەکان، هاوڕای تورکەکان بوون. باڤلۆڤیچ کە یەکێك بوو لە هزرڤانە دیارەکانی روس، لە ساڵی ١٩٢٤ گوتی : "تورکیا هەندێك چاکسازی ناوەخۆی پێشکەوتووخوازی ئەنجامداوە" بەشێوەیەکی تایبەتیش ئەو هەوڵانەی پەسند کرد کە مستەفا کەمال بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتی پێی هەڵسابوو[٤٣:٢٧٧].

لە ساڵی ١٩٢٤ حکومەتی تورکی بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی خۆی لە کوردستان، هەوڵەکانی خۆی چڕترو بەهێزتر کرد. لەمانگی ئەیلول شەش تیپی پیادەی نوێی نارد بۆ ژمارەیەك لە ویلایەتەکانی کوردستان. هەروەها فشاریان خستە سەر ژمارەیەك لە سەرۆك هۆزەکانی کورد بۆ ئەوەی خۆیان بۆ ئەنجومەنی باڵای نەتەوایەتی هەڵنەبژێرنەوە [٢٢:١٠٥]. ئەو سیاسەتەی کەمالیستەکان کوردی ناچار کرد لە ترسی مانەوەو بوونی نەتەوایەتی خۆی، ئاوری شۆڕش دایسێنێ. ئەوە بوو لەساڵی ١٩٢٥ راپەڕینێکی گەورەی کوردی دایسا، کە لە

مێژوودا بەڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیران دەناسرێ، ئەگەرچی ئەم ڕاپەڕینە ڕەنگدانەوەی مەترسیەکانی کورد بوو لە لەناوچوون و تواندنەوە، هەر لایەك هەوڵیدا بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانی خۆی وەریچەرخێنێ ! تورکەکان بەهەلێکی لەباریان زانی بۆ ئەوەی دەست بکەن بەڕەشەکوژی کورد و سیاسەتە شۆفینستیەکەیان ئەنجام بدەن، ئینگلیزەکان بەکارتێکی باشی تێگەیشتن بۆ ئەوەی لە دۆزی باشوری کوردستان - مەسەلەی موسڵ - لە دژی تورکەکان بەکاری بهێنن. وەك لاهوتی دەڵێ : "لەم زۆرانبازیەدا هەردوولا هەوڵیاندەدا تایبەتمەندیەکانی بزاڤی نەتەوەیی کورد لەپێناو وەدیهێنانی ئامانجەکانی خۆیان بەکاربهێنن، بیروباوەڕی جوێخوازی کوردی، بەشێوەیەکی زیرەکانە لەلایەن دیپلۆماتە ئینگلیزەکانەوە جۆش دەدرا، بۆ ئەوەی وەك چەکێك بە دەستیانەوە ببێتە ئەگەری لاوازی و شکستی سیاسەتی تورکیا لە میسۆپۆتامیا" [١٥٥:٥٥]. ئەم بارە ئالۆزە وایکرد، هەرچەندە ڕاپەڕینەکە نرکەیەکی دلێرانەی گەلی کورد بوو دژی چەوساندنەوەو زۆرداری کەمالیستەکان، زۆر لەخۆی گەورەتر بکرێت ! تا ببێتە پاساودانێك بەدەست تورکەکان و بەو پەڕی دڕندەییەوە بکەونە ویزەی کورد. ئەمەش لە ئەنجامدا بەدڵی تورکەکان وەرچەرخا، بەهاریکاری دەوڵەتانی هاوسێ و هاوپەیمان، بەدڕندەترین شێوە بەربوونە گیانی کوردی ستەمدیدە. سەرباری کوشتن و بڕین سڵیان لە هەتك کردنی ئابڕووی کچە کوردان نەکردەوە، وەك شەمزینی نوسیویەتی: "لە چەبەقچور ٢٨ کچی کوردیان گرت، کچەکان دران بە ئەفسەرەکان و پاشان بەسەربازەکان، ئینجا کە کاریان پێیان نەما، مەمکیان بڕین و لەناویان بردن" [٨٧:٢٨]. وەلێ ئەو جەورو ستەمە دیماهی بە دۆزەکە نەهێنا، وەك پەرلەمانتارێکی تورك گوتی : "گڕی سووری ئەو شەڕانە دیماهی دۆزەکە نین، بەڵکو سەرەتای دەستپێکی خەباتی نێوان دوو ڕەگەزە، ڕەگەزی کورد، کە ئەورو پاییەکان وەکو خۆیان بە ئاری نەژادو ڕەگەزی تورك، کە بە مەغۆل نەژادیان دادەنێن" [١١٧:٢٨] ئیحسان نوری لەم بارەیەوە سەرسامی خۆی دەردەبڕێ، لەوەی کە تورکەکان دەڵێن : "ئێمە ئەو کوردانەی باکور کە داوای مافی مرۆڤایەتی و نەتەوەیی دەکەن، هەموویان دەکوژین، هەموویان سەردەبڕین، ویلایەتی موسڵیش هەر دەگرینەوەو لەوێش بەهەمان دەردیان دەبەین" [٣٥:١٠]. ئەم کارانەی ئەتاتورك وای لە نووسەرێکی سویدی کرد مستەفا کەمال بە " باوکی لەناو بردنی ئیتنیکی دابنێت، بەڕای ئەو سوڵتانەکانی عوسمانی گەلێك

لەناسیونالی چنگ بەخوێن، مستەفا کەمال، شارستانی تر بوون" [٢٣:١٦٦]. تەنانەت تورکەکان ئەم راپەڕینەی کوردیان کردە بیانگەیەك بۆ لێدانی بەرهەلستکارەکانی خۆشیان. لە مارتی ١٩٢٥ یاسای پاراستنی ئارامی کرایە ئامرازێك بۆ قەدەغەکردنی دەرچوونی رۆژنامەی بەرهەڵستکاران و، یانە کرێکاریەکان لە ئەستانە داخران، هەڵمەتی دەستگیرکردنی هەموو بەرهەڵستکارەکان دەستی پێکرد [١١٧ :١٥-١٦].

ئینگلیزەکان ئاگاداری هەموو ئەو رەفتارانەی کەمالیستەکان بوون، بێ دەنگ بوونیشیان نیشانەی رەزامەندیان بوو، لە تشرینی دووەمی ١٩٢٦ کاتێك هنری دوبس، کۆمیساری باڵای ئینگلیز لە عێراق، لە توفیق رەشید بەگ، شالیاری کاروباری هەندەرانی تورکی پرسی : کە ئایا نیازیان وایە کوردەکانی ئەناتۆلیاش راگوێزنەوەو بەدەردی یۆنانیەکان و ئەرمەنیەکان بەرن؟ . زۆر بەڕاشکاوی وەرامی دایەوە : "کەوا تیوری فەلسەفی مێژوویی و سیاسی تورك زۆر روونە. نازانم سیاسەتوانان خراوحاڵی بوون یا نایژنەون ! سەربەخۆی گشتی بۆ خەڵکێك کە لە ملوێنێك زێتر نین هەرگیز ناشێ، کوردەکان هەردەبی بەم جۆرە بەر فەرمان و چەوساوە بن" [٣٤:٥٤]. تورکەکان بۆ سڕینەوەی مێژووی کورد، زۆر توێژینەوەی وایان دەرخست کە باسی یەك رەگەزی کوردو تورکی دەکرد. بۆ پتەوکردنی بازنەی تواندنەوەکە، سیاسەتوانەکانیان پەنایان بۆ ئەوە برد جیاوازی رۆشنبیری و مەزهەبی، وەك پێداویستیەك لە سیاسەت رەتکەنەوە، کە بتوانێ داوای دامەزراندنی حیزب، یاخود بزاڤی سیاسی، یا رێبازی هزری بکات و کار بکاتە سەر بەهەرمێن خستنی ئەو تایبەتمەندیانە لەنێو کۆمەڵگادا [١٠٩:١٠٩]. کەچی سەرباری ئەو هەولانەی کەمالیستەکان، هێشتا کورد لە کوردستان زۆرینەی پێکدەهێنا. لەو سەرژمێریەی لە ساڵی ١٩٢٧ ئەنجامدرا، کە بێگومان ساختەشی تیا کراوە ! ئەوەی دەرخست، "کورد لە ٧٧٪ دانیشتوانی ویلایەتی وان و ٧٥٪ ویلایەتی دیاربەکر و هەکاری ٦١٪ ویلایەتی مێردین و ٥٣٪ خارپوت پێکدەهێنین" [٢٤٩:٩٢].

سەرباری ئەم سیاسەتە کەمالیستیە ! باری ئابووری جیهانیش بەرەو نالەباری و تەنگژە دەچوو. لەو کاتەدا زەوی و زاریان لە کورد دەسەندو دەیاندا بە تورکەکان. هانی فەرمانبەرانی تورکیان دەدا بۆ کوردستان کۆچ بکەن، لە تەموزی ١٩٢٧ یاسای ژمارە (١٠٩٧)یان دەرکرد، بەپێی ئەم یاسایە، نزیکەی ١٤٠٠ خێزانی کورد گوێزرایەوە بۆ ناوچەکانی باکور،

هەروەها بەکاری سەخت مەحکوم کران [١٥٥:٣٤]. کە ئەمەش شێوازێك بوو بۆ لەناو بردنێکی لەسەرەخۆی ئەم خێزانە کوردانە. هەر لە هەمان ساڵدا، شالیاری ناوەخۆی تورکیا، لە ئەنجومەنی باڵای نەتەوایەتی، گۆڕینی شێوازی کارگێڕی لە کوردستان راگەیاند. بەگوێرەی ئەو یاسایە، ویلایەتەکانی خارپوت و روهاو بەدلیس و هەکاری و دیاربەکر و سیرت و مێردین بوون بەناوچەیەکی تایبەت، کە پشکنەرێکی گشتی سەرۆکایەتی دەکرد، هەروەها لە ساڵی ١٩٢٩ یاسای ژمارە ١٥٠٥ دەرچوو کە بەپێی ئەو یاسایە زەوی کوردیان بەسەر تورك دابەشکرد [١٠٥:٢٤٩].

لە ٣٠ ئابی ١٩٣٠، بەبۆنەی کردنەوەی هێڵی شەمەندەفەری سیواس عیسمەت ئینونو رایگەیاند : "کە تەنیا تورك بۆی هەیە داوای مافی رەگەزنامەو ئەتنیکی بکا لەم وولاتەدا، هیچ رەگەزێکی تر ئەو مافەی نیە"، هەروەها گوتی : "ئەو یاخی بوونەی کە بۆ ماوەی پێنج ساڵە لە ئارادایە، تا ئێستاش لەناوچەکانی رۆژهەلات بەردەوامەو لە دەرەوە ئاورەکەی خۆشدەکرێت، ئەمڕۆ نیوەی هێزی خۆی ونکردووە. تەنیا نەتەوەی تورك مافی دانانی یاسای هەیە لەم وولاتەدا، هیچ رەگەزێکی تر ئەو مافەی نیە، رۆژێکیش کە ئەو هێڵە دەگاتە سنوور هەموو یاخی بوونێك دەتوێتەوەو هەموو پلاتێکیش بێ بەرهەم دەبێت" [٥١:٢٤٣]. عیسمەت مەبەستی لەم یاخی بوونە، راپەڕینەکەی ئاگری داغە. مستەفا کەمالیش لە ئەنجومەنی باڵای نەتەوایەتی تورك دەیگوت : "شادم لەبەردەمی ئێوە رابگەیەنم، کە نەمانهێلاوە و ناشهێڵین، هیچ جۆرە شتێك دەرفەتی ئەوەی هەبێت ببێتە کۆسپ لەبەردەم نەتەوەکەمان، لەوەی بگاتە پلەیەکی بەرزی شارستانی و ئەو خۆشبەختیەی شایستەیەتی [٦١:٣٩]. دوای ئەوەی رێگایان نەدا کورد ببێتە کۆسپ لەبەردەم بە شارستانی بوونیان ! وەك لە ژمارە ١٢ ساڵی ١٩٣١ی دەنگ و باسی رۆژهەلاتی ناڤین، دەربارەی هێرشی تورکە کەمالیستەکان بۆ سەر کورد هاتووە : "کەمالیستەکان لە کوردستاندا هەموو جۆرە چەکێکی تازەیان بەکارهێناوەو هەموو رێگایەکی خوێنرێژی و پیاو کوشتنیان گرتۆتە بەر بۆ ئەوەی بزاڤی ئازادیخوازی کورد کپ بکەنەوە. بە تۆپ و فڕۆکە گوندەکانیان بەتەواوی خاپوور کردو گاو گۆتاڵ و پەزی کوردانیان تالان کردو قڕیان خستە دانیشتوان، بەبێ ئەوەی جیاوازی لەنێوان منداڵ و ئافرەتی بێ دەرەتاندا بکەن"[٢٦٣:٤١]. بەم جۆرە کەمالیستەکان هەوڵیاندا کورد بکەن بە تورك و کوردستانیش بە تورکستان. تەنیا لە ساڵی ١٩٣١، بڕیاریاندا، ١٠٠ هەزار تورکی بولگارستان و یوگسلافیا

بنێرنە هەندێك لەناوچە کوردیەکان، بە ئامانجی بەهێزکردن و زێدەکردنی ژمارەی دانیشتووە تورکەکان لە کوردستان [٨٣:٣٦]. بلەج شێرکۆ جوانی نووسیوە کە دەڵێ: " لەو ڕۆژەوەی تورك پێیان ناوەتە خاکی پاکی کوردستانەوە، ئارام و پشویان نەبووە بۆ لەناوبردنی زمانی کوردو نەتەوایەتیان و گاڵتە کردن بە کەلتوورو ئایین و خووڕەوشتیان. بۆ ئەم مەبەستەش، ئەم تورکانە بۆ ئەوەی زێتر کورد لەهەڕەمەکێتی و نەزانین نزیك بکەنەوە، هەموو دەرگاکانی زانین و شارستانیان لە ڕوودا داخستوون" [٣٤:١١].

بەم جۆرە کەمالیستەکان، بەسوود وەرگرتن لە ململانێ نێو دەوڵەتی و ناوچەییەکەدا، بەشێکی گەورەی کوردستانیان لەبن دەستی خۆیان هێشتەوە، سەرباری ئەوەی وەك ئاماژەی پێکرا بەگەرمی کەوتنە تواندنەوەو لەناو بردنی کورد، هاوکات دەستیان کرد بە هاریکاری هێزە ناوچەیی و هاوسێکانیان بۆ ئەوەی ئەوانیش کوردەکانی خۆیان بەم دەردە بەرن. لەناوبردن و تواندنەوەی گەلی کورد، بو بە سیاسەتی ڕەسمی دەوڵەتی تورك، ئەو یاسایانەی لە ساڵانی ٣٠ دا دانران، بەتایبەتی دوای سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی ئاگری داغ، کوشتنی گیانی نەتەوەیی کوردو هووشیاری‌یانی ڕەچاو کردبوو [١٩٧:٨] ئەمڕۆشی لەگەڵدابێت، تورکەکان هەمان سیاسەتی کەمالیستی بەرامبەر کورد پیادە دەکەن.

## باسی دووەم : ململانێی دەسەڵاتداری ناسیونالیستی عەرەب لەسەر کوردستان

بیری نەتەوە پارێزی لای عەرەب، وەکو هەموو نەتەوەکانی تری بن دەستی عوسمانیەکان، لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا بەرەو پێشوەچوون دەچوو. ئەوانیش وەکو گەلانی تر کەوتبوونە دامەزراندنی کۆمەڵەو ڕێکخراوی سیاسی.

لاوە عەرەبەکان لە ١٨ حوزەیرانی ١٩١٣ لەژێر سایەی فەرەنگەکان کۆنگرەیەکیان گرێدا. ئەمەش یەکەمین ڕاگەیاندن بوو لەلایەن عەرەبەکانەوە بۆ چوونە پاڵ هاوپەیمانان دژی دەوڵەتی عوسمانی [٢١١:٣٠]. لەو سۆنگەیە بوو ئینگلیزەکان دواتر داکۆکیان لەعەرەب دەکرد. بۆ وێنە کاتێك "عەزیز میسری" لەلایەن عوسمانیەکانەوە دەستگیر کرا. ڕۆژنامەی تایمز لە یەکێ لە ژمارەکانی نووسی : "ئەگەر زوڵم لەو ئەفسەرە عەرەبە ئازایە کرا، ناتوانرێ لەوە زێتر سالوخدان بکرێ، کە تاوانێکی کوشتنەو بەرگی یاسایی پۆشیوە. ئەمەش کاریگەریەکی ترسناکی لەسەر پەیوەندیەکانی نێوان عوسمانی و میسریەکان دەبێت. لەوانەیە کاریگەریەکەشی بەتەنیا لەسەر پەیوەندیەکانی ئەم دوولایەنە نەوەستێ ! [١٣٢:١٥٠].

کە جەنگی جیهانی یەکەم دایسا، نەتەوە بن دەستەکانی دەوڵەتی عوسمانی بێ دەستی خۆیان کەوتنە نێو داوی ئەم جەنگەوە. لەبەر ئەوەی عوسمانیەکان بەسەرداری جیهانی ئیسلامی حسێو دەکران، ئەڵمانەکان هەوڵیاندا لەپاڵ خۆیاندا بیانخەنە جەنگ. ئینگلیزەکانیش بۆ ئەوەی ئەم هەوڵەی ئەڵمانەکان چرووك بکەن لە ساڵی ١٩١٥ کەوتنە خۆ نزیك کردنەوە لە عەرەبەکان. دەستیان بەنامە گۆڕینەوە کرد لەگەڵ حوسێنی شەریفی مەکە. کە لە تەموزی ١٩١٥ تا مارتی ١٩١٦ خایاند. حوسێن لە دانوستانەکەی لەگەڵ ئینگلیزەکان پشتی بە پەیمانی میللی (**میثاقی میللی**) عەرەبەکان بەست، کە "کۆمەڵەی لاو" و "کۆمەڵەی عەهد" تەیاریان کردبوو. داوایان دەکرد بەریتانیەکان دان بەسەربەخۆیی وڵاتی عەرەبدا بنێن، کە سنوورەکەیان بەم جۆرە دیاریکردبوو، لە باکورەوە هێڵی مارسین - ئەدەنە، هاوتەریب لەگەڵ هێڵی پانی ٣٧ باکور، پاشان لەگەڵ سنووری ئێران تا دەگاتە کەنداوی فارس، لە خوارەوەش تا ئۆقیانووسی هیندی، بەهەڵاویردنی عەدەن. لە ڕۆژئاواشەوە بەدرێژایی دەریای سوور و پاشان دەریای سپی تا دەگەیشتەوە مارسین [٣٥٥:٨٣].

کاتێك شەریف حوسێن لە بەهاری ١٩١٥ خەریکی دانوستان بوو لەگەڵ ئینگلیزەکان، فەیسەڵی کوڕی بە سەرۆکایەتی نێردەیەك ناردە لای دەسەڵاتدارانی تورك و مل کەچی خۆی بۆ دوپات کردنەوە، هەروەها بۆ ئەوەی بچێتە ناوەوەی رای گشتی عەرەب لەو شوێنە کە شوێنێکی گرنگی پڕوپاگەندە بوو [١٥٨: ١١٦-١١٧]. بەم جۆرە وەك یەکێك لە نوسەرەکان دەڵێت : "شەریف حوسێن جیهانی خستبووە سەرسامیەوە. لەلایەك ئاڵای ئینگلیزی بەرز دەکردەوە، لەلایەکی تر سەربەخۆی خۆی رادەگەیاند. هاوکات لە مزگەوتەکان ووتاریان بەناوی عوسمانیەکان دەخوێندەوە!"[٣٣٥: ٦٩١-٦٩٢].

راکێشانی عەرەب بۆ ئینگلیزەکان بایەخێکی گەورەی هەبوو، بۆیە ئامادەی خۆیان نیشاندا بۆ جێبەجێکردنی زۆربەی داواکانیان. لەو نامەیەی مەکماهون لە ١٩١٥/١٠/٢٤ بۆ شەریف حوسێنی نارد، تیایدا باسی ئەوەی دەکرد کەوا لەو ناوچانەی بەریتانیەکان تیایدا ئازادن، بەبێ ئەوەی گوێ بە بەرژەوەندی هاوپەیمانەکەیان، واتە فەرەنگەکان بدەن، دەسەڵاتی پێدراوە، کە بەناوی حکومەتی بەریتانیا، عەرەبەکان دڵنیا بکاتەوە، ئەگەر مل کەچی ئەو گۆڕانانە بن کە لەسەرەوە ئاماژەیان بۆ کردبوو، ئینگلیزەکان ئامادەن دان بەسەربەخۆی عەرەبدا بنێن، لەو ناوچانەی شەریفی مەکە سنوورەکەی دیاریکردبوو، هەروەها ئامادەیی بەریتانیای دەربڕی بۆ یارمەتی دانیشیان [٣٤٩: ١٢-١٣]. بێگومان داواکاریەکانی شەریفی مەکەش، وەك ئاماژەی پێکرا، بەشێکی گەورە و گرنگی کوردستانی دەگرتەوە. لەو کاتەوەش کوردستان شوێنێکی گرنگی لە دانوستانەکانی نێوان عەرەب و ئینگلیزەکان داگیر کرد.

شایەنی باسە، ئینگلیزەکان لەکاتێکدا لەگەڵ عەرەب خەریکی دانوستان بوون، هاوکات لەگەڵ فەرەنگ و دواتریش روسەکان دانوستانیان دەکرد، بۆ پارچە کردنی دەوڵەتی عوسمانی، کە ناوچەی عەرەبەکانیشی دەگرتەوە. بەم جۆرە پەیماننامەی سایکس-پیکۆ مۆرکرا. کە هەمدیس، بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیەش، بەشێکی کوردستان خرایە سەر ئەو دەوڵەتە عەرەبیانەی کە دەبوایە لە ناوچەکانی B و A دابمەزرێن [٢٣٧]. ویلسن دەربارەی دامەزراندنی دەوڵەتی عەرەبی لە میسۆپۆتامیا نووسیویەتی : "کاتێك پلانی دامەزراندنی حکومەتێکی عەرەبی لە میسۆپۆتامیا داڕێژرا، هێشتا بەغدا نەکەوتبووە بن دەستمان. لەکاتێکدا عەرەبەکانی میسۆپۆتامیا خۆیان بەبەشێك لەدەوڵەتی تورکی دادەنا، لەهەر شێوەیەك لە شێوەکانی ئۆتۆنۆمیان، لەژێر سایەی سوڵتان زێتر داوا نەدەکرد" [١٢٨:١٤٩]. دوای داگیرکردنی بەغدا، مود بەیاننامەکەی بلاوکردەوەو دواتریش لەشکری ئینگلیز بەرەو کوردستان هەڵزنا،

چاو ساغ و سیخوڕەکانی ئەڵمان و تورك، ڕووداوەکانیان وا بـۆ کـورد ڕوون دەکـردەوە، کـە ئینگلیزەکان خۆیان بۆ ئەوە تەیار دەکەن، کورد بخەنە بن دەستی عەرەب و هیچ نیازێکیان نیـە دان بەمافەکانی ئەواندا بنێن [٦٦٤:٤٦].

ئەو کاتەی عەرەبەکان چاویان بڕیە خاکی کوردستان، بەسەرەتایەك دادەنرێ بۆ دەسـت پێکردنەوەی ناکۆکی نێوان کوردو عەرەب لەسەردەمی نوێدا. ئینگلیزەکان لـەم ململانێیـەدا پاڵپشتی عەرەبەکانیان دەکرد. چونکە بەرژەوەندیەکانیان لەگەڵ عەرەب یەکی دەگرتـەوە. لـەو سۆنگەیەش بوو، کاتێك عیزەت مەدفەعی، لەکاتی جەنگدا بە نوێنەرایەتی شـێخ مـەحمود چـووە لای ئینگلیز، چ لەبەغداو چ لە کەرکوك، پێیان گـوت پێویستـە ئێـوە پـەیوەندی بـە شـەریف حوسێن بکـەن لـە حیجـازو لـەرێگای ئەوانـەوە داخوازیـەکانی خۆتـان پێشـکەش بکـەن [٣٦٧:٤١].

هەر بەچەند ڕۆژێك دوای ئاگر بەستی مودروس، شالیارگەی هیندسـتان بروسکەیەکی بۆ ویلسن نـارد، پێیـان ڕاگـەیاند ئـەو توانایـە هەیـە سـەرنجی هـاوڕێ عەرەبـەکانیان بـۆ ئـەوە ڕابکێشن کە نایانەوێ جێیـان بـهێڵن و هـەرگیز واز لـەو کـارە گرنگـە نـاهێنن کـە دەسـتیان پێکردبوو. لەهەمان کاتدا ئەوەی تیا ڕوونکردبوەوە کە ئـەوان بایـەخ بـە چارەسـەری لـەبارترین حکومـەت دەدەن بـۆ ئـەم وڵاتـە [٢١٠:٧٣]. هـەر لـەپێناو دیـاریکردنی باشـترین شـێوازی حکومەتیش، شالیارگەی هیندستان بروسکەیەکی تری بۆ ویلسن نارد، تیـایدا داوایـان لێکـرد کە رای گەلی میسۆپۆتامیا دەربارەی ئەم خاڵانـەی خـوارەوە وەرگـرێ : ١- ئایـا دامـەزراندنی یـەك دەوڵەتی عەرەبی پەسند دەکەن، لە سنووری باکوری ویلایەتی موسڵ تـا دەگاتـە کـەنداوی فارس لەژێر سەرپەرشتی بەریتانیا ؟. ٢- ئەگەر وابێ، ئایا وای دەبینن کە ئەو دەوڵەتـە عەرەبیـە لەبن فەرمانڕەوایی میرێکی عەرەبی بێت ؟. ٣- لەم بارەیەوە کێ لە میرەکانی عـەرەب پێشـنیار دەکەن ؟ [٢٢٣:٥]. ئەمە ئەوە ڕوون دەکاتەوە، کە هـەر لـەو کاتـەوە شـالیارگەی هیندسـتان، سنووری باکوری ویلایەتی موسڵی، کە دەکاتە باشوری کوردستان، کردۆتە سـنووری بـاکوری ئەو دەوڵەتـە عەرەبیـەی گـەرەکیان بـوو لـە میسـۆپۆتامیا دایـمەزرێنن. لـەکاتێکدا دڵنیـابوون خەڵکی ئەم دەڤەرە هەرگیز فەرمانڕەوایی عەرەبیان قبوڵ نیـە، لـەم بارەیـەوە لیچمـەن لـە ٢٢ کانونی یەکـەمی * ١٩١٨ ڕاپۆرتێکـی نووسـی، کـە تیـایدا هـاتبوو : "دەربـارەی هەڵوێسـتی خەڵکی ویلایەتی موسڵ، هـەموو دیانـەکان لایـەنگری سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی بەریتانیـەکان

---

* دەربارەی ئەو ڕاپۆرتە، فاضل حسین لەکتێبەکەیدا "مشكلە الموصـل" دەیگەڕێنێتـەوە بـۆ ٢٢ ئـەیلول کەچی ویلسـن لەبـەرگی دووەمـی کتێبـەکـەیدا ٢٢ کـانونی یـەکـەم، بـەمێژووی نووسینی ئـەم ڕاپۆرتـە دادەنێ، لەبەر ئەوەی خۆی لەناو ڕووداوەکاندا ژیاوە، مێژووەکەی ئەومان بەڕاستتر زانی.

دەکەن، لەوانەش کلدان و **کاثولیکە کان**. کە پێشتر لایەنگری فەرەنگەکان بوون، ئێستا لە ترسی فەرمانڕەوایی عەرەبی هەڵوێستی خۆیان گۆڕیوە. هەروەها یەزیدیەکانیش لەهاتنی فەرمانڕەوای دیرئەلزور ترسان، کە نوێنەری شەریف حوسێن بوو، بۆیە بەشێوەیەکی ڕەسمی داوایان کرد دەڤەرەکەیان نەخرێتە بن دەسەڵاتی پیاوێکی موسڵمان، هەروەها کوردەکان کە نیوەی ئەم دەڤەرەو سێیەکی ویلایەتی موسڵیان پێکدەهێنا دژی عەرەب بوون" [۳۳۰:۱۲۹]. واتە هەموو چین و توێژەکانی کوردستان، بەجیاوازی ئاینیەوە دژی دەسەڵاتی عەرەب بوون. ویلسن خۆشی کاتێك لەهەمان مانگدا سەردانی سلێمانی کرد، دەڵێ: "بەشێوەیەکی گشتی هەموویان پاراستنی بەریتانیان دان پیا دەناو بە پێویستیان دەزانی، بۆ ئەوەی لە دوارۆژدا بەتێرو تەسەلی و بە ئارامی بژین، هەندێکیان داوایان کرد کوردستان ڕاستەوخۆ لە لەندەنەوە بەڕێوە ببرێت" [۱۹۰:۱٤۰]. وەلێ ئینگلیزەکان لەپێناو بەرژەوەندیەکانی خۆیان، گوێیان نەدایە رای خەڵکەکە. هانی کەمینەی عەرەبی سونیان دا بۆ ئەوەی دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتە عەرەبیە بگرێتە دەست، کە کاریان بۆ دامەزراندنی دەکرد. بۆیە بزاڤی نەتەوەیی عەرەب لەعێراقدا لەنێو عەرەبی سونیدا سەری هەڵدا و پەرەی سەند، کە هەر لەسەرەتاوە بزاڤێك بەرامبەر شیعە تایفەگەرو بەرامبەر کوردو رەگەزەکانی تریش شۆفینست. بۆیە بزاڤی ناسیونالیستی عەرەب، کە لە هەمێزی ئینگلیزەکان فرازی بوو، هیچ توخمێکی ڕوشنگەری و نوێخوازی بەخۆوە نەگرتبوو [۱۸۷:۲۳].

بەم جۆرە بیری ناسیونالیستی توندڕەوی عەرەب وورده وورده لەگەڵاڵە کردن و پەرەسەندن دابوو. لە زستانی ۱۹۱۹ کۆمەڵەی "عەهد" کە لقێکی لە میسۆپۆتامیا کردەوە، ئامانجی سەربەخۆی میسۆپۆتامیا و بەستنەوەی بە سوریاوە بوو، لەسایەی بنەماڵەی هاشمیەکان لە حیجازە ئەو کۆمەڵەیە لەژێر سەرکردایەتی یاسین هاشمی بوو، دواتریش فەیسەڵ کەوتە بن کاریگەری ئەم کۆمەڵەیە [۱۳۰: ۱٦-۱۷] بۆیە لەو یاداشتنامەی کە لە ۲۹ کانونی دووەمی ۱۹۱۹ پێشکەش بە کۆنگرەی ئاشتی کرد، داوای سەربەخۆیی زۆربەی گەلانی ئاسیای کرد، ئەوانەی بەعەرەبی داخێون و لەباشوری هێڵی ئەسکەندەروونەو ئامەد (دیاربەکر) نیشتەجێن. بەگوێرەی ووتەکانی ئەو، هەموو گەلانی ئەم دەڤەرە بەعەرەبی داخاوتن ! یەك رەچەڵەکی سامیشیان هەبوو، رەگەزەکانی ناعەرەبی بە ۱٪ دانیشتوان دادەنا ! بەم لە گوینە فەیسەڵ بە ئاشکرا باشورو باشوری رۆژئاوای کوردستانی بە عەەرەبستان و خاکی عەرەب دادەنا، داوای لکاندنیانی دەکرد بەو دەوڵەتە عەرەبیەی هاوپەیمانەکان بەڵێنی دامەزراندنیان پێ دابوو [۱٥۰:۲٥٥] ئەم داوایەی (فەیسەڵ)یش کت و مت داواکانی کۆمەڵەی "عەهد" بوو. کە سنووری سروشتی میسۆپۆتامیایان بۆ سێ ناوچە پارڤە دەکرد. باکورو ناڤین و باشور. سنووری

باکور، کە سنووری فورات بوو، دەکەوتە باکوری دیرئەلزوورو کەناری دیجلە، لەنزیك باکوری "ئامەد"ەوە تا کەنداوی بەسرە بوو. هەردوولای دیجلە و فوراتی، لەدەستە راست و دەستە چەپیش دەگرتەوە، کە بە کۆسپی سروشتی سنووردار بوون [٤٨:٢١٠].

هەر بەمەشەوە نەوەستان، بەڵکو دژی بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردیش کەوتنە کار، کاتێك شێخ مەحمود لە حوزەیرانی ١٩١٩، لەشەڕی دەربەندی بازیان بە برینداری بەدیل گیرا. لێپرسراوە عەرەبەکانی بەغدا، هەمان رای ویلسنیان هەبوو، کە شێخ مەحمود لێبوردنی بۆ دەرنەچێ، چونکە پێیان وابوو بە لە سێدارەدانی، ئارامی لە باشوری کوردستان دەچەسپا [١٩:١٤٥]. هەروەها دواتریش لە کۆنگرەی سوریا، کەلە ٨ مارتی ١٩٢٠ بڕیاری لەسەر درا، لە یەکەمین بەندیدا هاتبوو : "دەوڵەتی سوریا لە هەموو ئەو زەویانە پێکدێت کە لەبن مانداتی فەرەنگسیدا بوو" [٧٦:١٧٠]. واتە بەشێکی زۆری رۆژئاوای کوردستان، کەبەر ماندانی فەرەنگسی کەوتبوو، بەخاکی عەرەبانیان حسێو کرد. ئەمە سەرباری ئەوەی ئەو حکومەتە عەرەبیەی لەدوای جەنگەوە لە سوریا دامەزرابوو، بەچاوێکی تژی گومانەوە سەیری کوردیان دەکرد. بەو پێیەی کورد لە جەنگدا پشتی عوسمانیەکانیان گرتبوو. ئەو رەگەز پەرستیەی عەرەب وایکرد، کاتێك فەرەنگەکان گەڕانەوە دیمەشق، کوردەکان بەخۆشحاڵیەوە پێشوازیان بکەن [٧٩:٧٨].

سەرباری ئەو نزیك بوونەوەی نێوان ناسیونالیستەکانی عەرەب و ئینگلیزەکان. نەشیان رێگا لەو هەڵچوونە جەماوەریە بگرن، کە لەئەنجامی تێکچوونی باری ئابووری لەلایەك و سەرهەڵدانی دژایەتیەك لەنێوان عەقلیەتی عەشایری عەرەبی لەلایەکی تر کە شێوازی کارگێڕی نوێی ئینگلیزەکانی بۆ قوتنەدەدرا، بووە سۆنگەی دایسانی ئەو راپەڕینەی کە لەمێژووی نوێی عەرەبدا بە شۆڕشی بیست ناسراوە. هەرچەندە هێزە عەشایریەکانی عەرەب بەو پەڕی درندەییەوە رەفتاریان لەگەڵ هێزەکانی ئینگلیز دەکرد، وەلێ ئینگلیزەکان لەپێناو بەرژەوەندیەکانی خۆیان، ئەو رەفتارانەیان دیزە بەدەرخۆنە دەکردو دەیانشاردەوە. وەك "گاربیت" راوێژکاری دارایی بەریتانیەکان بۆ یەکێك لە رۆشنبیرانی عەرەبی گێڕایەوە، عەرەبەکان وەکو پەز ژمارەیەك لە ئەفسەرانی ئینگلیزیان سەربڕی، دەست و قاچیان لێکردەوەو لەت لەتیان کردن، ئەوان خۆیان زێتر لە دە تەرمیان بەم شێوەیە بینیبوو. لەگەڵ ئەوەش، وەك گاربیت دەڵێ : نەیانگوت عەرەبەکان بەم جۆرە بەشەڕ دێن. بەڵکو بەخێزانی کوژراوەکانیان گوت، بەئاهەنگ و رێزلێنانی پێویستەوە تەرمەکانیان ناشتووە![٦٣:١٨٥].

لەوانەی سەرکردایەتی ئەو راپەڕینەیان کرد، دوو رێکخراوی تیابوو، "حارس الاستقلال" و "الاخطل العراقي" . ئەو رێکخراوانە کە هەوڵی سەربەخۆییان دەدا ! لەهەمان کاتدا دژی ئەوە بوون هیچ جۆرە مافێکی خۆ بەرێوەبردن بۆ کورد دابین بکرێ، داوای ئەوەیان دەکرد ئەو دەڤەرانەی کوردیان تیا نیشتەجێیە، بخرێتە پاڵ دەوڵەتی عەرەبی لە عێراق [١٥٦: ١٢٣-١٢٤]. ململانێی نێوان زلهێزەکان لەو دەڤەرەدا، لە بەرژەوەندی عەرەبەکان دەشکایەوە. ئەگەرچی دەوڵەتەکەی فەیسەڵیان لە سوریا لەناو برد، وەلێ دواتر زۆر بەزێدەوە قەرەبویان بۆ کردەوە.

ئینگلیزەکان بۆ ئەوەی بەرژەوەندیەکانی خۆیان لە میسۆپۆتامیا بشارنەوە، بەلەزی دەستیان کرد بە دامەزراندنی حکومەتێکی کاتی. هەر لەگەڵ دامەزراندنی ئەو حکومەتە کوردەکان دژی وەستان. سەرکردەکانی کورد هەوڵیاندەدا بڕوا بەگەلی کورد بهێنن کە ئینگلیزەکان ئەو حکومەتە عەرەبییەیان بەو نیازە دامەزراندووە کوردستانی بۆ مل کەچ بکەن و فەرمانبەری عەرەبی تیا نیشتەجێ بکەن. هەروەها ئەوەیان روونکردەوە کە ئەو کەرەستانەی ئینگلیزەکان لە کوردستان دەستیان دەکەوێ بۆ عەرەبەکانی دەنێرن لە میسۆپۆتامیا [٢٥٥: ١٠٠]. شایەنی باسە بەتەنیا ئینگلیزەکان پشتگیری عەرەبەکانیان نەدەکرد، بەڵکو تورکەکانیش دژیان نەبوون ! پەیمانی میللی (**میثاقی میللی**) تورکی کە کوردستانی بەبەشێکی جوێنەکراوە لە دەوڵەتی تورك دەزانی! کەچی وەك شالیاری هەندەرانی تورك گوتی : بەگوێرەی دەقەکانی پەیمانی میللی (**میثاقی میللی**) گەلی عەرەب مافی چارەی خۆنووسینی هەبوو ! ئازاد بوو لە بەرێوەبردنی کاروباری خۆی، هەرچۆنێکی گەرەك بوایە حکومەتی خۆی هەڵدەبژارد. هیچ کەسێك مافی ئەوەی نەبوو دەسەڵاتداری بێت [٤٧:١٧٠]. تورکەکان دەیانویست وا نیشان بدەن کە لە عەرەبەکان بێزارن. مستەفا کەمال پێی وابوو گرنگترین ئەگەری راستەوخۆ لە دواکەوتنی تورکەکان، هێنانە ژێر رکێفی عەرەب بوو![٧٨:١٣٩]. کەچی لە راستەقینەدا ئەمە پەیوەندیەکی پتەوی بەخودی ململانێیەکەو تەنانەت دامەزراندنی بزووتنەوەکەی "مستەفا کەمال"یش هەبوو [٢١١].

کورد لەبەر ئەوەی هەرگیز خۆی بەبەشێك لەو دەوڵەتە عەرەبیە نەدەزانی، بەشداری لەو حکومەتە کاتیە نەکرد کە بەسەرۆکایەتی گەیلانی دامەزرا. لەگەڵ ئەوەش هەڵوێستی دژ بە حکومەتی کاتی لەلایەن کورد، بەدڵی ئینگلیزەکان بوو. پاساودانێك بوو بۆ ئەوەی هێزەکانیان لەبەغدا بهێڵنەوە، هاوکات لەگەڵ ئەمەش، تا بەدانی سەربەخۆیی بەکورد، هەڕەشە لە حکومەتی

عەرەبی بکەن ! [٢١٦:٢٥٥]. ئەو حکومەتە عەرەبیەی کە دامەزراندنی بەگوێرەی ئینگلیزەکان، وەك مس بیل دەیگوت : "دۆزی ناموس و کەرامەت بوو!" [٥٥:١٨٥]. لەکاتێکدا زۆربەی خەڵکە عەرەبە رەشۆکەکەش نەیاندەزانی حکومەتی عەرەبی چیە ! ئەمەش بە ئاشکرا بۆ جافەر عەسکەری روونبووەوە کاتێك لە کانونی یەکەمی ١٩٢٠ گەشتێکی کرد، بەدرێژایی فورات تا ناسریە، بۆ ئەوەی رای شێخەکان بزانێ دەربارەی ئەو حکومەتەی گەرەکیان بوو دایمەزرێنن. بینی زۆربەیان بایەخ بەم دۆزە نادەن. تەنانەت تورکیان لەخەڵکی تر بەباشتر دەزانی. چونکە لەمێژ بوو دەیانناسین ! [٦٦:٩٠].

لێپرسراوەکانی عەرەب، بەشێکی زۆریان، بەحکومەت و بەرهەڵستکارەوە، داردەستی ئینگلیزەکان بوون. کاری بەکام لایان بوایە، بە ئارەزووی خۆی و بەگوێرەی تاکتیك و بەرژەوەندیەکانی خۆی گەمەی پێدەکردن. هەردوولاش، بە حکومەت و حیزبە بەرهەڵستکارەکانەوە هاوبیر بوون لەدابڕینی باشوری کوردستان و لکاندنی بە میسۆپۆتامیاوە. هاوکات دژی هەموو جۆرە مافێکی نەتەوەیی کورد بوون.

حکومەتی کاتی عێراق، هەر لە دامەزراندنیەوە، بەفیتی ئینگلیزەکان کەوتە داواکردنی باشوری کوردستان. لەکاتێکدا کە توانای پاراستنی خۆیان نەبوو. وەك لە یەکێك لە بەڵگەنامە بەریتانیەکان هاتووە : "ئەگەر هێزی ئاسمانی ئێمە فریای سوپای عێراق نەکەوێ، بەرگەی پاراستنی وولات ناگرێ"[٤٢: ١٨٥-١٨٦]. سەرباری ئەو بێ هێزیەش، دەبینین لە ٧ مارتی ١٩٢١، واتە تەنیا پێنج رۆژ بەر لەدەست پێکردنی کۆنگرەی قاهیرە، ئەنجومەنی شالیاران بڕیاری ئەوەی دەرکرد کەوا پێویستە ناوچەی سلێمانی بە میسۆپۆتامیا ببەسترێتەوە. ئەمە لەکاتێکدا، وەك گۆلد سمیث، فەرمانڕەوایی سیاسی سلێمانی لە ١٤ ئایاری هەمان ساڵدا، بۆ کۆمیساری باڵای نووسی : "کوردەکان، تەنانەت دژی یەکیەتیەکی مەرجداریشن لەگەڵ عێراق" [٣٣:٣٠٠].

وەك ئاشکرایە لەسەر داوای چەرچل، شالیاری کۆلۆنیالەکان کۆنگرەی قاهیرە بەسترا، بۆ ئەوەی هێڵە بنەڕەتیەکانی سیاسەتی بەریتانیا لە رۆژهەڵات نەخش بکەن. بۆ کوردستان لیژنەیەکی تایبەتی رێکخرا بەناوی لیژنەی کوردستان بەسەرۆکایەتی خودی چەرچڵ و شەش ئەندامی تر، لە لیژنەکەدا ئەندامان بوون بەدوو بەش بەشی سەرەکی کە پێك هاتبوون لە چەرچڵ خۆیو لۆرانسی عەرەب و مێژۆر نوئێل و مێژۆر یۆنگ ئەمانە بە ڕاشکاوی داوای دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی تایبەتیان دەکرد هەرچی کۆکس و مس بیڵ بوو ئەوانە لەگەڵ لکاندنی

باشوری کوردستان بە میسۆپۆتامیا بوون ، کەچی سکرتێری لیژنەکە مستەر پادۆك دەنگی نەدا. سێر پێرسی کۆکس لەو باوەڕەدابوو کە ئەم ناوچانە بەشێکن لە عیراق، بەتایبەتی لەڕووی ئابووریەوە ئەو لەگەڵ خاتوو مس هاوباوەڕ بوو کە بەشێك لەم کوردانە ئامادەن بەشداری لە هەڵبژاردنی گشتیدا بکەن بۆ پێکهێنانی پەرلەمانی عێراق، بەڵام ئەو بەگومانبوو لەهەڵویستی دانیشتوانی سلێمانی لەم ڕووەوە، هەرچی یونگ بوو ووتی پێویست بە چاوەڕوانی ناکات و هەر لە ئێستاوە فەرمانڕەوایی بەکوردان بدرێت کە ڕاستەو خۆ لەژێر دەسەلاتی کۆمیسیاری باڵای بەریتانیدا بێت و بەم چەشنە ناوچەکە سەربەخۆ بەڕێوە بچێت بەڵام نوئێل پێی وابوو کە بریارەکە بۆ ماوەی شەش مانگ دوا بخرێت دوا بخرێت ئەوسا کوردەکان خۆیان بڕیار بدەن لەسەر بەشداربوون لەگەڵ عێراقدا (پاشکۆی ژمارە-١ب).

لەم کۆنگرەیەدا ڕێگایان بەنوێنەری عێراق دا بەشداری بکات، وەلێ ڕێگای کورد نەدرا، هەرچەندە بەخۆشحالیەوە پێشوازی بەستنی ئەو کۆنگرەیان کرد [١٣٨:٢٠٣]. هەر لەو کۆنگرەیەشدا دوو بڕیاری چارەنووس ئامێز درا، یەکەمیان هێنانی فەیسەڵ بوو، دووهەمیان هێزی ئاسمانی شاهانەی بەریتانی بۆ بەرگری لە ئاسایشی ناوەخۆی عێراق، بەرپرسیەتی سوپا بگرێتە ئەستۆی [١١٠:١٨٤]. بێگومان پاراستنی ئاسایشی ناوەخۆی عێراق بەهێزی ئاسمانی بەریتانی بەشێوەیەکی زەق ئەوەی دەگەیاند کەوا ئینگلیزەکان گەرەکیان بوو هاریکاری حکومەتی عەرەبی بکەن، بۆ لێدان و سەرکوتکردنەوەی بزاڤی نەتەوەیی کوردی. چونکە باشترین ڕێگا بۆ مل کەچ پێکردنی چیا سەختەکانی کوردستان، هێزی ئاسمانی بوو. هەر لەو کۆنگرەیەشدا پرسی کۆکس گوتی : "کوردستان بەشێکی تەواوکەری عێراقە" [١٤٦: ١٨٦-١٨٧]. هەرچی دەربارەی فەیسەڵ بوو، بەگوێرەی ڕێنماییەکانی کۆنگرەی قاهیرە، دوای ڕاپرسێکی ساختە، زۆرینەیەکی بێ وێنەی وەدەست هێنا. ئەمە لەکاتێکدا ناوچەی سلێمانی بەشداریان لەو ڕاپرسە نەکرد، ناوچەی کەرکوك ٤٪ بەشداریان کرد ئەوانیش لایەنگری فەیسەڵ نەبوون، کوردەکان داوای کارگێڕیەکی پوختەی کوردیان کرد [١٠٩:١٨٤]. بۆ وێنە ناوچەی پردێ لە ١٥٠٠ دەنگ، کەس دەنگی پێی نەدا، لەناوچەی شوان لە ١٢٦٣ کەس هیچ دەنگێکی وەدەست نەهێنا، لەناوچەی تاووخ لە ١٠ هەزار کەس، تاکە دەنگێکی نەهێنا ! [١٠٠:١٦٣]. هەرچەندە ئەم سەر ژمێریانەش دەوڵەتیەو ناڕاستی زۆر تیایە !

بەم جۆرە لە ٢٣ ئابی ١٩٢١ فەیسەڵ کرا بە پاشای عێراق، وەك ڕۆژنامەی "دیلی هێرالد" نووسی : "فەیسەڵ لە پڕێك، لە گۆڕەپان و لەنێو ئەستوندەکان کرا بە پاشا. بە ئامادەبوونی فەرمانبەرە ئینگلیزەکان و ژمارەیەکی کەم لە هاوڕێکانی. لەدواوەشی بەتالیۆنێکی پیادەی بەریتانی وەستا بوو، نێزەکانیشیان لەو پەڕی ئامادە باشی دابوو". هەروەها مس بیل گوتی : هەفتەیەکی پڕ لەترس ژیاین، وەلێ بەرامبەر ئەمەش تاجمان نایە سەری پاشاکەمان ! من

گەر ئاشتییەکی گشتیی، لە
ناوەندا ئەنجامدرێ، کورد لەو پرۆسێسە ئاشتییەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا تێنەخوێندرێتەوە، ئەوا لە پاشەڕۆژدا، کاسەکە تەنیا لە سەری کورددا دەشکێ. چونکە، لە هەر پارچەیەکی کوردستاندا، هەر جوڵانەوەیەکی نەتەوەیی و ڕامیاریی سەردەربێنێ، هەر شۆڕشێکی چەکداریی بەرپابێ، دیارە باری هێمنیی ناوچەکە دەشڵەقێنێ، کۆسپێکی گەورە لە بەردەم، بەرژەوەندیی دەوڵەتەکانی ناوچەکە و بەرەی خۆراوادا قووتدەکاتەوە. بۆیە ئەوانیش، جوڵانەوەکە بە جوڵانەوەیەکی تیرۆریستیی و سەرانی ڕێکخراو و شۆڕشەکەش، بە ئاژاوەچیی و گێرەشێوێن ناودەزدەدەکەن، بە هەمووشیان دژی ڕادەوەستن و سەرکوتیدەکەن.

---

# *THE MAIN KURDISH PROBLEMS*

## *BY*

## *Dr. HUSSEIN M. A.*

2000 (2700 K)